ژمارەی بڵاوکراوە: ٥٢

ناوی کتێب: **ماچی یەکەم**

نووسینی: **کەریم کاکە**

دیزاینی ناوەوە: **ئەیاد نادر**

دیزاینی بەرگ: **ئیبراهیم ساڵح**

ساڵی چاپ: **٢٠٢٠**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

لە بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی ( ٤٩٨ )ـی ساڵی ٢٠٢٠ـی پێدراوە.

# ١

# خوشکترین

هێنــدەی پەلکــی دارپرتەقــاڵەکە، هێنــدەی دنکــی یەك وەرزە هەناری دارهەنارەکە، هێندەی رۆژانی منی بە دیار پەنجەرەوە دانیشتوو، ئەو پەنجەرەیەی بە سەرماڵی دار هەنار و پرتەقاڵدا دەڕوانێ، بە بەژنی بڵندترین داربیدا دەڕوانێ، بە سەر ماڵی پەریدا، بە سەر بابی ماچ، بە سەر ماڵی کوڕی پیاوە مەستەکەدا دەڕوانێ، بە رووی پەنجەرەی دنیادا دەڕوانــێ، هێنــدە و پتــریش ســاڵانێك پەری تیژهــاتووە و هەلوەستەیەکی کردووە و تیچاوڕێکی داوەتە پەنجەرەی دنیا و تیژتر رۆیشتووە، مـن لەبەر دڵی وی دەڵێم پەنجەرەی دنیا، پەنجەرەی دنیا بەو پایزەوە کێ دەزانــێ چەند پایزە، بە هەمیشەیی بە رووی گشت وەرزەکاندا والایە، دەمدیت، لەگەڵ یەکەم پەلە هەوری پایزی دەمدیت، لە پەنجەرەی دنیاوە گۆلمی بـۆ بـاران دەگـرتەوە، هەستمدەکرد کـوڕی پیـاوە مەسـتەکە لەگەڵ هەور

دەئاخفیێ، بەڵام تێینەدەگەیشتم چی دەگوت، هەر لەو پەنجەرەیەوە دەستەکانی بە دوا ڕێژنەبارانی بەهارانیش دەشووشت، شووشتنێك هەر دەتگوت دەزنوێژ دەشوات، چرای پەنجەرەی دنیا ڕێك پێچەوانەی پەنجەرەی من هەمیشە چراخانە، ڕووناکایی لە دنیا ببڕێ، چرای ئەوێ ناکوژێتەوە، پەنجەرەی دنیا ئەودەمانێ لە ئێستا ڕووناکتر، ئێستا لەو دەمانێ ڕووناکتر.

ئەو چرایەی کوڕی پیاوە مەستەکە بۆ پەریی هەڵکرد، ڕەنگە چرای نەمری بێ، بای هەموو وەرزەکان ڕووەو پەنجەرەی دنیا هەڵدەکەن و چرا ناکوژێتەوە و ناکوژێتەوە، ڕۆژی هەڵکردنی چرام لە بیرە، ئەو هەموو پایزە لەمەوپێش، درەنگانی پایز، دەمەو ئێوارەیەکی هەوری، پەلە هەورەکانی ئەو ئێوارەیە ئێستاش وا لە بینناییم قژیان تێکدی دەئاڵۆزکێ، ئەها چەند نمە بارانێ کەوتنە سەر قژی خاوی پەری، لە ئێوارەیەکی ئەوها هەر لەو کۆڵانە و لەو پێش دەرگایە و بەرانبەر ئەو پەنجەرەیە، پەری نازانم نە بە لێو بوو نە بە چاو گوتی:

کوڕی ئەو ماڵە ماچی هاویشت.

ویستم بپرسم:

گرتتەوە؟!

پەنجەرەکە ڕووناکبۆوە، هەر ئەو ڕووناکبوونەوە بوو، ئیدی نەکوژایەوە، ئەو ئێوارەیە چەند لە پڕ زستان هات، زستان ئەو هەموو بەفرەی لە کوێ هێنا، چ زوو دنیای سپی کرد، ئەو ئێوارەیە تۆ، پەری، نە لە خۆت نە لە کەس نەدەچوویت، ئێوارەش لە چ ئێوارانی نەدەکرد، کۆڵانیش کۆڵانی ئێوارەکانی پێشتر نەبوو، دەمدیت لە چاوەکانتەوە و لە بن پرووشەی بەفرێ دەمدیت، تیشک تیشک ئەوین دەڕژایە کۆڵان، کۆڵان پڕ دەبوو لە ئەوین، ئەوەتا دەرگای ماڵان کرانەوە، ژنان، کچان بە سینەی نیوە واڵاوە ئامێزیان کردۆتەوە، بۆ بەفرە؟ یان لەو ئەوینەوە کە لە پرووشەی بەفرەوە دێ.

ئەو ئێوارەیە چ ئێوارەیەك بوو، بەفر دەتگوت باڵی سپیی پەپوولەیە بە سەر دار و دیواردا دەنیشتەوە، کۆڵان سپی دەچۆوە، پەنجەرەی دنیا سپی دەچۆوە، دار پرتەقاڵ و هەنارەکە سپی دەچوونەوە، جا چی سپی نەبوو؟ منیش وەك تۆ سپی سپی، تۆ پەری، تۆ بە جلکی سپیەوە، بە پێکەنینی شیرینەوە، مەستانە باوەشت بە من دا دەکرد، لەگینە لە پەنجەرەکەشەوە تەماشامانکرابێ! ڕوومەتەکانت دەتگوت سێوی بن بەفرن، دەستەکانت دەتگوت بە سێبەری ئاگردا هاتوون، لە بیرتە! گوتم:

تات لێیە؟

لە بیرمە گوتت:

تا،تا، بەڵێ، تا...

لە بیرتە! گوتم:

دەترسم، تای ئەوین بێ.

بیرمە گوتت:

بترسە، رەنگە...

کاتێ دەمویست لە ساتی چوونت بۆ بەر بەفرێ سەیوانت بدەمێ، گوتت:

ئەمڕۆ هەرچی بەفرە بۆ من دەبارێ، دەبێ کلوو کلوو بەفر بگرمەوە.

گوتم:

کچێ، سەرمات دەبێ.

گوتت:

کچێ، هەرچی بەفرە لە من دەتوێتەوە، من ئەورۆ رەنگە ئاگر بم...

نازانم ئاگر بوویت یان نا، بەڵام دەمدیت بڵێسەم دەدیت، لە تۆوە لە بن بەفرەوە بڵێسە لێوەکانی بۆ بەفر دەکردەوە، بەفر و بڵێسە ئاوێزانی یەکتر دەبوون و بە بەفر و بڵێسەش دەمانەوە، لە بیرتە! گوتم:

ئۆی! تۆ بوویتە بڵێسە!

لە بیرمە گوتت:

تۆ بڵێی ئەوین بڵێسە بێت؟

بەو دوو چاوەی خۆم دیتم ئەوین بڵێسە بوو، لە تۆوە بڵێسە بڵێسە ئەوین بڵێسەی دەدا، چەندێ ئیرەییم پێبردی کچە ئەویندارەکە، جاری یەکەمت بوو عاشق بوویت، جاری یەکەمم بوو وا لە نزیکەوە ئەویندارێک ببینم و ببینم بڵێسە دەدا، شەو داهات و شەو هەر بە سپێتی مایەوە، چ شەوێکی بەفراویی بڵێسەدار بوو چ شەوێکی ئەویناوی دیار بوو، دواتر ناوت لەو شەوە نا شەوە دیارەکەی تەمەن، ئەو شەوە پەری لەم ژوورە و و لەبەر ئەم پەنجەرەیە و بە دیار پەنجەرەی دنیای رووناکەوە شەوی کردەوە، چەند جارێ هاتن بە دوایدا نەڕۆیشتەوە، باوکی گوتبووی:

لە پەری گەڕێن، من کچی خۆم باش دەناسم کە گوتی نایەمەوە نایەتەوە، لە سەریشی بدەن نایەتەوە، لێیگەڕێن ئەو شەو شەوێکی ئاسایی نیە.

ئەو ئێوارەیەی، ئەو شەوەی پەری تیایدا ئەوین لێیدا، چ شەوێکی نائاسایی بوو، شەوێکی پڕ لە سەرسوڕمان و پرسیاری بێ بەرسڤ، بابی پەری گوتبووی:

لەوەتەی دنیا هەیە، لەوەتەی ئەو شارە هەیە، لەو کاتەی ساڵ بەفر نەکەوتووە.

نا، نەکەوتبوو، کەس لە بیری نەبوو، هیچ کتێبێك نەدەهاتەوە بیری، بەفرێکی وا و لە کاتێکی وا لەو شارە کەوتبێت، ئەو شەوە چ بەفرێك باری خودایە! پێش ئەوەی قەڵات سپێدە بدا، بەفر گەیشتە تەنوورە کورتەکەی پەری، بتاندیتبا چۆن ناوە ناوە بەو شەوە دەچووە کۆڵان، دەگەیشتە نزیك دار پرتەقاڵ و هەنارەکە و بە پرتاو دەهاتەوە، سەردەکەوتەوە و چاوی دەبڕیەوە پەنجەرەی دنیا، ئەو شەوە پەری دەتگوت بادەی دنیای خواردۆتەوە، مەست مەست، خودا هیچ بەندەیەکی بەو مەستیە نەدیوە، ئەو شەوە پەری حاڵگرتنێك حاڵی گرتبوو، خودا هیچ شێخێکی تەریقەتی بەو حاڵەوە نەدیوە، ئەو شەوە پەری دەتگوت

کچە پەیامبەرە راستەوخۆ لەگەڵ خودا دەدوێ، ئەو شەوە، ئەو شەوەی پەری تێیدا ئەوین لێیدا، پێنەدەچوو شار چاوی چوویێتە خەوێ.

دەمدیت گەورە و گچکە لە ناو حەوشە و سەربانەکان رژابوونە ناو بەفرێ و تێکەڵی رووناهیی شەو دەبوون، ئەو رووناهیەی لە گیانی پەریەوە تیشک تیشک دەڕژایە بەفرەوە و کۆڵان کۆڵان، سەربان سەربان، درەخت درەخت بەفری رووناکتر دەکردەوە، بە پەریم گوت:

وێدەچێ پەیوەندیەك لە نێوان بەفر و ئەویندا هەبێ.

پەری دەیگوت:

نازانم نە بەفر ئەوینی بە سەرمدا باراند، نە عاشقبوونم بەفری باراند!

هەر ئەو شەوە بابێ پەری گوتبووی:

هاتنی بەفر و نەهاتنەوەی پەری گرێیەکی ئاڵۆزە بە من ناکرێتەوە.

دواتر کوڕی پیاوە مەستەکە گوتبووی:

عاشقبوونی پەری ئاسایی نەبوو، هەر بۆیە ئاسمان بەفرێکی نائاسایی تێکرد.

ئاسایی نەبوو، چەند گەڕەك كوڕ بە دوای پەریەوە بوون، کوڕی قۆز، بازرگان، نووسەر و هۆزانڤان، چەقۆکێش، پێشمەرگە، ئەفسەر، جاش، تەڕەفرۆش، دارلاستیقهاوێژ، دکتۆر، مامۆستا، خوێندکاری زانکۆ کچ نیە لە دنیایێ هێندەی پەری داخوازیی هەبوویێ، نامەی هەمەڕەنگی بۆ هاتبێ، پەری کەسی نەدەویست، خۆشەویستیشی نەبوو، کوڕی پیاوە مەستەکەش یەکێك بوو لەوانەی چەند جارێ خۆشەویستیی خۆی بۆی لە نامەدا پێچابوو، پەری گوێی پێنەدابوو، چۆن بوو ئەوجارە گرتی؟ کوڕی پیاوە مەستەکە دڵی پەریی گرت، ئەو شەوەی پەری عاشقی کوڕی پیاوە مەستەکە بوو، هێشتا منداڵ بوو وەك من منداڵ، بەڵام هەری دابوو، جوان هەری دابوو، لە هەموو شت هەری دابوو، نەخاسمە لە ژیری، پەری چەند ژیر بوو خودایە، مامۆستای بیرکاری پێیدەگوت:

تۆ ئەگەر لە وانەی بیرکاری زیرەك بایت، هی ئەوەی شارێك بەرێوە ببەیت.

من و پەری لە یەك رۆژی گەڵارێزانی هاتووینەتە دنیا، هەموو ساڵێ لە رۆژێکدا و پێکەوە یادی لە دایکبوونی خۆمان دەکەینەوە، دەبێ بڵێم پەری هێندە لە من جوانتر نیە، بەڵام پێکەنینەکەی! خودایە

ئەگەر حەزت لە خـودایەتیە، پێکەنینێکـی وەك ئەوەی پەری بە مـن ببەخشـە، لە نـاو گەرەکێـك پێکەنـین، پێکەنینـی پەری دەناسـرێتەوە، پێکەنینی پەری لەو پێکەنینانەیە پیر جوان دەکاتەوە، پەککەوتە سەرپێ دەخاتەوە، گیان بە مردوو دەداتەوە، لە ساتی پێکەنینیَ کەس نە پیاو نە ژن بەرگەی تەماشاکردنی رووخساری پەریی نەدەگرت، من زۆر جار لە سـاتی پێکەنینـیَ مـاچێکی تونـدی نـاو دەمـیم کـردووە، زۆر جـار لە سـاتەکانی پێکەنینـی پەری لە مێیینەیـی خـۆم بێـزار بـوومە، بە دڵ حەزمکردووە کوڕ بام، بە هەموو هێزی بازووی نێرینەییم پەریم گوشیبا، ئەدی خاڵەکەی گەردنی! مـن مـاوەیەکی زۆر ئیـرەییم بە کـوڕی پیـاوە مەستەکە دەبرد، خۆزگە ئەو دەبووم.

شـەوەکەی ئەویـن لە پەریـی دا، پیـاوە مەسـتەکە (لە گەرەکـیش بە پیاوە مەستەکە ناوی رۆیشتبوو) لە سەر پەنجەرەی دنیاوە بە سەرخۆشـی و بە دەم بەفرمـاڵینەوە، تێیهەڵکردبـووە گـۆرانی، گـۆرانیەك گەرەك ئێستاش ناوە ناوە دەیڵێتەوە:

**منیش لە شەوێکی وادا**

**شەوی هەڵبژاردەی خوادا**

شەوی سپی وەك دڵی یار

شەوی کپی وەك هەوکەی شار

کە بەفر دنیای گرتەوە

گوڵی من ماچی گرتەوە...

ئەو شەوە پیاوە مەستەکە شووشەیەک بادەی بە دەستەوە بوو، چەند مەستانە دەهات و دەچوو، هەتا درەنگانی شەو ئەو گۆرانیەی دەگوتەوە، دەتگوت شتێکی لە پەری و کوڕەکەی زانیوە، گۆتمە پەری:

+گوێت لێیە پیاوە مەستەکە چ گۆرانیەك دەڵێ؟

-من تەنها گوێم لە گۆرانیی باوکی نیە، گوێم لە گۆرانیی ئەویشە گوێبگرە کوڕی پیاوە مەستەکە چ گۆرانیەك دەڵێ؟

من گوێم لە دەنگی کوڕی پیاوە مەستەکە نەبوو، گوتم:

+جگە لە پیاوە مەستەکە کەس گۆرانی ناڵێ.

-من گوێم لێیە، جوان گوێم لێیە، کوڕی پیاوە مەستەکە گۆرانیەکی ناسك دەڵێتەوە، گۆرانیەك، ئای چ گۆرانیەکە خودایە!

گۆتمە پەری:

+دە بۆم بڵێوە، بزانم...

-نــاگۆترێتەوە، ئەو گــۆرانیە بە کەس نــاگوترێتەوە، بە کەس ناگوترێتەوە.

+هەر بە قسە کۆپلەیەکی بڵێوە.

-نـاگوترێتەوە، لـێمگەڕێ، نـاگوترێتەوە، جـگە لە کـوڕی پیـاوە مەستەکە کەس توانای گوتنەوەی نیە.

ئەرێ پەریی من لە بیرتە کە گوتم:

+ئەگەر پەیامبەر توانـای گـوتنەوەی گـوتەی خوداوەندی هەبێ، تۆ توانای گوتنەوەی دێڕێکی کوڕی پیاوە مەستەکەت نیە؟!

-نا، نا، نا، لێمگەڕێ، ناتوانم...

لێتدەگەڕێم، پەریی لە ئەوین مەستبوو، لێتدەگەڕێم، وەبیرمدێ گوتم:

لێتدەگەڕێم.

بیـــرمە لەبەرخـــۆمەوە گـــوتم: مـــن تـــا هەوکە لە بـــادەی ئەویـــنم نەخواردۆتەوە، بەڵام شتم لێی بیستووە، شتم لێی خوێندۆتەوە، رەنگە ئەوەی تۆ دەیڵێیت وابێ، من هەلەق و مەلەق بکەم...

لەو شـــەوەوە پەڕ پەر، کتێـــب، کتێـــب کتێبـــی ئەویـــن هەڵـــدەدەمەوە، گەڕەك گەڕەك پەیوەندیم بە ئەویندارانەوە کردووە و چەندانیان هاتوونەتە لام، لە روخســاریان وردبــوومەتەوە، قســەیان بــۆم کــردووە، هاوشــێوەیەکی پەریــم نەدیــتەوە، پەری بە ئــاگر ئــاگری گرتبــوو، شــەو درەنگــان لە رووخساری پەری هەستم بە گەرماییەك دەکرد، پتر لە گەرمایی شێتی دەچوو، من گەرمایی شێتبوون دەناسمەوە، ئەو شەوەی خوشکی گەورەم شێت بــوو، رێــك ئەو گەرمــاییەی دەدا، گەرمــایی شــێتبوون لە هــیچ گەرمــاییەك نــاچێ، گەرمــایی ئەویــن نــاڵێم، چــونکێ دەســتم نەداوەتــێ، پاڕامەوە بە دڵ پاڕامەوە، پەری بە دەردی خوشکەکەم نەچووبێ، ئەرێ خوشـکم بـۆچی دیـن بـوو؟ لە تـاوی ئەویـن نەبـوو؟ حەیـف، هەینـێ مـن منداڵ بووم و هیچم لێی نەزانی.

هێشتا نامەکەی خوشکی گەورەم نەدیتبوومەوە.

خـــودایە، شـــێتبوونی خوشـــکی گەورەم ســـەروکاری بە ئەویـــنەوە نەبووبێ، من لە پەری دەترسم، ئەو شەوەی کوڕی پیاوە مەستەکە دڵی

بۆ پەری هاویشت، ئەو شەوەی پەری ئەوین لێیدا، ئەو شەوەی بەفر شاری سپی سپی کرد، ئەو شەوەی گەڕەك ڕژانە بەفرەوە، ئەو شەوەی پەری لە هۆدەکەی من و کۆلان و بەر دەرگای ماڵی کوڕی پیاوە مەستەکە مایەوە، ئەو شەوەی باوکی پەری گوتی:

لە پەری گەڕێن...

ئەو شەوەی پیاوە مەستەکە هەتا ڕۆژ بۆوە بادەی خواردەوە و گۆرانیی گوت، ئەو شەوە گۆتمە پەری:

+پێمبڵێ، تۆ دینی یان ئەوینداری؟

-بۆ، جیاوازیان هەیە؟

+نازانم، نیانە؟

-نازانم، بە چاوی تۆ نازانم.

باوەشم پێیدا کرد، تایەکی گەرمی لێبوو، نەمزانی تای دین بوونە یان ئەوین، ترسام نەخۆش بێت، وا بزانم لە دەمم دەرچوو، گوتم:

+تۆ نەخۆش نیت؟

- ڕەنگە، نازانم، هیچ نازانم...

ڕایکردەوە کۆڵان، لە پەنجەرەوە تەماشامکرد، گەیشتە بەر دەرگای ماڵی کوڕی پیاوە مەستەکە و گەڕایەوە، هاتەوە دانیشت و چاوی بڕیە پەنجەرەی دنیا، لە بەر خۆیەوە کەوتە نزا:

خودایە، خودای من ئەو پەنجەرەیە بە ڕووناکی بهێڵەوە، با هەرگیز نەکوژێتەوە...

لەو شەوەی پەری نزای کرد وخودا لێیوەرگرت، گۆتمە پەری:

+زۆرت خۆشدەوێ؟

-زۆر چەندە؟ تا بڵێم ئا، یان نا...

+هێندەی ئاسمان، هێندەی بەفر.

-زۆرتری بکە، ئەو زۆرە کەمە.

+باشە پەری، خۆ پێشتر هیچت لەگەڵی نەبوو، هیچت پێوە دیار نەبوو...

-نا، تا ئەو ئێوارەیە هیچ هیچ، هیچ لە گۆڕێ نەبوو.

+تێناگەم ئەو هەموو خۆشەویستیە، چۆن لە ئێوارمیەکدا لە دڵتدا هەڵچنرا؟

-لە من مەپرسە، منیش تێناگەم، با لە بەفر بپرسین، ئەها چۆن دادەکات، ئەها بە بێدەنگی هاتۆتە گۆ، رەنگە باسی من و کوڕی پیاوە مەستەکە بکات، وا نیە، ئەدی؟

پەری لە پەنجەرەوە دەستی بۆ بەفر گرتەوە، چاوی لە پەنجەرەی دنیا بڕی، پێدەچوو ئاگای لە خۆی بڕابێت، بانگم کرد، قسەم لەگەڵی کرد، دەستم خستە سەر شانیشی بە ئاگانەهاتەوە، پەری، لە بیرتە لەبەرخۆتەوە قسەتدەکرد؟ قسەت لەگەڵ پەنجەرەی دنیا دەکرد، پەری من ئێستاش هەندێ لە قسەکانتم لە گوێدایە:

تا دەرنەکەویت من لێرە دەمێنمەوە، دەرکەوە، لە پەنجەرەوە دەرکەوە، لەو پەنجەرەیەی رووناکت کردەوە، دەرکەوە، حەزدەکەم لە پەنجەرەوە بتبینم، ئای، چەندێ تینووی دیدەنیتم، ئۆی من چەند هوڕوکاسم، چەند گێژوویژم، ئەدی ئەوە تۆ نیت وا بوویتە رووناکی و لە پەنجەرەی دنیاوە رووناکم دەکەیتەوە...

پەری تۆ نایەتەوە بیرت، بەڵام مـن لە یادمنـاچێتەوە، چەند گریـام، فرمێسـکە گەشـەکانی منـت نەدیـت پەری، مەگەر ئاسـمانی ئەو شـەوە هێنـدەی مـن فرمێسـکی داوەرانـدبێ، ئەو شـەوە ئاسـمان کلـوو کلـوو فرمێسکی باراند و دنیای سپی کرد، منیش هۆن هۆن فرمێسکی سوورم هەڵدەوەراند، هەموو بۆ تۆ بوو پەریی مـن، مـن ترسام تۆم لە دەسـبچێ، وەك خوشکی گەورەم بە کۆڵانـان بکەویـت، پەریەکەم چەند بۆت گریـام، چەند.

ئەو شەوە چ شەوێك بوو! پەری

چەند پایز هاتە سەر ئەو شەوە؟ پەری

چ بەفری وەك ئەو بەفرە کەوت؟ پەری

حەزمنەکرد پتر بڵێم، پەری

تا چلەی ئەو بەفرە نەچوو، من پەریم لەو کۆڵانە و بەردەم پەنجەرەی دنیا نەدیتەوە.

مـن خوشـکترین خوشـکی پەریـم، پەری نـاوی لە مـن نـا خوشـکترین خوشك.

## ٢

# پەری

ئەو شەوە بە لەبیرچووەوەکانی لە بیرناچێتەوە، لەو شەوەدا من یەك تنۆك فرمێسك نابینمەوە، کلووە بەفرێك نابینم، بینایی ئەو شەوەم جگە لە پەنجەرەی دنیا چی تێدا نیە، لەو شەوەدا جگە لە گۆرانیی پیاوە مەستەکە هیچم نەبیستووە، ئەو پیاوە سەرخۆشەی دیدڤانە بە سەر یەکەم ماچەوە، ئەها لە بن ئەو دارپرتەقاڵە بە تەمەنە، ئای چەند چۆتە تەمەنەوە، رووبەڕووی ئەو دارهەنارەی، حەیف ئێستا چ هەناری پێوە نیە، بە بەر چاوی پەنجەرەی دنیاوە، پیاوە مەستەکە دیتی، ماچی یەکەمی دیت، ئێستا دەمێ دەڵێم خۆزیا نەیدیتبا، دەمێ دەڵێم باش بوو دیتی، دەنا گۆرانیەکەی وا جوان نەدەگوتەوە.

دیتی، پیاوە مەستەکە ماچی یەکەمی دی، ئەو ماچەی لە ساتەکانی خەوتنیش لە بیرناچێتەوە، لە ساتەکانی نەشتەرگەریش ئەو

ساتانەی سرِ سرِ لە مردووش سرِتری لەبیر نەچۆتەوە، ماچی بن دارپرتەقاڵەکە چ ماچێ بوو، خودای من، خودای ماچان، من تاگەیشتمە ئێرە بە ناو درەختێك ماچدا هاتووم، هێندەی گەڵای پرتەقاڵ و هەنارەکە ماچم گرتۆتەوە، هێندەی چۆلەکەکانی ناو داربیەکە ماچم گرتۆتەوە، یەکیان نەبێ هیچیان تامی ئەو ماچەیان نەداوە، ماچی یەکەم، چ تامێکی هەیە ماچی یەکەم، جگە لە ماچ تامی چیدی نادا.

چی منی گەیاندە بن دارپرتەقاڵەکە، رەنگە کتێبێك، لەوانەیە بردنەوە یان هێنانەوەی شتێك، دوور نیە خوشکەکەی بانگمی کردبێ، یان هاوکێشەیەکی ئاڵۆزی بیرکاری منی گەیاندبێتە بن دارپرتەقاڵەکە، یان دارشتنی عەرەبی، زۆر جار کوری پیاوە مەستەکە، بیرکاری ئەو بیرکاریەی بە کەس ئاسان نەدەبۆوە، بۆمی ئاساندەکردەوە، ئاسان، ئاسان لە خواردنەوەی ئاوی لێو ئاسانتر.

روو لە دەرگای حەوشە، روو لە من، شانی راستی دابووە دارپرتەقاڵەکە لە دەرگاوە تا دارپرتەقاڵ چی روویدا، تا شانی چەپی منیش گەیشتە دارپرتەقاڵ چەندی پێچوو؟ لێممەپرسن، بە چاوەکانی چۆنی راکێشام، ئەو چاوانەی لە چاوی خۆی نەدەچوو، لە هیچ

چاوێك نەدەچوو، لێمەپرسن، پێشتر بیستبووم، چاو توانای راکێشانی هەیە، بەڵام ئەوها نا، وەك ئەو راکێشانە نا کە منی راکێشایە بن دارپرتەقاڵەکە، ئەو ساتانەی چاوەکان کێشیانکردم، ئەو چاوانەی پێشتر چاوی زۆر ئاسایی بوون، لە چاوی مامۆستای بیرکاریش ئاساییتر، ئەو مامۆستایەی ساڵێك چاوی لە سەرم هەڵنەگرت، کەچی هیچی لە سەرم بەجێنەهێشت، ئاسایی وەك هەموو چاوەکانیدی، ئەو ساتانەی چاوەکان کێشیانکردم، کێشی پووشکەیەکم نەمابوو، بۆ؟

لێمەپرسن، ئێستا شانی چەپم داوەتە دار پرتەقاڵ، دارپرتەقاڵێك حەوشەیەك پرتەقاڵی گرتووە، بەهارێك گەڵای پێوەیە، لە تەنیشتمانەوە دار هەنارەکە رووت رووت لە قۆڵ و باسکی هاوینیانەی من رووتتر، بەڵام چەند هەنارێك وەك بلێی لە دابی وەرزەکان یاخی بووبن، توند خۆیان بە لقەوە هەڵواسیبوو.

هێندەم لە بیرە هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو، دەتگوت گەرەك راویان ناوە، بای هەناسەی چ بایەك بوو خودایە، هەرگیز رووم بەر بای وا نەکەوتبوو، ئەو بایە لە دڵێکەوە هەڵیکردبوو هەر من دەزانم چ دڵێك بوو، دواتریش جاروبار پرچم بەو بایە دەشنایەوە، گیانم بەو بایە دەشنایەوە، لە

هەڵکردنی بای دڵەوە تا دەستی خستە سەر شانم چەندی پێچوو؟
لێمەپرسن، شەرمنانە گوتی:

ئەو هەنارانەت دیوە؟

سەرم هەڵبڕی.

شەرمنانەتر گوتی:

هەنارەکانی سەرەوە نالێم، خوارەوە، کەمێك سەر دانوێنە.

دواتر بە بیرمی دەهێنایەوە کە ئەو ڕۆژە کراسێکی پرتەقاڵیم لە بەر بووە، هەنارەکانیشم... خەریکبوو خۆم لە خۆم ڕاپسکێنم، ئاخر تا ئەو دەمە تەنها دەستی لە سەر شانم بوو، نەیگرتبووم، نا، هەڵنەهاتم، هەستمکرد دڵم لە قەدی دارپرتەقاڵەکە دەدا، لە سینەم بەرزەفت نابێ، دەیەوێت بچێتە ناو درەختەکە، هێشتا لێو هەر لەوێ بوو، هەستمدەکرد دارپرتەقاڵ لە لێدانی دڵی دەهەژێ، ئا هەژا وەك ئەوەی ڕەشەبای توندی زستانە لە حەوشە هەڵیکردبێ، دارپرتەقاڵ دەهەژا، لە دەست خستنە سەر شانەوە تا گەیشتنی لێو چەندی پێچوو؟

لێمەپرسن، دیتم لێو نەرم نەرم دەهات، ئاگام لێبوو نەرم نەرم، ناسك ناسك، لە سەر لێو نیشتەوە، نیشتنەوەی بەفریش لە سەر گەڵای

دارپرتەقاڵ هێندە نەرم و ناسك نیە، نیشتنەوەی پەپوولەش لە سەرگوڵی هەنار هێندە نەرم و ناسك نیە، بەڵام دوای نیشتنەوە گوێم لە شەقەی باڵی ماچ بوو، گوێم لە توانەوەی ماچ بوو، دەنگی ماچ، ئای لە دەنگی ماچ، هات، دەنگێك لە چ دەنگان نەدەچوو، چاوم داخست، لێو جارێکیدی لە سەر لێو نیشتەوە، ئەوجارە هەڵنەفڕی، وەك چۆن بەفری رێبەندان زەوی دەگرێ، وەك چۆن کەسکایی نەورۆز زەوی دەگرێ، وەك چۆن گەڵا درەختی پرتەقاڵ دەگرێ، لێو ئەوها لێوی گرت، من یەکەم جارم بوو ئاوی لێو بخۆمەوە، من چیم خواردەوە خودایە! خودایە، ئەوەی کچە لەو ئاوە بێ بەشی مەکە، رەنگە ئەو لە من تینووتر بووبێ، نا لە من تینووتر نەبووە، مژی بە هەموو هێزی نێرایەتی خۆی دەیمژی، ئەرێ دەستەکانمان لە کوێ بوون؟

نایانبینمەوە، چەندی چاو دەگێڕم نایانبینمەوە، لە بن دارپرتەقاڵ مراینەوە، نا من لەوێ نەمامەوە، ئەوەتا دەستم لە دەستی بایە و هەڵیگرتم، من لەگەڵ یەکەم ماچدا رەدووی با کەوتم، بردمی، بردمی، هەر بردمی، ئەوەتا لە سەر پشتی پەلە هەورێکی سپی پاڵکەوتووم، بە سەر چیاکان، بە سەر دەریاکان، بە سەر پێدەشت و دارستانەکاندا دەفڕم، ئاسمانەکان دەگەڕێم، ئۆی من باڵم لێڕوا، ماچی یەکەم دوو باڵی بۆ فڕین دامێ، ئیدی ناگەڕێمەوە زەوی، ناگەڕێمەوە ئاگایی.

خشــپەيەك بە ئاگــاى هێنــامەوە، ئەوە پێــى پيــاوە مەســتەكە بــوو، شووشەيەكى مل باريكى بە دەستەوە بوو، لە ئێمە پتر تەريقبۆوە، شەرم دايگـرت، رووى خـۆى وەرگێـرا و هەڵات، دەتگـوت منـداڵە كەتنێكـى كردووە و لە ترسى تەمبێكردن هەڵات، منيش هەڵاتم، تا پێم تێدا بوو هەڵاتـم و هـاتمە لاى تـۆ، هـاتمە ئەو شـەوەى تـۆ دەيگێـڕيتەوە، پيـاوە مەستەكە شووشەيەك بادەى خواردبووەوە، بەڵام ئەو ئێوارەيە ئەو شەوە من رەنگە هەورێك بادەم خواردبێتەوە، لەو مەستيە ئاسمانيە دەبێ چى زەويم بيربكەوێتەوە، ئەو شەو هەر دەبێ تۆ بمنووسيتەوە، تۆ

خوشكترين خوشكى من.

تا چل رۆژ پێم بە حەوشەى مـاڵى پياوە مەستەكە نەكەوتەوە، ئەو حەوشــەيەى بە خەتــى پرتەقــاڵى يەكەم مــاچى لە خۆيــدا نووســيەوە، مـاچێكى قـووڵ، لەگـوينە دوا ماچيشـى نووسـيبێتەوە، لەو چل رۆژە، پەرى بووە پەرێك هەندێك دەيانگوت:

پەرى گەڕەك ناناسێتەوە.

هەندێك دەڵێن:

پەرى گەڕەك ناناسێتەوە.

مـن چ لەو هاوکێشـەیەی نایناسـێتەوە و ناناسـێتەوە نەدەگەیشـتم، لە هاوکێشـە بیرکاریەکـان ئـاڵۆزتر و قورسـتر بـوو، بە. خـۆم دەگـوت، دەبێـت هەبێت بۆم ئاسان بکاتەوە، ئەو چل ڕۆژە بە ماڵ نەدەکەوتمەوە، بۆ هێنـدە بە عەرد دەکەوتـمەوە! کۆڵان کـۆڵان، شـەقام شـەقام بە ئاسـماندا دەفـڕیم، بەڵام ڕێم بە ئاسمانی ماڵی پیاوە مەستەکە نەکەوتەوە.

چـــل ڕۆژ بە دوای هەمـــوو ئەو کـــوڕانەدا دەگەڕام کە چاویـــان لێمداگرتبوو، ماچیـان هاویشـتبوو، هـاتبوونە سـەر ڕێـم، نامەیـان نـاردبوو، داوایـــانکردبووم، بە دوایانـــدا دەگەڕام و بـــۆوەی پێیـــانبڵێم بە هەر یەکە لەکوڕەکان بڵێم:

تۆ جوانی، قۆزی، بەڕێزی، شایەنی ئەوەی جوانترین کچ ژیرتـرین کچ خۆشی بوێیت و ببێتە هاوسەرت...

وامکـرد یەکە یەکە سـەردانمکردن، سـەردانی زۆریـانم کـرد، لە نـاو تەڕەفرۆشانی سەر پردەکە، تەڕەفرۆشـەکەم دیتـەوە، ئەو تەڕەفرۆشـەی لە سـەر تەڕە نـامەی بـۆم دەنووسـی، جارێـك لە سـەر ئـاروونێکی گەورە نووسیبووی پێدەچوو بە ددان نووسیبێتی:

ئاخ پەری ئاخ.

بە دەم کڕینی پیازەوە گۆتمە تەڕەفرۆشەکە:

دەمەوێت لە ناو تەڕەفرۆشان برایەکی جوانم هەبێت، تۆ لە هەمـوو تەڕەفرۆشـان جـوانتری، دەی تـۆ بـرام بە، برایەکـی جـوان، حەزدەکەم پەیوەنـدی خۆشەویسـتی لەگەڵ دکتـۆرەیەکی جوان ببەسـتیت، دڵنیـابە یارمەتیـت دەدەم، بە هەمـوو شـێوەیەك هەوڵدەدم رازی بێـت، باشـە بـرای خۆم...

+دەی، بڵێ، دەبیە برام؟

-خوشکێ...

کوڕە تەڕەفرۆشەکە رەنگی وەك پەلکە پیازی لێهاتبوو.

چـــوومە خەســـتەخانەی گەورە، دکتـــۆرەکە خەریکـــی پشـــکنینی نەخۆشێك بوو، بە دیتنی من نەخۆشەکەی لە بیرنەما، گوتم:

قسەیەکم هەیە، بەڵام جارێ پشکنینەکەت تەواوکە.

ئەو دکتۆرە جارێك لە کاتی پشکنینی پشتم، هەستمکرد شتێکی لە سەر پشتم نووسـی، کە چوومەوە مـاڵێ و بە رووتـی چوومە نێـوان دوو ئاوێنەوە بە خەتێکی ناسکی جوان ئەو رستەیە نووسرابوو:

پەری، دکتۆرێك تۆی خۆشدەوێ.

دواتریش ئەو دکتۆرە چەند جارێ هاتە سەر ڕێم، دکتۆر کە لە پشکنینی نەخۆشەکە بۆوە هات، گوتم:

من حەزدەکەم برایەکی دکتۆرم هەبێت، لە ناو دکتۆران گەڕام، جگە لە تۆ کەسم نەدیتەوە لە تۆ شایانتر بێت بۆ برا، حەزدەکەم ژنێکی جوان بهێنیت و لە منیش بگێڕیتەوە، مەرج بێت وەك خوشکێك جوانترین سەرچۆپی بگرم.

+دەی، بڵێ، دەبیە برام؟

-هەوڵدەدەم.

ڕەنگی گۆڕا، دکتۆر دەتگوت تووشی خوێنبەربوون هاتووە.

لەگەڵ قومری چوومە باخی گڵکەند و لە بن درەختە گوڵاویەکە چاوم بە باخدا گێڕا، دیتم چەقۆکێشەکە خەریکی هەڵکۆڵینی درەختێکە، لە دوورەوە زانیم چی دەنووسێت، درەختێك لە باخ نەمابوو، (پەری)ی لێهەڵنەکەنرابێ، کوڕە چەقۆکێشەکە چەند گەنجێکی بریندار کردبوو، درەنگ تێگەیشتم بە هۆی منەوەیە، لە ناو باخ کە زۆر کەمیش دەچووم، هەر کوڕێك بە دیار چەقۆکێشەکەوە تیچاوێکی مەبەستداری

دابێتە من، نووکە چەقۆیەکی کوڕە چەقۆکێشەکەی گرتۆتەوە، دەستم خستە سەر شانی، گوتم:

من دوو برام هەیە، بەڵام هیچیان توانای چەقۆ هەڵگرتنیان نیە و لێی دەترسن، دەمەوێت برایەکی ئازای چەقۆکێشم هەبێ و لە لای خەڵك خۆمی پێهەڵکێشم، لە تۆش ئازاتر کەسم شکنەبرد، حەزدەکەم تۆ برام بیت، هەر کاتێکیش چوویتە داخوازی کچێك، لە منیش بگێڕەوە، هەرچی دەستەخوشکی خۆم هەیە وەك خۆم دەیانکەمە خوشکت، دێینە ماڵی بووکێ تا بڵێن، زاوا خوشکی چەند رێکی هەیە.

+دەی، برا ئازاکەم، دەبیە برام؟

-لە ئێستاوە من برای تۆم.

کوڕە چەقۆکێشەکە وەك قەدی درەختە پیرەکە رەقهەڵاتبوو.

لە سەر دەرگای قەڵات چیرۆك نووسەکەم گرت، کۆمەڵێك کتیبی لە بن هەنگڵ بوو، وا بزانم نیازی چوونە چاپخانەی هەبوو، ئەو چیرۆکنووسە چیرۆکێکی بڵاوکردبۆوە بە ناونیشانی (پەری) هەر کەسێك منی ناسیبێت و چیرۆکی پەریی خوێندبێتەوە، پەری لە پەری دەبینێتەوە، خاوەن چیرۆکی پەری لە نامەیەکیدا بۆمی نووسیبوو:

ئەگەر خۆشمت بویَ، دەتکەمە رۆمانێك دنیا بتخوێنێتەوە.

گۆتمە چیرۆکنووسەکە:

+ناکریَ وەك خوشکێك بمخەیتە رۆمانێکەوە؟

-بۆچی؟

+حەزدەکەم تۆ برام بیت.

-ئەها!

+راستی من وەك برایەك تۆم خۆشدەوێت، بۆ نابیتە برام؟

-ببمە براشت برایەکی بیـژی دەبم، سوپاس تێگەیشتم، هیـوادارم خۆشبەخت بیت.

+تۆ برایەکی جوانمی.

نازانم نە لە خەونیَ بوو نە بە راستی هەمـوو ئەوانەم دیتەوە و داوای بەبرابـوونم لێکـردن کە رۆژێـك لە رۆژان نـامەیەك یـان هێمـایەکی ئەویندارانەیەیان بۆم ناردووە، هەتا خۆم گەیاندە پێشمەرگەگیان لە سەر دەسـتەکەش، ئەوەی دواتـر بە پاکـانەنووس نـاوی رۆیشـت، ئەو

پێشمەرگەیەی خۆی گوتەنی لەبەر خاتری من بە ناو دەوی شێر و گورگدا دەهات و پارچە کاخەزێکی پێچراوی بۆم هەڵدەدا و منیش هەر بۆ خۆشی، هەر بۆ گاڵتە دەمخوێندەوە بێنەوەی جارێك وەڵامی بدەمەوە، پێشمەرگەکە لە بن درەختێکی رووتەلە شانی دابووە بەردێك کاتێ منی دیت وا بزانم وا تێگەیشت بووکی بۆ هات، هێند گەشبۆوە هێند گەشبۆوە، مەگەر کوڕی پیاوە مەستەکە بە دیتنی من وەها گەشبوویێتەوە، گۆتمە پێشمەرگە سەرچیخچووەکە:

براکانم هی ئەوە نین ببنە پێشمەرگە، منیش هێندەی دنیایەك ئارەزووی ئەوە دەکەم کە برایەکی پێشمەرگەم هەبێت و لای برادەرەکانم شانازیی پێوەبکەم، تکات لێدەکەم تۆ ببە برام و رێمبدە بە کاکە گازتبکەم.

+دەی، بڵێ تۆ خوشکمی.

-تۆ نازدارترین خوشکی منی.

پێشمەرگە وەها شێوا، دەتگوت بە بریندارى دەست دوژمن کەوتووە.

ئەو چل رۆژەی تەمەن رۆژانێ بوون ناگێردرێنەوە، ناخوێندرێنەوە، ناگوترێنەوە، نانووسرێنەوە، ئەو چل رۆژە من لە کوێ بووم؟ ئەو ماچە

قوولەی بن دارپرتەقاڵەکە بۆ کوێی بردم، چی نیشان دام؟ ماچی قووڵ خەون و ئاگایی تێکەڵاو دەکات، سنوورێك لە نێوان زەوی و ئاسمان ناهێڵێتەوە، ماچی قووڵ ژیانی سادە کردەوە، ئاسانی خستەوە، هەموو شتی ساکار و جوانکردەوە، جگە لە وانەی بیرکاری، ئەگەر ماچی بن دارپرتەقاڵەکە نەبا، دنیا ئەوها جوان خۆی نیشاندەدا!

چل رۆژ من دەستەخوشکێکمم ماچ نەکرد، قومریشم ماچ نەدەکرد، نەمدەهێشت، ماچم بکەن، پێشتر رۆژانە ماچماچانێمان دەکرد، دەیانگوت:

پەری، تۆ چیت بە سەرهاتووە، بۆ ماچمان نادەیتێ؟

بە پێکەنینەوە دەمگوت:

لێمگەڕێن، با دەسنوێژی ئەوین نەشکێ.

دەشکا، دڵنیابووم کە دەشکێ، دەسنوێژی ئەوین دەشکێ، ئەو دەسنوێژەی لە بن دارپرتەقاڵ هەڵمگرت و پیاوە مەستەکەش دیتی، پرتەقاڵەکان دیتیان، هەنارەکان دیتیان، داربیەکە دیتی، پەنجەرەی دنیا دیتی، من نەدەبوو لێوەکانم بەر هیچ لێوێك بکەون، بەر هیچ گۆنایەك

بکەون، پێموابوو ئەگەر وا بکەم تامی تەڕی ماچی بن دار پرتەقاڵەکە وشکدەکات، دەسڕێتەوە، هەڵدەوەرێ، دەمرێت.

نەمزانی ئەو تامە هەمیشەییە و هیچ ماچێك کاری لێناکات و نەمرە، ماچی یەکەم نەمرە، نەمر وێنەی پایز نەمرە، هێ لە ماچی یەکەم دەبێ هەبێ لە پایز نەمرتر، پایزی لە هەموو وەرزان نەمرتر، چەند جوان بوو مرۆڤ وەك پایز نەمر بێ، ماچی یەکەمی من تێکەڵی پایزە، تا پایز مابێ تا پایز لە چاوم بێ، ماچە پایزیەکەی بن دارپرتەقاڵەکەش هەیە و لە دڵە.

ماچی یەکەم، مینا گۆرانیی پیاوە مەستەکە نەمرە، وێنەی مەستیی پیاوە مەستەکە نەمرە، تا ماچی یەکەم نەهاتە دنیا، مەستی هێندە جێی بایەخی من نەبوو، مەستبوونی پیاوە مەستەکەم هێندە جێی مەبەست نەبوو، ئەو ناوە ناوە بە بادە مەست دەبوو، من چل ڕۆژ بە ماچێکی قووڵ مەست مەست بووم، مەستبوونێك مەگەر کوڕە چیرۆکنووسەکە بتوانێ کەمێکی بخاتە چیرۆکەوە، مەستبوونێ مەگەر پیاوە مەستەکە لە توانایدا بێ کەمێکی بخاتە گۆرانیەکەوە، ئای پیاوە مەستەکە چۆن لە ڕێی هەڵەوە لە ماچی نەمریت پساندمەوە، خۆزی لە خۆزیداران هیچ نەبا هێندەی تەمەنی پرتەقاڵێك بە درەختی دارپرتەقاڵە ماچیەکەوە

دەمامەوە، خۆزگە کوڕی پیاوە مەستەکە شەرمی لە باوکی نەکردبا، تا پەسلان لێوی لە سەر لێوم هەڵنەدەگرت و دەریایەك ئاوی لێوم دەخواردەوە، تەنها ئەویندارا دەزانن ماچی یەکەم چەند تەڕە، چەند بە ئاوە، مەلایەکی گەڕەك کە جارێك خوازبێنی منی لە بابم کردبوو، بابیشم هێندە رقی لێیهەستابوو پێیگوتبوو:

کچم بدەمە سەگ، نایدەمە هیچ مەلایەك.

دەیانگوت لە دانیشتنێك مەلا گوتبووی :

نە بۆ کوڕ نە بۆ کچ ماچی یەکەم حەرام نیە، جا ماچەکە لە هەر کێ بێ.

هەر لە بارەی ماچی یەکەمەوە، دایکم بۆ ژنێکی دەگێڕایەوە:

پیاوەکەم دەڵێ: هەر کەسێ چ ژن چ پیاو ئەگەر ماچی یەکەمی لە بیرنەبێ، دەبێت نیشانی دکتۆری دەروونی بدرێ.

بابی ماچیش زۆر جار بە ماچی دەگوت:

ماچی یەکەم رێك دایکتە...

پیاوە مەستەکەش گوتبووی:

ماچی یەکەم زێدی یەکەمە، نزیك گۆڕی خدری زندەیە، چەندی بچیتە تەمەنەوە، گەنجتر ئاودارتر دەبێتەوە.

کوڕەکەشی دواتر گوتبووی:

ماچی یەکەم دارپرتەقاڵی حەوشەیەکە، هەزار ساڵ دەژی.

ژنە بە تەمەنەکەی سەری کۆڵان کە دەڵێی خودا بە بێوەژنی درووستیکردووە، ئەو ژنەی دەڵێی کولآن بە ئێشکگری داناوە ئێشکگریی بە سەر منەوە، ئەو ژنەی دەڵێی پنچکە گیایەکی گەورەیە لە سەر کۆسپی دەرگاکە رواوە، چوار وەرزەی ساڵ جلکی کەسکباوی پۆشیوە، من بە زۆر شت قەرداری ئەو ژنەم، ئەو ژنە کەسکپۆشە بە ئاشکرا دەڵێت:

کچینە، لە ماچی یەکەم وریابن، بە هەڵە نەچن، بە فیرۆی نەدەن، دنیا پڕە لە گەجەر و گوجەر، بزانن دەیدەنە کێ.

من نابێت بە هەڵە چووبم، ماچم بە فیرۆ نەدا، ماچێکی وام لە حەوشەی ماڵی پیاوە مەستەکە چاند، تا ئێستاش دارپرتەقاڵەکە پرتەقاڵ پرتەقاڵ ماچ دەگرێ، ماچی تەڕ تەڕ لە هەوری ئاسمانی حەوشەکەش تەڕتر، ئاودارتر.

چل شەو برواناکەم بابی چوار شەو خەو چووبێتە چاوم، ئەگەر خەون نەبا دەمگوت ئەو چل شەوە هەر لە بنی نەخەوتووم، خولەکێکیش نەخەوتووم، دایکم هەر بۆڵەبۆڵی بوو، جوێنی پێمدەدا:

بخەوە، کچێ، لۆ ناخەویت، ئەگەر مێردت دەوێ، دە بیکە، بە ئەفسەرەکە بکە، بە قەت ئاسمانێك ئەستێرەی بە شان و سینگیەوەیە.

ئۆی دایکێکی چەند خراپم هەیە، ئێستاش هەر خراپە، بۆ جارێکیش گوێی لە من رانەگرتووە، بۆ جارێکیش بە حەزی منی نەکردووە، بۆ قەت قسەیەکی خۆشی بۆم کردووە، تۆ بڵێی لە دنیایێ چەند دایکی وەك دایکی من هەبێت، خودایە نەبێت، هیچ دایکێکی وەك هی من نەبێت و پەیدا نەبێت، بە نەخەوتنی من دایکم پتر بە رقدا دەچوو، دەیویست دەست لە تیتکم بنێ، لە ترسی بابم نەبا وایدەکرد، دایکم رەنگە وا تێگەیشتبێ خەو لە دەستی خۆمە و ناخەوم، رکەی لەگەڵ دەکەم و لە رقی وی ناخەوم، ئۆی بابم، چ بابێکم هەبوو، خودایە دنیا پڕبکەیت لە بابی وەك بابی من، دەهات، سەرمی دەخستە سەر سینەی خۆی، سەرمی بۆندەکرد، دەستی بە پرچمدا دەهێنا، چەند خۆشە باوەشی باوك چەند خۆشە، بە گەورەیی لە منداڵی خۆشترە، من زۆر جار بە دەستەخوشکەکانم گوتووە:

ئەگەر دەتانەوێ ماندووێتیتان بحەسێتەوە، دەتانەوێ خەونی خۆش ببینن، دەتانەوێ ئاسوودە بن، بڕۆنە باوەشی باوکتان، ئەگەر باوکێکی وەك باوکی منتان هەیە.

باوکی کێ وەك باوکی منە؟ باوکم بە ئەسپایی، نەیدەهێشت کەس ببیستێ، دەیگوت:

کچە جوانەکەم، کچی گەورەم، چیتە، شەرمەکە، بە من بڵێ، گرفتت چیە؟ بۆ ناخەویت؟ جێیەکت ئازاری هەیە؟ باشترە بتبەم بۆ لای دکتۆر.

+نا، ناچم ، هیچم نیە، نازانم، نازانم خەوم نایە و تەواو.

-من کچی خۆم بناسم، شەرمدەکات و شتێك لە باوکی خۆی دەشارێتەوە.

چۆن نەیشارمەوە، دەبوو بیشارمەوە، دەزانن چەند شەرممدەکرد، بابم بە زۆر نیشانی دکتۆری دام، دکتۆر هیچی لێنەزانی، لەگەڵ ئەوەش کۆمەڵێك داو و دەرمانی نووسی، هەمووییم ڕژاندە ئاودەستەوە، بابم باوەڕی بە شێخ و پیاو چاك و نووشتە و کشتەك نەبوو، لەگەڵ ئەوەش ناردمیە سەر سولتان مزەفەر، خۆی بردمیە سەر(ئۆمەر مەندان)،

دایکمی ناردە لای سەیدێك و بە نووشتەیەکی کەسکەوە هاتەوە، نووشتەکەم خستە کەلێنی دیوارێکەوە، ئەگەر مشك نەیخواردبێت، ئێستاش لەوێیە، شەو درەنگان ئەو دەمەی جگە لە من گەڕەك هەمووی لە خەوێ بوون، ئەگەر تەلەفۆنمان هەبا، دوور نەبوو بە زەنگێك ئەویش بە ئاگا بێنمەوە، نەبوو تەلەفۆن نەبوو، دواتر بیستمەوە، باوکم کێشەی نەخەوتنی منی لە لای پیاوە مەستەکەش باسکردبوو، ئەو دووە زۆر برادەر بوون، بابم لە تەمەنی نەیخواردبۆوە، بە بۆنەکەشی پیس تێکدەچوو، بەڵام لەگەڵ پیاوە مەستەکە زۆر برادەر بوون، یەکتریان زۆر خۆشدەویست، پرس و رایان بە یەکتردەکرد، دەردەدڵی خۆیان بۆ یەکتردەکرد، بابم زۆر جار دەیگوت:

ئەگەر هەموو دیندار و خواپەرستێك وەك پیاوە مەستەکە بن، دنیا گرفتی نابێ.

پیاوە مەستەکە گۆتبووی:

خەمی پەریی کچت نەبێ، لەگەڵی نەرم بن و تەواو، کوڕ و کچ لە تەمەنی وا ئاساییە تووشی بێ خەوی بن، مەترسێ لە پەری مەترسێ.

ئەو چل رۆژە رۆژی چل جار پتریش دەچووم دەچووم، هێندەی نەداما بگەمە سەری کۆلان و ماڵی دارپرتەقاڵ و هەنارەکە بەدیاربکەوێت، دوو هەنگاویترم هاویشتبا، پەنجەرەی دنیا دەردەکەوت، دەگەڕامەوە، هەموو جارێ دەگەڕامەوە، نەمدەویست ببینم، کۆلانی ماچی یەکەم ببینم، پێموابوو بە بینینی ئەوێ ماچ کالدەبێتەوە، جادووی ماچ بەتاڵدەبێتەوە، من بیستبووم، خوێندبوومەوەش کە ئەگەر شتێکی جوانت لە جێگەیەك چاند، جا ئەو شتە نەمامێك بێت، قسەیەکی نەوازە بێت، ماچ بێت، درەنگ تا پێت دەکرێت درەنگ سەر لەو جێگەیە بدەوە، تا درەنگتر بیبینیەوە نەمرتر دەبێت، لە تام و بۆ، لە رەنگ و روو خۆشتر و جوانتر خۆشتر خۆ دەردەخات، من وامکرد، رکەم لەگەڵ خۆم دەکرد و بە خۆمم دەگوت:

نا، ماچ بەتاڵناکەمەوە، ماچ نەمرتر دەکەم، درەنگ زۆر درەنگ دەچمەوە کۆلانی ماچ، دەچمەوە بن دارپرتەقاڵی ماچ.

من چل رۆژ دەتگوت پاسی شەقامی خڕی شەستمەتریم، بازنەیی دەخولامەوە، پاسەکان بە دەوری قەڵات دەسووڕانەوە، من بە دەوری داربیە بەرزەکە، ئەو بیەی دەتگوت منارەی چۆلیە و هەینیێ لە هەموو جێیەکی شارەوە دیاربوو، ئەو بیەی ماڵی ئەوانی نیشانی دۆستان دەدا،

دەگەیشتمەوە هەمــوو ئەو ســەرە کۆڵانـانەی دەیانـدامەوە کـۆڵانێکیتر، کۆڵانێـك بـازنەی دەوری داربــیە بەرزەکەی تەواودەکـرد، لە خـولانەوەی دەوری داربـــیەکە کەم کەمە قـــومریش بەگەڵـــم دەکەوت، قـــومری بە زمانگرتنەوە، ئای قومری چەند جوان زمانگرتنی لێدەهات، کەس نەبوو خـۆزگەی پێنەخوازێـت، زۆر کەس ئامــادەبوون ئەگەر نەشــتەرگەریەك هەبێت زمان وەك زمـانی قـومری لێبکـات، زمـانی خۆیان نەشتەرگەری دەکەن، قومری دەیگوت:

+پەری، ئەو جارە بە بێ من چوویە ماڵیـان، قەومانـدت، بیرکـاری ئەوەی لە چاو بوو.

-خۆشم نازانم چۆن گەیشتمە ئەوێ.

+ئەرێ خۆش بوو؟ ماچ و راموسان خۆش بوو!

-وەی وەی! ناگێڕدرێتەوە، تا خۆت تامی نەکەیت... ئەدی ئەتوش تامت نەکرد!

+هەی لەو تامە!

مــاوەیەك پێشــتر قـومری نەخـۆش دەکەوێـت، لەگەڵ بـابی دەچێـتە خەسـتەخانە، دکتـۆرەکە دەرفەت وەردەگرێـت بە کەیفـی خـۆی دەسـت لە

سینگ و مەمکی قومری دەگێڕێت و ناو دەمیشی ماچ دەکات، پێیدەڵێت هەر قسە بکەیت دەرزی ژەهرت لێدەدەم، قومریش لە ترسان خۆی کڕ دەکات.

دووریش نیە نەچوونەوەم بۆ ئەوێ پەیوەندی بە خەونەکانمەوە هەبێ، پەیوەندی بە پژمینەوە هەبێ، هەر جارێ نزیکدەکەوتمەوە لە سەری کۆڵانێ، هێواشی دێنا، ئیدی سارد دەبوومەوە، لەو چل ڕۆژە ئەویش زۆر سۆراخی منی کردبوو، هاتبووە ماڵ، لە سەر ڕێی قوتابخانەش ڕاوەستابوو، یەکدی گیر نەبووین، من باوەڕی زۆرم بە لۆژیکی پژمین هەیە، لەگەڵ ئەوەش سەری چلە لە پژمین هەڵگەڕامەوە، لە بیرمە هێواشی هێنا، بەڵام گوتم:

نارامم نەما، ئەگەر دنیاش کاول بێ، هەر دەچم.

# ٣

# پیاوە مەستەکە

بێـوەی مەبەسـتم بـووبێ، بێـوەی بە دوایـدا گەڕابـم یـان خـۆم لێگرتبێ، کەس هێندەی من بەسەر ماچاندا نەچووە، هێندەی من ماچی کـوڕ و کچـانی نەدیتـووە، هەرگیـزیش باسـمنەکردووە، لە سـاتەکانی مەستیش بۆ کەسم نەگێڕاوەتەوە، مـن بـاوەڕم وایە مـاچ ئەگەر لە سـەر شەقام و لە بەر چاوانیش بکرێ، نهێنیەکی گەورەیە و ناکرێ بۆ کەسـی بگێڕیەوە، نهێنیی ماچ لە کن ئەو کەسەیە کە تۆماری دەکات، هەر ئەو دووە دەتـوانن قسـەیەکی لێـوە بـکەن، کەس مـاچی کەسـیتری بـۆ ناگوترێتەوە، بەڵام ماچی بن دارپرتەقاڵ جیایە.

نـاتوانم خـۆم لە گێـڕانەوەی بپـارێزم، هەر جـارێ بەفـر ببـارێ، هەر بەفـر نـا، هەر جـارێ سـەیری دارپرتەقاڵێـك دەکەم، بە تـایبەتی ئەو سـاتانەی مەسـتم، حەز بە گێـڕانەوەی مـاچە ئێـوارەییەکە دەکەم، ئەو

ماچەم لە ماچی یەکەمی خۆم جوانتر لەبیرە، ئەو ماچەی بەفرێکی بە دواوە بوو، لە هیچ بەفرێك نەدەچوو، بەفرێك تایبەت زۆر تایبەت بۆ ئەو ماچە باری و بە پاکێتی خۆی داپۆشی، جوانی داپۆشی تا گەرد نەگرێ، تا هەر بە سپێتی بمێنێتەوە، ئەو ماچە چ ماچێ بوو، بۆچی هێندە سەرنجراکێش، چی منی بە دیاریانەوە چەقاند، وەك درەخت چەقاندمی، ئەگەر نەیاندیتبام. هەوکەش درەختێك دەبووم لەوێ، خۆزی نەیاندیتبام، هەرگیز لە خۆم نابوورم، ئەو ئێوارەیە گوناهێکی گەورەم لە تەمەنی خۆم تۆمارکرد.

من نایەتە بیرم گوناهێکم کردبێ، من پیاوێکی هەمیشە سەرخۆشم، هەمیشە بێ گوناه بووم، لە تەمەنی خۆم پێکێکم لە دوای خۆم بەجێنەهێشتووە، شووشەیەکم نەشکاندووە، جگە لە شووشەیەك، دەستم لە ژنەکەم بەرزنەکردۆتەوە، رووم لە منداڵەکانم گرژنەکردووە، هەمیشە سەرخۆشێکی ناسك بوومە، جگە لە گۆرانی چیم گوتووە؟ لە بیرمبێ گوناهێکم لە بیربێ، پێشتر گوناهێکی مانگەشەویم کردووە، ئای ئەو ئێوارەیە چ گوناهێکی گەورەم کرد، ماچم پساندەوە، خۆزگە ئەو ماچە قەت نەدەپسایەوە، درێژ درێژ هێندەی تەمەن درێژ دەبۆوە، ئەو دووە وەها لێك گرێدرابوون، من پساندمەوە دەنا دڵنیام هەرگیز نەدەپسانەوە، خۆزگە

نەیاندیتبام هەر بە دیاریانەوە دەبووم، چ گوناهێکم کرد خودایە، خودای ماچان بە بەخشندەیی خۆت بمبەخشە.

ئەو دەمەی منیان دیت، ئای تەریقبوومەوە، تەریقبوونەوەیەك مەگەر ئەو جارەی منداڵێك بە رووتی باوکی لە سەر دایکی دیت هێندە تەریقبووبێتەوە، ئەو منداڵەی خۆزی دەخوازێت قەت چاوی بە سەر بانی شەوە مانگەشەویەکە هەڵنەدەهات، هەڵهاتنێك هەتا ساڵانێکی زۆر رووی نەدەهات بچێتە بەر دەمی دایك و باوکی، لە روویان چاوی هەڵنەدەهات، من هەمیشە پەشیمانم، پەشیمانی هەمیشەییم لە دیتنی شەوە مانگەشەویەکە، زۆر جار دەیگوت بریا ئەو شەوە لە خەو هەرنەدەستامەوە خەوی یەکجارەکیم دەبوو، بەڵام بابم لە سەر دایکم نەدەدیت.

ئەو منداڵە ئێستاش پێوە نازانێت شەیتان بۆچی رێگەی بردە سەربانەکەی ئەوان، رێی ئەو نەدەچۆوە ئەوێ، کێ گەیاندیە ئەوێ، رەنگە خەونێك، بەئاگاهاتنەوە لە خەونێك، دەستی بۆ لای دایك و باوکی رووتی بەر مانگەشەو راکێشابێ، دوور نیە میز بە ئاگایهێنابێ، ئەو شەوە منداڵێك تازە شەیتانی دەبوو، شەیتان دەستی گرت و بردیە دیار دایك و باوکی، لەو دەمەی منداڵەکە گەیشتە سەریان، دایکە رووت رووت بوو، باوکەش نیوە رووت، لە یەکتر ئاڵا بوون، لە ناو تریفەدا لە

یەکتر ئالابوون، منداڵەکە پتر چاوی کەوتە سەر دەمیان کە بە جۆرێك یەکتریان دەمژی مەگەر ئەوانەی بن داربرتەقاڵەکە ئەوها مژیان لە لێوی یەکتر دابێت، لەو شەوەوە، منداڵ رقی لە مانگەشەو هەستا، بەو با شەوەکان هەر هەمووشەوەکان، تاریکە شەو بان، ئەنگوستە چاوبان، کەس تارمایی دایك و باوکەکانی نەدەدیت، لەو شەوەوە منداڵی مانگەشەوەکە میزکردنی تەرککرد، چەندان جار بەخۆیدا کردووە، لەو شەوەوە منداڵە ترساوەکە سەری خۆی هەڵنەدەدایەوە، بشخنکایە هەڵینەدەدایەوە، منداڵە گوناهەکە تا ئەو شەوە نەیزانیبوو دایك باوکی لەو تەمەنەیان دەچنە باوەشی یەکتر و ماچ و رامووسان و شتی وا دەکەن، ئەو پێیوابوو، سەرجێیکردن تایبەتە بە ژن و پیاوی جاحێل، ئەوانەی وەك دایك و باوکی دەچنە تەمەنەوە لەو شتانە بوونەتەوە و بۆی ناگەڕێنەوە.

منداڵی بەر مانگە شەوەکە گەورە بوو، گەیشتە تەمەنی باوکی و لە بن داربرتەقاڵەکە کوڕەکەی خۆی بینی...

چ بەدبەختیەکە، بۆ دەبێت من بە سەر ساتە ناسکەکانی باوکمدا بچم، بە سەر ساتە ناسکەکانی کوڕەکەمدا بچم، تۆ بڵێی ئەوانیش بە سەر مندا هاتبن! من رووم نایە خۆم نیشانی کوڕەکەم بدەمەوە، خۆم نیشانی بووکەکەم بدەمەوە، خودایە من هێندە باوەڕم بە پاڕانەوە نیە، خۆ

لە بیرتە لە چ رۆژێکەوە باوەڕم بە پاڕانەوە نەماوە، خودای شەڕ و ئاشتی و بەرماڵ و مەی و من و ئەفسەر و پشیلە و ئاو، نەڵێی مەستە و تێکەڵدەکات، خودا، دێتە بیرت ئەو رۆژەی ئەفسەرە عەرەبەکە هات و دەستی بە سەر ماڵ و خانووەکەم داگرت و تێیهەڵدامە کۆڵانێ، هەمووی داگیرکرد، هێندەی نەمابوو ژنەکەشم داگیربکات، لە بیرتە چەندت لێپاڕامەوە کە لەو غەدرە بێدەنگ نەبیت و شتێك بکەیت، کوا هیچت کرد! لەو رۆژەوە گوتم، ئیدی بۆ هیچ شتێك ناپاڕێمەوە، نەشپاڕامەوە، ئەو هەموو دەردەسەریەی دنیا رووبیان تێمکرد، خۆت دیدڤانی پەنام بۆت نەهێنا و لێت نەپاڕامەوە.

بەڵام ئەوجارە بە دڵ لێت دەپاڕێمەوە، ئەو کچەی کوڕەکەمی خەنی کرد، کوڕەکەمی ئاودا، ئەو کچەی بەفری لەگەڵ خۆی هێنا، من دەڵێم ئەو بەفری هێنا، بەفری ئەوینی بە سەر ماڵەکەمدا باراند، لێت دەپاڕێمەوە ئەو کچە بکەیت بە بووکم.

دوای شەوە مانگەشەویەکە چەند شەرمم لە دایکم و باوکم دەکرد، دوای ئێوارە پرتەقاڵیەکەش هێندە و پتریش لە بەرانبەر کوڕەکەم شەرم دایدەگرتم، ساڵ وەرسووڕاوەش من هێشتا چاوم لە ئاست چاویدا

هەڵنەدەهات، چاوبەرەژێرم، رەنگە چاوی ئەویش هەڵنەهاتبێ، چاویم نەدیت.

من هەمیشە پەشیمانم لە دیتنی دیمەنی مانگەشەویەکە، لەوەتەی هەم لە هەوڵی سڕینەوەی کالبوونەوەی ئەو دیمەنەم لە چاوم، نەسڕاوە، کالنەبۆوە، شارەو شار لێی دوورکەوتمەوە کالنەبۆوە، هەرچی عەرەقی عەنکاوەیە بە سەرمدا کرد نەسڕایەوە، کالبوونەوەی دیمەنی بن دارپرتەقاڵەکەم ناوێ، با کالنەبێتەوە، حەزدەکەم لە پرتەقاڵەکان گەشتر خۆ نیشاندانەوە، لەو ئێوارەوەی ماچە قووڵە پرتەقاڵەکە تەریقیکردمەوە، زۆر جار کە ئێواران چوومەتە سەر مێز بە ناوی روونتر نیشاندانەوەی ماچە ئێوارەییەکە پێکم هەڵداوە، ئەرێ من بۆچی هێندەی تامەزرۆی بینینەوەی ماچی ئەو ئێوارەیە ئەو دوو عاشقە و ماشووقەم، هەر دەڵێی ماچی یەکەمی خۆمە، هەر دەڵێی من لە جێی کوڕەکەمم، ببوورە، رەنگە پێکێکم پتر لێدابێ، بۆیە وا بەو رەنگە قسە دەکەم، راوەستە با پێکێکیتر تێکەم بۆوەی جوانتر، روونتر، ئاڵۆزتر سەرهاتی حەوشەکە، درەختەکان، پرتەقاڵەکان بگێڕمەوە:

بەربوونەوەی لە سەر داربیەکە بووە قسەی سەر زاری گەڕەك، هەر گەڕەك، گەڕەك گەڕەك بەربوونەوەی پیاوە سەرمەستەکە لە سەر داربی

دەڕۆیشت، گەیشتە یانەکانیش، گەیشتە یانەی مامۆستایان، گەیشتە مامۆستا، مامۆستا، گەیشتە کرێکار کریکار، گەیشتە هەڵاتوو هەڵاتوو، هەڵاتوو لە سەربازی، ئەو هەڵاتووانەی هەتا مرِ دەبوون دەیانخواردەوە، عەرەقی قاچاخیان دەخواردەوە، دەیانخواردەوە بۆ ئەوەی کەمێك ترسی گوللەبارانکردن لە خۆیان دوورخەنەوە.

ئەودەمانێ، ئەودەمەی بەربوونەوەی سەر داربیەکە بووە قسەی سەرمێزان، هەر هەڵاتوویێك دەستگیرکرابا، لە گۆڕەپانی یاری گوللەباران دەکرا، من لەو رۆژەوەی گۆڕەپانی یاری بووە گۆڕەپانی مەرگ، سەیری تۆپانێم لە خۆم حەرامکرد، لە تەلەفزیۆنیش تەماشای یاری ناکەم، سەردانی ئەو برادەرانەشم ناکەم کەماڵیان کەوتۆتە نزیك گۆڕەپانی یاریی شار.

بەربوونەوەکەی سەر داربی دکتۆرێکی پێناساندم، لەگەڵ بەردانی بەنج پێیناساندم، هێشتا کەس نەهاتبووە سەرم، هێشتا هەر نیوە هۆش بووم، ئەو دکتۆرە گەنجە منی دابووە بەر پرسیار:

خاڵە، تۆ چیت دەکرد لە سەر ئەو دارە بەرزە؟ ترست نەبێ، نەشتەرگەریەکەت سەرکەوتووە، زوو سەر پێ دەکەویتەوە، تۆ بە من بڵێ

ئەو کچە چی ئێوەیە، خزمتانە؟ چەند جارێ دیومە چۆتە ماڵی ئێوە، چی دەکات لەوێ؟ پەری دەڵێم، پەری.

سەرەتا وام زانی خەون دەبینم، دوایی هاتەوە، چەند جارێ هاتەوە لە پرسیاری خۆی نەدەکەوت:

+ئەو کچە چی ئێوەیە؟

-برازامە، دەبێتە بووکیشم، چیدی باسی مەکە.

دکتۆر نەهاتەوە، نەمدیتەوە، دواتر زۆر دواتر شەوێك لە یانە هاتە سەرمێزەکەم، خۆی پێمناساندەوە، خواردیەوە، لە من پتر خواردیەوە، لەو شەوەوە زۆر شەوان دەبووە هاومێزم، لە هەموو دکتۆران پتری دەخواردەوە، مەست مەست دەبوو، چ دکتۆرێکی دڵشکاوبوو، دکتۆر، مەستیی دکتۆر بەربوونەوەی سەر داربی لە بیربردەوە! لە دوای بەربوونەوەکەم هەر دکتۆر نا زۆر کەسیدی شەوان بە رێزەوە دەهاتنە تەنیشت مێزەکەم و شەرمنانە خۆیان دەناساند، منیش دامدەنیشاندن و قسە گەرم دەبوو، قسە قسەی رادەکێشا، شەوێك کورێك هات گوتی:

+لەوانەیە بمناسیتەوە، زۆر جار نارووت لێم کڕیوە

- باش دەتناسم، تۆ جوانترین تەرەفرۆشی.

+ سوپاس، بەڵام چ جوانیەك لە تەڕە فرۆشیدا هەیە؟

- وا مەڵێ دوو پیشە لە دیدی منەوە جوانترین پیشەن، عەرەقفرۆش، ئاروو فرۆش...

کوڕە ئاروو فرۆشەکە رستەکانی پچڕپچڕ بوون، شەرمی دەکرد، لە تەماتە سوورتر هەڵگەڕابوو، نەمدەزانی چی دەڵێ، لە پێکی سێیەمم شتێکی لێتێگەیشتم، زوو بڕیمانەوە، شەوێك گەیشتبوومەوە نزیك ماڵێ، چەقۆکێشێك هاتە سەر رێم، چاوەڕێی چەقۆکەیم دەکرد، نزام دەکرد لە سەرم، لە دەموچاومی لادەی، کوێ دەگرێتەوە با بگرێتەوە، کەچی هێند بەرێزەوە هاتە قسە هیچ مەستێك وا بەرێزەوە قسەی نەکردووە:

+راستە کوڕەکەت ژن دێنێ؟

-بەڵێ، لەو رۆژانە، ئەوە لە تۆشم گێڕاوە، بەڵام چەقۆکەت لەگەڵ خۆت مەهێنە.

+پیرۆزە، دێم، ئەگەر رێمبدەی سبەی شەو دێمە سەر مێزەکەت.

- ئاساییە

دوای بەربوونەوە لە سەر داری بی، زۆری کەسی وەك دکتۆر، زۆر کەسی رەنگ زەرد هاتنە سەر مێزەکەم و هێند مەست دەبوون هێند مەست، کەمێك سوورایی دەگەڕایەوە بۆ رووخساریان...

ئەو رۆژەی من بەربوومەوە رێك حەفت پایز وەرسووڕابۆوە بە سەر پایزە بەفراوییەکە، رەنگە سەرەتای پایز بوویێ، هێشتا با دەستی بە رنینەوەی درەختە وەرزیەکان نەکردبوو، پایزێکی خۆڵاوی بوو، پەلە هەورەکانی ئاسمانیش دەتگوت رێیان بە ناو خۆڵەپۆك کەوتووە، من هیچ چارم نەبوو دەبوو بە داربیەکەدا هەڵگەڕێم و جێگەیەکی باش لە ناو لق و گەڵاکانیدا بۆ خۆشاردنەوە ببینمەوە.

دیمەنی ماچە پرتەقاڵیە ئێوارە پایزیە بەفراویەکە دیمەنێك بوو، دەمویست هەمیشە لە چاومدا بیپارێزم، رۆژانە چەندان جار نیشانی خۆم دەدایەوە چێژم لە نیشاندانەوەی وەردەگرت، چێژێ نیازی نوێکردنەوەی دەخستە دڵمەوە، دەبوو ماچ ببینمەوە، دەبوو لە پەنایان خۆم بگرم و چاوەڕێییان بکەم، چاوەڕێی هاتنە ژوان و ماچ، حەوشە گەورەکەی ئێمە حەوشە گوڵزاری و پڕ لە درەختەکەی ئێمە، دەتگوت خودای خۆشەویستی لەو گەرەکە بۆ ژوانی دروستکردووە، من لەو حەوشە ژوانیە بوومە سیخور.

سیخوری هەڵوەدای دوای چێژی ماچ، پیاوێکی چەند منداڵ بووم، لە مانگە شەویەکەی سەر بان هەڵدەهاتم یەکپێ تەمەنێك لە باوکم و دایکمی مانگەشەویەکە هەڵاتم، کەچی دەکەوتمە دوای ئێوارە پرتەقاڵیەکە، ساڵانێك بە دوای کوڕ و بووکەکەمەوە بووم، حەزمدەکرد هەر ئێوارەو هەر رۆژەی لە بن درەختێکی حەوشە ماچاویەکە ماچی نوێی ئەو دوو ئەویندارە ببینم، هەر گوێم لە خشپەیەك با، دەچووم لە پەنایەك خۆم دەشاردەوە، ئێ ئەوە خودایە بە یەك بگەن و لە بن درەختێك ماچێك بچێنن، ماچێك بنووسنەوە، زۆر جار لە ناوەخت دەگەڕامەوە ماڵ، فەرمانگەم بەجێدەهێشت، ئێ بەڵکو بە سەر ماچێکی ناسك، ماچێکی قووڵدا بچم و ئاسوودە بم، ئاسوودەیی خۆمم لە دیتنی ماچی ئەو دوانە دەدیتەوە، هێندە لە ناوەخت دەهاتمەوە ژنەکەم لێم زیز بوو، ساڵێکی رێك نەیهێشت بچمە سەر جێی، ئەو وا تێگەیشتبوو من دڵم لێی پیسە، چەندی دەمگوت:

من هەرچی بم، دڵپیس نیم، لە دایکم دڵپیس بم لە تۆ دڵپیس نابم.

بە گوێیدا نەدەچوو، هەزار سوێندم بۆی دەخوارد هاتنەوەی من پەیوەندی بە تۆوە نیە، دەیگوت:

پێشتر باوەڕم بە سوێندی عەرەقخۆران هەبوو، بەڵام ئێستا، نا...

هەرچیم کرد نەمتوانی، نەموێرا ژنەکەم تێبگەیەنم هاتنەوەی من و چوونە پەنایان پەیوەندی بە تۆوە نیە، زۆری برد، ژنە هەستی بە شتێکی نزیك لە راستیەکە کردبوو، رەنگە شتێکی زانیبێت، شەوێك، درەنگانی شەو بوو، هاتە سەر جێیەکەم و دەستی خستە سەر نێوچەوانم :

+پیاوەکە، تووڕە مەبە، تۆ دەبێت سەرێك لە دکتۆری دەروونی بدەیت.

-تۆ چی دەڵێیت! من شێتم؟

+تۆ لەو بن دارانە خۆ لە چ دەگریت؟

-رەنگە تۆ پێویستت بە دکتۆر هەبێ، دەزانی من هیچ لە تۆ تێناگەم.

باشی تێگەیشتم، بەڵام خۆ وا بە سانایی خۆ بە دەستەوە نادەم، لەگەڵ ئەوە بیریشم لە دکتۆری دەروونی کردەوە، ئەو شەوە نەخەوتم، هەندێك لە شێتبوونی خۆم وردبوومەوە، لە خۆم رادەمام و دەمگوت:

باشە ئەگەر شێت بووم، دەبێت وەك کام لەو شێتانەی شار رەفتار بکەم؟ شێتەکان دیمەنی خۆیان بە روونی نیشانم دەدایەوە بە شێوەیەك وەك ئەوەی من ناچار بە شێتبوون کرابم و دەبێت یەکێك لەوانە هەڵبژێرم

و ببمە هاوشێوەی، لە ناو شێتەکان هەیاس و دارا وازیان لێمنەدەهێنا، هەریەکە و پیلێکیان گرتبووم و رایاندەکێشام، قسەیان لەگەڵم کرد، هەر بەراستی من لەگەڵ ئەوان بووم، هەیاس کە بەردێکی گەورە لە دەستی راستی و خوترمەیەکیش بە دەستی چەپیەوە بە دەنگی بەرز دەیگوت:

وەرە لەگەڵ من، وەك من ئازابە، شێتێکی بوێر و دەستوەشێن بە، لەو شارەدا شێت دەبێت پاڵەوان بێت، شێت دەبێت توانای راوەشاندنی کوچکە بەردی هێندەی سەری خۆی هەبێت و لە منارەوە هەڵیدا دەبێت بە دیواری قەڵات بکەوێت، شێت دەبێت ئەوها بێت ئەگەر کەسێك تیزی پێکرد، وەك مریشك بیگرێ و بە عەردی دادا، ئەگەر ماشێنێك خێرایی کەم نەکردەوە و لە تۆزو خۆڵی هاوینەی وەردای یان قوڕوچلپاوی زستانەی پێدا کردی، مەترسە بە خوترمەیەك جامی بێنە خوارەوە تا تەمبێ بێت و جارێکیدی گووی ئەوها نەخوات، دەی شێتە تازەکە وەرە لەگەڵ من وەرە، وەك هەیاسی پاڵەوان پاڵەوان بە.

داراش کە بە هەردوو دەستی شووشەیەکی مل باریکی بە دەستەوە بوو، ناوە ناوە و زۆر ناسکانە لێوێ پێوە دەنا، دەتگوت لێو بە لێوی کچێکی منداڵکارەوە دەنێ، بە ئەسپایی دەڵێ:

نا، بە قسەی مەکە، ئەوەی هەیاس کەی شێتبوونە، تۆ ئەوها مەبە، ئەوە زەبرو زەنگە، شێت دەبێت نەرم بێت لە منیش نەرمتر، من خۆم قوربانیی زەبرم، کوڕی زەبرم، بەڵام من شێتێکی بە زەبر نیم، لاشەڕم، لەو پەڕی تووڕەبوونیش ئەوپەڕەکەی مووسێك لە خۆم دەدەم، وەرە لەگەڵ من بە، پێویستم بە دارایەکی وەك خۆم هەیە، وەرە ئەو شووشەیە پێکەوە بخۆینەوە.

ئەو جارەش لە خودا پاڕامەوە کە ئەگەر شێت دەبم بەگەڵ دارام بدە و لە هەیاسم دوور بخەوە.

قسەی ژنەکەم و دیتنی شێتەکان و قسەکانی هەیاس و دارا تەواو ترساندمیان، سەردانی دکتۆرێکی دەروونیم کرد، دوای ئەوەی بەڵێنم لێیوەرگرت کە لای کەس نەیگێڕێتەوە، چیرۆکی خۆمم بۆی گێڕایەوە، دکتۆر تەواوێك داما، دەیویست هیچ نەڵێ و بەرێمبکات، نەدەبوو هیچ نەڵێ :

+ئەگەر کوڕەکەت لەگەڵ تۆ وای کردبا، ئامۆژگاریم بۆی دەبوو، من بیستوومە منداڵ هەیە بەرانبەر دایك و باوکی شتی وا دەکات، بەڵام باوك بەرانبەر!

-من پێچەوانەم.

+کە دەزانی پێچەوانەی دکتۆرت ناوێ، سەردانی چاك و شێخان بکە.

-قسەت خۆشە، حەزدەکەم سبەی شەو لە یانە داوەتی من بیت.

+ئەستەغفیروللا، گوتم بۆنێکی ناخۆشت لێدەهات.

-بۆنی قسەکانی تۆش هێندە خۆش نیە.

لەگەڵ دکتۆر تێکمدا، بەڵام ژنەکەم بابی ئەوە ئاشتبۆوە کە جارجارە سەرجێیم لەگەڵ بکات، منیش کەمێ ژیرانەتر و نهێنیتر لە حەوشەکەدا خۆم دەگرت و چاوەڕێی نوێبوونەوەی دیمەنی بن دارپرتەقاڵەکەم دەکرد، ئای چاوەڕێمکرد، من لە چاوەڕێی دیتنەوەی ماچی کوڕەکەم و پەریم.

## ٤

# پەری

ماج چلەی چوو، لە قوتابخانە دەهاتمەوە دەمەو نیوەڕۆیەکی باراناوی بوو، نم نم بە سەر من و قومریی هاوڕێمدا دەباری، دەتگوت بۆ ئێمە دەبارێ، دڵنیابووم ژنی پیاوە مەستەکە لە ماڵ نیە، حەزمنەدەکرد لە ماڵ بێ، گەیشتینە سەری کۆڵانی مەبەست، پژمین باشی نەهێنا، قومری کە زۆر باوەڕی بە خێر و شەڕی پژمینی من بوو، بە چاو ئاماژەی گەڕانەوەی پێدام، من گوتم، چ نیە سەرمام بووە.

لە دوورەوە دیتم پەنجەرەی دنیا لە سەر پشتە، ڕووناکە، دەبێت ئێستا ئەو جوان منی دیتبێت، من کەم جار بە تەنیا و بێ قومری چوومەتە ئەو ماڵە، لە سەر دەرگا شەرم پێیەکانمی بەست، ترس وا بزانم ترس بوو لە پشتەوە باوەشمی پێداکرد و توند گرتمی، دەستی لە دەرگا دان بڵند نەبوو، دەمویست بگەڕێمەوە، هێزی ئەو دیوی دەرگا رایدەکێشام، توند

رایکێشـام، بە منـداڵی کە بـۆ یەکەم جـار دەچـووینە ماڵێـك، مـاڵێکی نەناسراو لە لای مـن، دایکـم ئەوهـای رادەکێشـام، بە مـن بـا بـۆ دۆزەخ رۆیشتبام نەك بۆ مـاڵێکی تـازە، ئـای دەترسـام، ئـای شـەرممدەکرد، خۆم رادەپسـکاند، پێم لە کۆسـپی سـەر دەرگـا دەچەقانـد، چرنـووکم لە دیـوار گیردەکـرد، بەڵام لە ئاسـت هێـزی دەسـتەکانی دایکـم چ کێشـم نەدەمـا، نـازانم بـۆ لەو کـاتە مـن منـداڵە شـەرمنە ترسـاوەکەی پـێش دەرگـای مـاڵێکی بـۆ مـن نەناسـراو بـووم و هێـزەی ئەو دیـوی دەرگـاش دایکـم، خوشکەکەی دەرگای کردەوە، چاوێکم دایە دارپرتەقاڵەکە، گۆڕابوو، چ بەوەی پێشـتر نەدەچـوو، گەڵاکـان سـەوزترن، پرتەقاڵەکـان پرتەقـاڵترن، خوشـکێکی ناسـکی قسـە خۆشـی کەمێـك سەرشێتی هەبـوو، زانـی بـۆ ئاسـانکردنەوەی بیرکـاری هـاتووین، قـومریش زانـی هـاتنی ئەو جـارە پەیوەندی بە بیرکاریەوە نیە، ئێمەی نارده سەرەوە.

لە سـەر پێبلکەکـان هەسـتمکرد دەلەرزم، تـرس دایگـرتمەوە ترسـی پیـرۆزی، دەتگـوت بە پێبلکەکـانی سـوڵتان مـزەفەردا سـەردەکەوم، ئەو سـوڵتانە لای مـن زۆر پیـرۆز بـوو کە لەگەڵ نەنکمـدا زۆر رۆژانـی چوارشەمان سەردانیمان دەکرد، هەستمدەکرد هەرچی پیرۆزیی دنیا هەیە لە ناو ئەو مەزارەیە، چاکی بن عەردیش وابوو، پێبلکەکانی ماڵی کوڕی

پیاوە مەستەکە دەبووە پێبلکەکانی چاکی بن عەردی، کاتێ دەچووینە سەر ئەو چاکانە، ئەنکم دەیگوت:

کچم، نەرم پێت لە عەرد دانێ، دەنگت لێوە نێت، ئێرە زۆر پیرۆزە لە شوێنی پیرۆز، دەبێت هەناسەش بە نەرمی بدەیت.

مالّی پیاوە مەستەکە ئەو رۆژە لە من ببووە سولّتان مزەفەر و چاکی بن عەردی، لەوانیش پیرۆزتر، مالّی پیاوە مەستەکە چ پەرستگایەکی موچڕکاوی بوو، موچڕکەی پەرستن بە سەراپای لەشمدا دەهات و دەچوو، بۆنی بخوری پەرستن گیانمی گرت، مەست بووم، لە سەر پەیژەکانی مالّی پیاوە مەستەکە من بە بۆنی پەرستن مەست بووم، دەنگی هات، لە ژوورەکەی دانیشتین بە بێدەنگی دانیشتین، هەستمدەکرد لە مالّی تاقانەی خوداوەندا دانیشتووم، چ مالّێکی نوورانی بوو، نوور نوور من لە ژووری کوڕی پیاوە مەستەکە نوورم دیت، نووری پەرستگام دیت، نووری ماچم دیتەوە، چ جوان تەماشای دەکردم! دواتر قومری دەیگێڕایەوە:

بە جۆرێك چاوی تێتبڕیبوو هیچ پلّنگێك وا چاو نابڕێتە نێچیرەکەی، دەترسام بەجێتبهێلم، نەوەکو بە خواردن بتخوات، ئۆی! کوڕی برسی چما ئەوهایە؟!

قومری یەك دوو جار دەیویست بە تەنیا جێمانبێڵێ دەستیم گرت و دامنیشاندەوە، ئای تەماشایمکرد، وەك ئەوەی مرۆڤێك، فریشتەیەك لە ئەستێرەیەکیدیەوە هاتبێ و سەراپای جێی تێڕامان بێ وای تێڕامابووم، دەمویست خۆم بە باوەشی دادەم، نەدەوێرام، من پشتم لە پەنجەرەی دنیا و ئەو رووی لە پەنجەرەی دنیا، چ دانیشتنێکی گەرموگوڕ بوو، دانیشتنێك رستەیەکی لێ نەگوترا، بێدەنگ بێدەنگ، جگە لە گۆرانیەکە چ دەنگ نایە، گۆرانیە هەمە رەنگەکەش زۆر شتی گوت، کۆپلەیەك لە وەی دەڵێت:

..یان بمکە پیری مەیخانە

یان موریدی خانەقات بم...

کۆپلەیەك:

ئەی ئاوێنەی دولبەری، روو دەم گوڵ زولف زەری

با هەناسەم نەتگری رووی خۆت بێنە بەو لاوە...

لەو دانیشتنە بە چاو زۆر رستەی درێژ گوترا، دەستی قومریم گرت و هەستاین، بێ ماڵئاوایی، لەو ساتە گۆرانیەکە بووە:

هەر دەڕواو بەجێمدێلێ...

لە هاتنەوە خوارەودا گوێم لێبوو گوتی :

پەری، بە هەمیشەیی لەو پەنجەرەوە چاوەڕێی دەرکەوتنی تۆ دەکەم.

لە هاتنە دەرێ لە سەری کۆلانێ پیاوە مەستەکە بەرەو ماڵ دەهاتەوە، بە دیتنی من، منداڵانە پێچی کردەوە و پشتی کردە ماڵێ، بەو بارانە رووی لە کوێ کرد؟ قومری گوتی:

+سەرنجت دا لە هەر گۆرانیەك کۆپلەیەکی مەبەستدار، وا دیارە ئەو کاسێتەی بە دەستی خۆی وا رێکخستووە و هەڵبژاردەیەکی لە کۆپلەی گۆرانیەکان کردووە.

-لێدەزانێت.

ئەو کوڕە بە هەمیشەیی لە پەنجەرەوە چاوەڕێی منە، لە پەنجەرەی دنیاوە چاوەڕێی هەڵهاتنی من دەکات، ناکرێ دەرنەکەوم، بە خۆم دەگوت:

ڕۆژ و مانـگ لە هەڵهـاتن بـکەون، مـن هەر دەبـێ هەڵبـێم، لە پەنجەرەکەوە بۆ کوڕی پیاوە مەستەکە هەڵبێم.

دەبوو هەڵبێم جێی هەڵهاتنی مـن ئەوێ بـوو، ئەوێ و بەس، جـگە لەوێ لە هەر جێـیەك بـام هەسـتم بە ئـاوابوونی خـۆم دەکـرد، لە هەر شـوێنێکی شـار بـام، چـاوم لە داربـیە بەرزەکە دەگێـڕا، ئەو داربـیەی ساڵانێك بۆ من ڕووگەنما بوو، نوێژەکانم ڕووەو ئەوێ بوون، ئەو داربیەی دانی ئێواران سێبەری خۆی بە سەر پەنجەرەی دنیادا هەڵدەخست، ئەو داربیەی چۆلەکەی شار، چۆلەکەی گوندەکان لە ترسی دارلاستیکەکان پەنایان بۆی دێنا، درەختی وا چۆلەکدار نەبووە و نابێتەوە، بە قەت گەلا بەهاریەکانی چۆلەکەی گرتبوو، داربیەکە بەردی نەدەگرتەوە، بە پێی ڕێککەوتنێکـی نێـوان پیـاوە مەسـتەکە و منـداڵانی گەڕەك، دارلاسـتێك داربـیە چـۆلەکەدارەکەی نەدەگـرتەوە، پیـاوە مەسـتەکە کـاریگەریەکی جادوویـیـانەی بە سـەر منـداڵەوە هەبـوو، لە قسـەی دەرنەدەچـوون، پێیگوتبوون:

بەرد مەهـاوێژنە داربـیەکە، هەر کـاتێ نیـازی هاویشـتنی دارلاسـتیکتان کەوتە سـەرێ، وەرنە لای مـن پـارەی بلیتـی سـینەماتان دەدەمێ.

دەیانگوت، هەموو کەس دەیانگوت، بە شێوەیەکی هێندە بەرێز و جوانیش پارەی سینەمای داوەتە منداڵان، شەرمگرتنێك دایگرتوون بە شێوەیەك کە بۆ یەکجاری دارلاستیکیان فڕێداوە و جارێکیدیش پارەیان لە پیاوە مەستەکە وەرنەگرتووە، پیاوە مەستەکە بۆ پاراستنی گیانی چۆلەکەکان و رووخساری شووشەی پەنجەرەکان، کوڕەکەیشی فێری بەخشینی پارەی سینەما بە منداڵان کردبوو، منیش ویستم فێربم، رۆژێك دیتم مێردمنداڵێك، دارلاستیکی لە دەستە و خۆی تیواوتی کردۆتەوە، سێرەی لە لقێکی داربییەکە گرتووە، گوتم:

+راوەستە گچکەڵ، بەرد لە کێشکە مەگرە، ها پارەت بدەمێ، بۆ خۆت بڕۆ سینەما.

-پارەم لۆ چیە، لە باتی پارە ماچێکم لەو خاڵەی گەردنێ بدێ.

+ئەی رووڕەش ئەوە چ دەڵێی!

-ئەتو هەر جوون بدە، من جوونت پێنادەم، لەبەر خاتری تۆ بەرد ناهاوێم و پارەشم ناوێ.

ئەو منداڵە هێندە گفت و لفتی شیرین بوو، هێندەی نەمابوو بڵێم، ماچێکی گەردن قەردارتم، ئای خاڵی گەردن، چەند سەر بە گۆبەندی،

هەر یەکە و لای خۆیەوە ناوێکی لەو خاڵەی گەردنم نابوو، کوڕی پیاوە مەستەکە دەڵێت:

خاڵی گەردنی یارم بەردە رەشەکەی کابەیە، بەڵام جگە لە من کەس مافی تەوافکردنی نیە.

بابی ماچ لە نامەیەکدا بە چەندان شێوە لەو خاڵە دوا بوو، گوتبووی:

لە ئاسمانێکی سپی سپی، ئەستێرەیەکی رەش رەش هەیە، دەزانی ئەوە چیە؟ نەڵێی بەختی تۆیە...

جارێك مەلایەك لە نوێژی هەینی دەگەڕایەوە ماڵ، لە سەری کۆڵانێ تووشم بوو، لە بن لێوانەوە:

سوبحانەلا لە جوانی، ئەو خاڵە دەڵێی گلێنەی چاوی فریشتەی خودایە.

ئەو کوڕەی لە بناری قەندیلەوە هاتبوو، ئەنفال راوی نابوو، هاورێیەکەم گوێی لێببوو، وەها قسەی لەو خاڵەی گەردن کردبوو:

لە بناری قەندیلێ ئەوە دەمەی بەفر دنیا سپی سپی دەکات و بۆ ماوەیەك لێدەکاتەوە، وەرە رەشماڵێك لەو سپێتیەی قەندیل هەڵدە، خاڵی ئەو کچە کتومت ئەو رەشماڵەیە.

کوڕە کەڕولاڵەکەش ئەوەی بە کوڕە کەشخەکە ناوی رۆیشتبوو، ئەو کوڕەی کیژی گەڕەك بۆی شێت ببوون و زۆریان لەبەر خاتری وی خۆیان فێری زمانی کەڕولاڵان کردبوو، بەڵام کوڕە کەشخە قسەی لەگەڵ کەسیان نەدەکردو ئاوڕی لێنەدەدانەوە، قومری لە هەموو کچان جوانتر و شیرینتر بە زمانی کەڕولاڵان دەدوا، کوڕەکەشخەکە لە ناو کچان تەنها قومری برادەری بوو، قومری دەیگوت:

کوڕەکەشخەکە دەڵێ:

لە دنیایێ یەك خوشکم هەیە، ناوی قومریە.

قومری دەیگوت:

بەڵام من بە برای خۆمی نازانم، من ئاگرم بۆی گرتووە.

لە بارەی خاڵی گەردنەوە قومری دەیگوت، کوڕی کەشخە سەرهاتێك دەگێڕێتەوە:

فریشتەیەکی ئاسمانیێ بە دزیی خوداوە عەشقی پەریی زەوی دەبێت، نازانێت چۆن بیگاتێ، شەوێك بۆ یەکەم جار و دوا جار خودا سەر خەوێك دەشکێنێت، فریشتەی ئەویندار هەڵ لە دەستنادات، لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە زەوی و دێتە سەر جێی پەری و بەوە رادەگات کە ماچێك لە گەردنی بکات، جێگەی ماچەکە دەبێتە خاڵ، ئەو خاڵەی دنیای سەرگەردان کردووە.

خاڵی گەردن ناوی زۆر بوو، خوشکترین خوشك دەیگوت:

مەگەر خودا هێندەی خاڵی گەردنی تۆ ناوی هەبێ.

وا بوو، ناوی زۆر بوو، منیش ناوێکم هەبوو بۆ خاڵی گەردنی خۆم:

خاڵی گۆبەند.

زۆر جار دەچوومە بەر ئاوێنە و لە گەردن و خاڵی گەردن رادەمام، ئەو کچانە ئەو ژنانەشم دەهێنانە ناو بینایيمەوە، لە بەرانبەر خۆم رامدەگرتن، یان وێنەی هەندێك لەوانەی خاڵیان لەگەردن بووە پەیدام کردووە، لە تەنیشت وێنەی خۆمم داناون، لێیانڕادەمام، بەراوردی گەردن و خاڵی خۆمم لەگەڵیان دەکرد، کەم جار هەبووە هی من لەوان جوانتر و شیرینتر دەرچووبێت، ئەدی بۆچی هی من گۆبەند دەنێتەوە، بۆچی ئەو

هەموو خەڵکەی سەراسیمە و حەیران کردووە؟! کەرەتێ لە مێژ نەبوو ئەوین دەستی لێوەشاندبووم، بە کچێکی خاڵ لە گەردنی جوانی زۆر لە خۆم جوانترم گوت، تازە ببووە هاوڕێم:

+بە من بڵێ ئەو خاڵەی گەردنت گرفتی بۆت نەناوەتەوە؟

-نا، گرفتی وەك ئەوەی تۆ نا...

+ئێ، خۆ خاڵ و گەردنی تۆ لە هی من جوانترە.

-کێ دەڵێ وایە! هی کەس ناگاتە هی تۆ.

+گاڵتە مەکە...

-گاڵتە ناکەم، هی تۆ زۆر شیرینە.

+وا نیە، من بەدبەختم و تەواو.

-ئەوجا ئەوە بەدبەختیە یان بەختەوەری؟ خۆزگە خاڵەکەی من شارێکی شێت دەکرد.

+من ئەوەم ناوێ، نامەوێ خاڵەکەی من کەس شێت بکات.

-ئێ، دە بڕۆ نەشتەرگەریی بکە، شێتە.

ئەو بە گاڵتە ڕێی نەشتەرگەریی نیشاندام، بەڵام من بە ڕاستی بیرم لێیکردەوە و دەمویست خۆمی لێدەم، دەمویست لە گرفتی خاڵی گەردن ڕزگاربم، دەمویست لە گلێنەی چاوی فریشتە و ڕەشماڵی ناو بەفریَ و ئەو شتانە ڕزگارم بێت، نیازی نەشتەرگەریی خاڵی گەردن، بەرینەدەدام وەك خاڵەکە گرتبووومی لێمنەدەبۆوە، ڕۆژێك بۆ خوشکترین خوشکم باسکرد، هەر بە شێتبوون شێت بوو، بە سەرمدا قیژاندی:

+تۆ شێتی، کچێکی شێتی، شێتی، بەراستی شێتی...

-تۆ نازانی بە هۆی ئەو خاڵەوە من تووشی چی دەبم.

+بۆ نازانم، ئەوانە کەی گرفتن، شێتە چێژ لەو گرفتانە وەریگرە، ئەو گرفتانە گرفتی چێژن، بە دەست کێ دەکەون؟

-من چێژیان لێوەرناگرم.

+باشە، بڕۆ نەشتەرگەریی بکە، هەی شێتە، باشە خەڵك نالێن خاڵەکەی چی لێهات، بۆ نەشتەرگەریی کرد، گرفت دوای نەشتەرگەری سەرهەڵدەدا، باشە ئەو خاڵەکەت نەشتەرگەری کرد، ئەدی پێکەنینەکەت، ئەویش نەشتەرگەری دەکەیت، ئەدی ڕۆیشتنەکەت چی

لێدەکەیت، ئەویش نەشتەرگەریی! ئەدی نیگاکانت، ئەوانیش نەشتەرگەری؟ کچێ شێتە خۆ هەر خاڵی گەردن نیە!

-با خاڵەکە نەشتەرگەری بکەم، بیرێك لەوانیدیش دەکەمەوە

رۆژێك لە ژووره هەمیشە رووناکەکەی، گرفتی خاڵی گەردنم و نیازی نەشتەرگەرییم بۆ کوڕی پیاوه مەستەکە باسکرد، بە گاڵتەیەکی شیرینی وەرگرت، من چەندی هیدڵی قسەمدەکرد، ئەو بە گاڵتەتری وەردەگرت، گوتی:

+بەردە رەشە پیرۆزەکەی من دەشکێنی! پەرستگام دەڕووخێنیت؟

-لە جێگەیتر بەردی جوانتر و پیرۆزترم بۆت داناوە، چەند بەردێك.

+ئەگەر وایە، مەڕۆ لای دکتۆر، بێنە من بۆت نەشتەرگەری بکەم.

روو لە پەنجەرەی دنیا، بە بەر چاوی هەنار و پرتەقاڵەکانەوە، داربیەکەش چاوی لێبوو، بە پێوە، نەرم زۆر نەرم لێوی نا بە خاڵی گەردنەوە، مژی، نەرم مژی، مژی کەمێك توند مژی، توندتر مژی، توندتر توندتر توندیەکی نەرم، دێتەبیرم لەو دەمە کاسێتەکە گەیشتە گۆرانیی شەکرە سێو:

شەکرە سێوە شەکرە سێو

ئەو دەم و لێوە شەکرە سێو

لێوی ئاڵت

لیمۆی کالت

گەردن و خاڵت شەکرە سێو..

مژین دەرزیی پێش نەشتەرگەریی هی بێهۆشکردن بوو، شل شل بووم لە ناو شلتر، خاوبوومەوە، خۆم بە پێوە رانەگرت، کەوتمە سەر رایەخە گوڵگوڵیە خاڵدارەکە، توامەوە لێوی لە سەر خاڵەکە هەڵنەدەگرت، لە سەرم پاڵکەوت، خاڵی گەردنی بەرنەدەدا، بێهۆش بووم، لە جاری بن دارپرتەقاڵەکە بێهۆشتر، بابم بەهۆشی هێنامەوە، ئا، دەنگی بابم بوو، بانگی کردم، بە شێتم تێمەگەن دەنگی بابم بوو، بەڵام لە کوێوە هات، چۆن گەیشتە ژووری نەشتەرگەری، لێمەپرسن، کە بە هۆش هاتمەوە، خاڵ هەر لە ناو لێوی بوو، پاڵێکی قایمم پێوەنا، ترسام لە خوارەوەش نەشتەرگەریی بۆم کردبێ، دەستم بۆ دامەنم برد، هیچ نیشانەی نەشتەرگەریم بەردەست نەکەوت، جلك وەك خۆی بوو، لەشم بەدەرەوە

نەبوو، دوگمەیەکی کراسەکەشم نەترازابوو، زانی بە هۆش هاتوومەتەوە، بەریدام، گوتی:

+تەواو، نەشتەرگەریەکت سەد لە سەد سەرکەوتوو بوو، بەڵام خۆزیا بەنجەکە هێندە زوو بەرینەدەدا.

-نەمزانی دکتۆرێکی هێند شارەزای.

+برۆ لەو ئاوێنە تەماشای خاڵەکەت بکە.

ئاوێنەیەکی ئاسکی باریکی درێژ، لە لای دەرگاوە روو لە پەنجەرەی دنیا بە دیوارەوە هەڵواسرابوو، لە هیچ ماڵێک ئاوێنەی وام نەدیتبوو، گوتی:

+تەواو لێی نزیکبکەوە، بزانە رێك هێندەی بەژنی تۆ نیە.

-ئۆی تۆ چیت لە من کردووە، چۆن برۆمەوە!

چەماوەیەکی بچووك، چەماوەیەکی لێوی، بچووك هێندەی دەمی ئەو، چەماوەیەکی سوور سوور، سووری خوێناوی بە دەوری خاڵی رەشدا خاڵێکی سووری لە گەردنم نەخشاندبوو، خاڵێك لە دوورەوە زۆر لە دوورەوە دڵنیام خۆی نیشانی بینایی رێبوارانی رێی خاڵ دەدا، لە

ئاوێنەوە تەواوێك لە خاڵی سوور رامام، لە خاڵی رەشی ناو خاڵی سوور رامام، هەندێك جار خاڵی رەش لە بینایيم دیار نەدەما، دەگەیشتمە ئەوەی هەر بە راستی نەشتەرگەریی کردبێ، لێیکردبێتەوە، من بە دیار ئاوێنەوە و بە شەرمەوە راوەستا بووم، ئەویش لە دواوە لە ئاوێنەوە تەماشای دەکردم، هات لە دواوە باوەشی پێمدا کرد، خۆم راپسکاند، ترسام لە رووخسارمدا خاڵێکیتریش بنەخشێنێ، ترسام بە دوای خاڵەکانیتریشدا بگەڕێ:

+بەردە رەشێکی ترم نیشاندە، تا کرنووشی بۆ ببەم.

-ئەو کرنووشە هەڵگرە بۆ دوایی، بۆ شەوی...

+دەزانی ئێستا خاڵی گەردنت لە بەردە رەشی کابەیەکی سوور دەچێ.

-نەدەبوو وابکەیت، دیارە دەزانن...

+نا، ئێستا نزایەکی بە سەردا دەخوێنم و دیار نامێنێ، راوەستە دەستی من موتفەڕکە...

بە نەرمی سەری پەنجەی شایەدمانی پێدا دەهێنا، نەرم دەتگوت بە باڵی پەپوولەیدا دێنێ، نەرم ئەوە کەی پەنجەیە، باڵی پەپوولەیە

خاڵیگەردنی من دەشێلێ، لێوی بە لێومەوە نا، دەنگی بابم هاتەوە، خۆم ڕاپسکاند و هەڵاتم، لە هەڵاتنێ گۆرانیەکە نازانم بە چ هونەرێك بووە:

ئەوە تۆ دەڕۆی من جێگەم کوێ بێ

کێ بگرم بە یار شێوەی لە تۆ بێ...

لەو ڕۆژەوە لە سەرمدا خولیای نەشتەرگەریی خاڵی گۆبەند نەما.

ماوەیەکی باش حەفتەی دوو جار کوڕی پیاوە مەستەکەم دەدیت، جارێکیان ژوان، جارێکیان دیدار، ژوانەکە لە ماڵی ئەوان، دیدارەکەش لە ماڵی ئێمە، هەردووکیشیان کورت بوون، ژوانەکان هەر زۆر کورت بوون، کوڕی پیاوە مەستەکە گۆتەنی

بەشی ماچێکی قووڵ ناکات.

ئیدی ماڵی ژوان وەها بوو، دیدارەکەش هەر بەشی نامە گۆڕینەوەیەك، هەر بەشی چەند چاوبڕکێیەك، هەر بەشی ئاو لە دەست وەرگرتنێکی دەکرد، ئەوە بوو ماڵی دیدار، دەستگوشینێکیشی بە خۆیەوە نەدیت، لە ماڵی ژوان کەم زۆر کەم قسە دەکرا، جگە لە دوو سێ ڕستەی هەنگوینیی کوڕی پیاوە مەستەکە چ نەدەگوترا، لە ماڵی دیداریش هەر چاك و چۆنی بوو، یان پرسیارێکی وەڵام کورتی بیرکاری،

هەرچی قسە هەیە لە نامەکانِ بوو، نامەکان ئای نامەکان، چەند بە قسە بوون، ئەو هەموو ساڵە حەفتانە نامەی درێژ زۆر درێژ، کوڕی پیاوە مەستەکە گۆتەنی:

نامەی درێژ، درێژ هێندەی قژی خاوت، خۆزگە ماچەکانیش هێندە درێژ دەبوون.

نامەکان درێژ بوون، نامەکان زۆر بوون، حەیف بۆ نامەکان! هەموویان ژمارەم لە سەر دانابوون، با هەر من بزانم دوا نامە ژمارە چەندی بەسەرەوەیە، نامەکان، چ هەبوو لە نامەکاندا جێی نەبێتەوە، لە دەستگوشینەوە تا دەگاتە پۆستەر لە دیوار دان، لە ماچی لێوەوە تا چوونە سەر جادە و خۆپیشاندان، لە بیرمە جوان لەبیرمە هەر دەڵێی نامەکەم لەبەردەستە و دەیخوێنمەوە، لە نامەی ژمارە رەنگە ژمارە سەرەتاییەکان بووبێت، لە وەڵامی نامەیەکی مندا نووسیبووی:

من حەزناکەم، تۆ خۆت لە کاری ئەوها بدەیت، تکات لێدەکەم وازبێنە و خۆت تووشی گرفت مەکە، بچۆ ئەگەر هەر سووری لە سەری لەبەر خاتری چاوەکانت لەبەر خاتری خاڵی گەردن دێم لەگەڵت بەڵام توورە مەبە دواجارم دەبێ، باشە گوڵی من، سبەی شەو لەوێم.

لەکاتی خۆی گەیشت، شان بە شانی یەکتر رۆیشتین، لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

+چەند خۆش بوو ئەو رێیە رێی ژوانمان با، نەك...

-وا بزانە بۆ ژوان دەچین.

+هەی لەو ژوانە! کەمێك بیر لە خۆمان بکەوە.

-دەستتپێکردەوە! ئەگەر دەترسیت بگەڕێوە، من بە تەنێ دەچم.

+کچێ من لەبەر تۆمە، تێمبگە.

-تێدەگەم، تۆ لە من ناگەیت.

+باشە تێگەیشتم.

گەیشتین، جێگەی ئەوم دیاریکرد، سەری کۆڵان، دەیویست خۆی کارەکەی من بکات، نەمهێشت، دوو پۆستەرم هەڵواسی و گەڕامەوە لای، بە هەناسبڕکێوە گوتی:

+تەواو، بچینەوە؟

-دوو جێگەیتر ماوە.

+ئۆف، له تۆ!

-ئۆفی ناوێ، دەی.

هەرچی پۆستەری ناو جانتاکەم هەبوو، ئەو شەوە هەموویم لەوێ لە سەر ڕێی قوتابخانە، دوو دانەش لە تەنیشت دەرگای سەرەکیی قوتابخانە یەك لای ڕاست، یەك لای چەپ هەڵواسی، دوور بە دووری هەتا نزیك ماڵێ لەگەڵم هاتەوە، پێش جیابوونەوە، لێم نزیککەوتەوە، بە پێکەنینێکی شیرینەوە:

+وا دەزانی من بە خۆرایی لەگەڵت هاتووم!

-سبەی چاوەڕێم بە، ماچێکت قەردارم.

+ماچی قووڵ...

ئەو ڕۆژەی کە دەبوو من قەردی کوڕی پیاوە مەستەکە بدەمەوە، ڕۆژێکی درەوشاوە بوو، بەیانیەکی نەوازە بوو لە ژیانی من، کە دەمدیت قوتابیان لە پۆستەرەکە ورددەبوونەوە، بست بست باڵام دەکرد، هێشتا وانە دەستپێنەکردبوو، هەواڵی پۆستەرەکان بە هەموو قوتابخانەدا بڵاوبۆوە، دەمویست بە هاوڕێکانم بڵێم:

جوان تەماشای بکەن، ورد بیخوێننەوە، ئەوە من هەڵمواسیوە، بەشیماندەبوومەوە.

بەڕێوەبەرەکە کە کچێکی قەیرە بوو، ئێستاش هەر کچە، زراوی چوو بوو، بە لە خۆدان لە خۆی دەدا، چاوەڕوانیی کارەساتێکی گەورەی دەکرد، شێوا بوو، خراپ شێوابوو، دەست و پێی خۆی نەدەدیتەوە، ئەو سەر و ئەو سەری دەکرد، ئەو بەیانیە من و بەڕێوەبەری قوتابخانە چەند دژ بەیەك بووین، من لە دڵخۆشیدا باڵم لێرسکابوو، ئەو لە دڵتەنگیدا خەریك بوو بڕژێتە زەویەوە، زۆربەی قوتابیان دڵیان بە پۆستەرەکان خۆش بوو، هەشبوو لێو و لچی هەڵدەهێنا، هەشبوو بە هەندی وەرنەگرتبوو، وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت، قومری وچەند هاوڕێیەکم تێگەیاند کە بە دەنگی بەرز درووشم بڵێینەوە، پێیانخۆش بوو، لەگەڵ لێدانی زەنگ، دەنگمان هەڵبڕی، زۆری نەبرد قۆتابخانە بووە گەرووێك لە دەنگ، زەنگ زەنگی هەڵبڕینی دەنگی قوتابخانە بوو، قوتابخانە یەك بە دەنگی خۆی ئەو درووشمەی دەگۆتەوە کە لە پۆسترەکەوە پەڕیەوە زاری قوتابخانە، قوتابخانە دەنگی هەڵبڕێ لە پەنجەرەکانیەوە دەنگ دەگەیشتە هەموو ماڵێکی شار، من هەستمدەکرد دەگاتێ، زۆری نەبرد، بە قەد ژمارەی کچان، پیاوی جلك زەیتوونیی چەك بە دەست و داربەدەست رژانە گۆڕەپانی قوتابخانەوە، کەم کەم قوتابخانە دەنگی

هێواش دەکردەوە، هێواش، هێواشتر، دەنگ نەما، جلکزەیتوونیەکان بە ناو وەربوون، باش بوو ئەو جارە کەسیان لەگەڵ خۆیان نەبرد، من دامنابوو بیانەوێت هەر قوتابیەك ببەن خۆم ئاشکرابکەم و رێنەدەم کەس لە جیاتی من بسووتێ، هەر بە راستی وام دانابوو، بەڵام نازانم وامدەکرد یان نا.

ئەو رۆژەی پۆستەرەکان قۆتابخانەیان هێنایە دەنگ و هەموو شار گوێی بۆ هەڵخست، من بە فڕین بە سەر شاردا لە شەقەی باڵم دەدا، دەمویست بە گوێی شاردا بە دەنگی بەرز بخوێنم و بڵێم:

خەڵکینە پۆستەرەکان من هەڵم واسین و کوڕی پیاوە مەستەکەش یارمەتیمی دا، چاودێریمی دەکرد...

ئای بۆ ئەو رۆژە چ رۆژێکی نوێ بوو، رۆژێك بوو هیچ پەیوەندیەکی بە رۆژانی پێشترەوە نەما، رۆژێك دابڕاو لە رۆژان! بەڵام قەردەکەم لەبیرنەکرد، کاتێ لە قوتابخانەوە دەچوومەوە ماڵێ، دەبینم کوڕی پیاوە مەستەکە بە دوامەوەیەوە، دوور بە دووری بە دوامەوەیە، بۆ سۆراخی من هاتبوو، لە سەرە کۆڵانەکان خەڵك چاوەڕێی هاتنەوەی منداڵەکانیان دەکرد، باوکم بە دیتنی من وەگ گوڵ گەشایەوە، بابم کوڕی پیاوە مەستەکەی خۆشدەویست، بە زۆر هێنایەوە ماڵ، نیوەڕۆیەکی چێژاوی بوو، نیوەرۆیەکی سەررێژ لە مێوان بوو، خواردن

تـــامێکی وای دەدا قەت نەیـــداوە، تـــامی لە ئەنجـــامی هەڵواســـینی پۆستەرەکانەوە وەرگرتبوو، تامی لە دانیشتنی کوڕی پیاوە مەستەکە وەرگرتبوو، ئەو نێوەڕۆیە باس هەر باسی دەنگهەڵبڕینی قوتابخانەکەی ئێمە بوو، هەموو چاویان لە دەمی من بوو، چەند بە دڵ و داو بۆم دەگێڕانەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە چاوی لە سەرم هەڵنەدەگرت، بە چاو ئاگادارمی دەکردەوە، هەڵە نەکەم، هەر بە چاو دڵنیام دەکردەوە، کەخەمی نەبێت هەڵواسینی پۆسەتەرەکان بە نهێنی دەهێلمەوە، مێوانێك پرسی:

باشە خۆ ئەوە یەکەم جارنیە پۆستەر بە دیوارەوە هەڵواسرێ، بۆچی ئەو جارە ئەوەی لێکەوتەوە؟

بابم لە وەڵامدا گوتی:

-تەقینەوەش کاتی خۆی هەیە، جگە لەوە رەنگە چەند کەسێك دەسپێشخەریان کردبێ.

میوانێکیتر هەڵیدایێ:

+وایە، شار لە سەر پێیە، بەڵام پێویستی بە ...

نیوەڕۆیەکی پڕ لە قسەوباس بوو، قسە لە بارەی هەستانەوەی قوتابخانەکەی ئێمە،لە سیمای کوڕی پیاوە مەستەکە کەمێك بێزاریم

خوێندەوە، بە چاو تێمگەیاند کە بڕۆوە بۆئەوەی قەردەکەت وەربگریتەوە، پێمسەیر بوو بە نابەدڵی هەستا، بەڵام من دوای کەمێك بە دڵ بە دوایدا چووم.

کاتێ گەیشتمە ژوورەکەی، سەری بە سەر کتێبێکەوە بوو، کتێبی قوتابخانە، عاجز عاجز، بە ساردی وەڵامی دەدامەوە، سەری بەرزنەدەکردەوە، دیار بوو لێم دڵگرانە، تێگەیشتم خەمی منیەتی، نایەوێت بەڵایەکم بە سەربێت، لە تەنیشتیەوە دانیشتم، سەری هەڵنەبڕی، سەیرە، چەند جارە رەنگ نەبوو لێینزیك ببمەوە، بێ بسمیلا لێوی بۆ لێوم دێنا، دەستەکانی هێرشیان دێنا، کەچی ئەو جارە وا هەناسەم خەریکە مووی سەر سینگی دەڵەرێنێتەوە، ئەو سینگە مووداویەی حەزمدەکرد لە سەری بخەوم، لە منداڵێکی ساوا پتر بخەوم، ئەو هەر بێ هەست و خوستە، من ناچار بووم بۆ یەکەم جار دەسپێشخەری بکەم، دەستم برد، کەمێك چەنەگەیم بەرزکردەوە و لێوم بە لێویەوە نا، باوەشی پێمدا کرد گوتی:

ئەوە خۆت هاتی، بزانە چیت لێدەکەم.

مژی، لێومی مژی، ئەو لێوانەی بێ سووراو سوور سوور، خۆی گوتەنی:

کەوی کوێستان سووراییان لە لێوی تۆوە خواردۆتەوە بۆیە دەندووکیان وا سوورهەڵگەڕاوە.

بەرکۆژەمی ترازاند و لێوی .........، ئەو مەمکانەی کە رێك پڕ بە چنگی ئەو بوون، لەو ساتە گۆرانیەکە:

با وا بێ با وا بێ

دەستم لە مەمکی دابێ

ئەگەر مەمکان ئەزیەت دەم

پێنج پەنجەم هەڵوەرا بێ...

توند توند، ئەو مەمکانەی جگە لەو دەستی کەسیان نەگەیشتبووێ، ئەوانەی خۆی گوتەنی:

دوو هەناری خوداییین بە درەختێکی خوداییەوە.

نزای دەکرد:

خودایە، ببیە دایکی حەفت منداڵان و هەر ئەوها بمێننەوە، خودایە گوناهت دەگاتێ ئەگەر شلیان بکەیتەوە.

ئەو ساوایانە مەمکی .... و من نزیك لە دایکانە چاویم ماچ دەکرد، ئەو چاوانەی خۆی گوتەنی:

هەمیشە لە سەر تۆن و ناچنە سەر کەس، تۆ دەبینن و بەس.

لەو وەختە ناسکە بابم بانگمی کرد، ئا دەنگی بابم بوو، کچ دەنگی بابی خۆی ناناسێتەوە! پاڵێکی توندم پێوەنا، تووڕە بوو، پێکەنی، ئەگەر دەنگی بابم نەهاتایە دوور نەبوو بە تەواوی خۆمی بۆ شل بکەم، دوور نەبوو رێی بدەم نەشتەرگەریە گەورەکەم بۆ بکات، دەزانن ئەو رۆژە چەند دڵخۆش بووم، چەند چێژم لە ژیان وەرگرتبوو، دەمویست چێژێکی واش بدەمە کوڕی پیاوە مەستەکە هەتا تەمەنێك لێی نەبێتەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە چەند جار بە منی گوتبوو:

بە چاوی تۆ جگە لە تۆ تامی هیچ مێینەیەکم نەکردووە.

لە هەستاندا نامەیەکی خستە دەستم، لە هاتنە خوارەوەدا، پیاوە مەستەکەم دیت، لە پەنای دارزەیتوونەکە نازانم خەریکی چی بوو، رەنگە منی نەدیتبێ، هەر لە کۆلانێ نامەکەیم کردەوە، رەنگە کورتترین نامەی ئەو بووبێت:

تکا دەکەم وازبێنە، تۆ شتێکت لێبێت من ناژیم.

٥

# کوڕی پیاوە مەستەکە

تا لە سەر دەرگاوە گەیشتە بن داڕپرتەقاڵ، چەند ساڵی ویست؟ کەسێك پەری باش بناسێ، دەزانێ لەو نێوانە چەند کێوی بە ئاسماندا چوو، چەند رووباری سەرشێتی لە چیاوە سەرهەڵگرتوو هەیە، هەر کەسێ پەری بناسێ دەزانێ نێوان سەر دەرگاو بن داڕپرتەقاڵەکەی حەوشەی ماڵی پیاوە مەستەکە رێگەیەکی چەند دوورە.

کەس نیە وەك من پەری بناسێت، لە بیرمە لە سێیەمی سەرەتایی بووم، بوومە هاوڕێی منداڵێك لە خۆم گچکەتر، لە پۆلی یەکەم بوو، لە کاتی پشوو پێکەوە گەمانمان دەکرد، باوکی منداڵەکە باخەوان بوو لە باخچەیەکی نزیك قوتابخانەکە، هاوڕێی مامۆستایەکان بوو زوو زوو دەهاتە قوتابخانە، کە زانی من و کچەکەی هاوڕێین، دەهات دەستی بە سەرمدا دەهێنا و چوکلێتی دەدامێ، خۆشیویستم، من لەو تەمەنەوە

پەری دەناسم، ماڵیشمان چەند کۆڵانێکمان نێوان بوو، هێشتا خۆم نەناسیبوو سەوداسەری بووم، دەمویست ماچی بکەم، گەورەتر بوو تامەزرۆتر بووم، بەڵام ئەو ئاگای لە هیچ نەبوو، وەك هاوڕێیەك تەماشای دەکردم و تەواو، گەورەتر بووین، ئەویندارتر بووم، هەرچی ئاماژەی ئەوین هەیە بۆیم دەکرد، بەلاش بوو، چەند جار راستورەوان پێیم دەگوت:

خۆشتم دەوێ.

هەر گوێی لێنەبوو، جارێك نامەیکی دوور و درێژم بۆی نووسی و دامێ، وەڵام بووە بەردی بن گۆمێ، تووڕە بوو، چەند مانگ هەر خۆی نیشانم نەدا.

گەیشتن بە بن دارپرتەقاڵەکە هەر وا ئاسانە! ئەو پرتەقاڵە بە دەستی خۆم لەگەڵ دار هەنارەکە لە رۆژێکدا چاندمن و گەورەم کردن، گەیشتن بەوێ وا ئاسانە! لێکردنەوەی پرتەقاڵێکە یان هەنارێکە لە دار! گەیشتن بەوێ سەخت بوو، سەختتر لە سەرخستنی رووبار بە چیایەکی سەخت، هاتنی پەری بۆ بن دارپرتەقاڵ، سەختتر بوو لە هاتنی میللەتێك بۆ سەر ئایینی پەیامبەرێك، کوڕی پیاوە مەستەکە هێندەی پەیامبەرێك رەنجی کێشا تا پەریی لە سەر کۆسپی دەرگاوە راکێشایە بن دار

پرتەقاڵەکە، ئەو ئێوارەیەی مـن، کوڕی پیاوە مەستەکە بە مرازی پەیامبەرانەی خۆی گەیشت، پەریی بەژن رێکی کەمەر باریك هێشتا هەر لە قۆناخی ناوەندی بوو، مەمکەکانی دوو هەناری گچکۆکە، گچکۆکە هەر هێندەی هێلکەی بارۆکە بوون، ئەو ئێوارەیە پەری لێوەکانی هەر دەتگوت گوڵە هەنارن، قژە خاوە زەردەپەڕیەکەی ئەو قژەی هی ئەوەیە منی پێهەڵواسن! چاوەکانی ئای لە چاوەکانی، کێ رەنگی چاوەکانی هەڵدێنێ! خۆزگەم بەو ساتەی خۆم کە پەریم راکێشایە بن دارپرتەقاڵەکە.

من لە مەستی نەچووبوومەوە سەر پیاوە مەستەکە، هەرگیز پێکێکم هەڵنەدابوو، بە منداڵی لە کۆڵان لە ناو ژنان کەگوێم لە دەستەواژەی (عەرەقخۆری سەرسەری) دەبوو، نیگەرانی دایدەگرتم، زۆر جار دەهاتە سەر زمانم بە بابم بڵێم:

بابە، واز لە عەرەق بێنە، دەنا پێتدەڵێن سەرسەری.

دەمگێڕاوە، شەرمدەکرد، هەوکەش ئەگەر لە دەست من با لە چیرۆکی پەری، من ناوم دەبووە(کوڕە مەستەکە) نەك بە کوڕی پیاوە مەستەکە ناوم بچێتە چیرۆکەوە، من تا لەبن دار پرتەقاڵەکە لە لێوی پەری ماچە خوداییەکەم لە ژیانم تۆمار نەکرد، نەمدەزانی مەستی

پەری دەناسم، ماڵیشمان چەند کۆڵانێکمان نێوان بوو، هێشتا خۆم نەناسیبوو سەوداسەری بووم، دەمویست ماچی بکەم، گەورەتر بوو تامەزرۆتر بووم، بەڵام ئەو ئاگای لە هیچ نەبوو، وەك هاوڕێیەك تەماشای دەکردم و تەواو، گەورەتر بووین، ئەویندارتر بووم، هەرچی ئاماژەی ئەوین هەیە بۆیم دەکرد، بەلاش بوو، چەند جار راستورەوان پێیم دەگوت:

خۆشتم دەوێ.

هەر گوێی لێنەبوو، جارێك نامەیکی دوور و درێژم بۆی نووسی و دامێ، وەڵام بووە بەردی بن گۆمێ، تووڕە بوو، چەند مانگ هەر خۆی نیشانم نەدا.

گەیشتن بە بن دارپرتەقاڵەکە هەر وا ئاسانە! ئەو پرتەقاڵە بە دەستی خۆم لەگەڵ دار هەنارەکە لە رۆژێکدا چاندمن و گەورەم کردن، گەیشتن بەوێ وا ئاسانە! لێکردنەوەی پرتەقاڵێکە یان هەنارێکە لە دار! گەیشتن بەوێ سەخت بوو، سەختتر لە سەرخستنی رووبار بە چیایەکی سەخت، هاتنی پەری بۆ بن دارپرتەقاڵ، سەختتر بوو لە هاتنی میللەتێك بۆ سەر ئایینی پەیامبەرێك، کوڕی پیاوە مەستەکە هێندەی پەیامبەرێك رەنجی کێشا تا پەریی لە سەر کۆسپی دەرگاوە راکێشایە بن دار

پرتەقاڵەکە، ئەو ئێوارەیەی من، کوڕی پیاوە مەستەکە بە مرازی پەیامبەرانەی خۆی گەیشت، پەریی بەژن ڕێکی کەمەر باریك هێشتا هەر لە قۆناخی ناوەندی بوو، مەمکەکانی دوو هەناری گچکۆکە، گچکۆکە هەر هێندەی هێلکەی باڕۆکە بوون، ئەو ئێوارەیە پەری لێوەکانی هەر دەتگوت گوڵە هەنارن، قژە خاوە زەردەپەڕیەکەی ئەو قژەی هی ئەوەیە منی پێهەڵواسن! چاوەکانی ئای لە چاوەکانی، کێ ڕەنگی چاوەکانی هەڵدێنێ! خۆزگەم بەو ساتەی خۆم کە پەریم ڕاکێشایە بن دارپرتەقاڵەکە.

من لە مەستی نەچووبوومەوە سەر پیاوە مەستەکە، هەرگیز پێکێکم هەڵنەدابوو، بە منداڵی لە کۆڵان لە ناو ژنان کەگوێم لە دەستەواژەی (عەرەقخۆری سەرسەری) دەبوو، نیگەرانی دایدەگرتم، زۆر جار دەهاتە سەر زمانم بە بابم بڵێم:

بابە، واز لە عەرەق بێنە، دەنا پێتدەڵێن سەرسەری.

دەمگێڕاوە، شەرمدەکرد، هەوکەش ئەگەر لە دەست من با لە چیرۆکی پەری، من ناوم دەبووە(کوڕە مەستەکە) نەك بە کوڕی پیاوە مەستەکە ناوم بچێتە چیرۆکەوە، من تا لەبن دار پرتەقاڵەکە لە لێوی پەری ماچە خوداییەکەم لە ژیانم تۆمار نەکرد، نەمدەزانی مەستی

چیه، لەو رۆژەوە من مەستم، بابم هەرچی بادەی دنیا هەیە بە سەر لێویەوە بکات وەك من مەست نابێت، من کورە مەستەکەم، بەڵام کوری پیاوە مەستەکەشم لێدیَ، ئیدی کوری پیاوە مەستەکە منم، من ئەو کورەی بە هۆی پەریەوە شا کوری گەرەك بووم.

من و پەری هەر لە بەراییەوە لە زۆر شت جیاواز بووین، ئەو لە سیاسەت نەدەبۆوە، دەیگوت:

سیاسەتیش جۆرێکە لە ماچ، لە زۆر ساتەوەخت تامی تایبەتی خۆی هەیە.

من لە سیاسەت هەڵدەهاتم و دەمگوت:

بە چاوی تۆ چ تامی لێوەرناگرم.

ئەو دەیگوت:

چاوی من بە هەند وەرگرە، تۆ خۆ تامت نەکردووە، چووزانی تامی چی دەدات!

ماچێکی چاویم دەکرد، ئەو تا چیرۆکێك رۆمانێك هەبا، چاوێکی بە کتێبی قوتابخانەدا دانەدەگرت و دەیگوت:

جوانیەکــان لەو کتێبــانەن، ئەو کتێبــانە بە جــوولەت دێخــن، هــی قوتابخانە دەتکەن بە بلۆك.

مــن ســەیری رۆژنامەشــم نەدەکــرد، وابــزانم ئەودەم تەنهــا کتێبــێکم خوێندەوە ئەویش پەری بە دیاریی پێیدابووم، دەمگوت:

دە وەرە باوەشم، بزانە بلۆکم یان... کچێ، کتێبەکانی قوتابخانە ئایندە دیاری دەکەن.

پەری دەیگوت:

هی من دیاری ناکەن.

ئەو پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بەرفراوان بوو، دەیگوت:

خۆشە لە هەر کۆڵانێك هاوڕێیەك، ناسیارێکت هەبێت، مــن پێویستم بە شارێك هاورێ هەیە.

من هەمووی چەند برادەرێکم هەبوو، دەمگوت:

چەندی برادەر کەمتر بێ، گرفت کەمترە.

بەڵام ئەو جیاوازیـانە، ئەو دژانە بە چـی دەچـن، چ دژێـك توانـای دژایەتی ئەوینی هەیە! خۆزگە هەموو دژەکان لە دژایەتی ئەوین ماندوو دەبـوون، دەبەزیـن، مـن بـۆ گەیشتن بە دڵـی پەری هەمـوو شتێکم کـرد، چـاوم لە جیاوازیەکـان دەپۆشـی، دەمویسـت بـۆ هەمیشـە لە دڵـی وی بمێـنمەوە، دوای ئەوەی وەك جوگرافیاناسێك زۆر جێگەی لەشی پەریـم پشـکنی، ناسـی، بـوومە لەشـناس، نەمـدەتوانی دەسـتبەرداری ئەو دیـاریە بم، دیاریەك لە خوداوە بۆ مـن هـاتبوو، لە دنیـایێ هـیچ لەشولاری وەك پەری هەیە! مەمکەکـان، ئـای مەمکەکـان، مـن دیـدڤانم بە سـەر پێگەیشتنی مەمکە فەریکەکانی پەریەوە، چەنـد فەریـك بـوون، دیـدڤانی حەفتانەم بە سـەر مەمکەکانیەوە، مـن باخەوانی سینە و مەمکـان بـووم، من ناوم لە دەستەکانی خۆم نابوو مەمکپێو، مانـگ بە مانـگ دەمزانـی ستیانەکەی چ قەبارەیەکی بۆ دەبێ، هەرچەند کەم دەیخسـتنە زینـدانەوە، پێویستیان بە ستیان نەبـوو، مەمکی پەریـان ستیانیان بۆ چیە! حەفـت پایز چەند حەفتەی تێدایە، هەموو حەفتەکانی حەفـت پایزەکە نـا، بەڵام زۆرینەیان من دەستێکم لێیانداوە، جا لە سـەر کراس بێ یـان بە رووتـی، زۆرجار لە نامە بۆیم دەنووسی:

حەفتەیەك دەبێت نەمدیوی، زوو وەرە بزانم، هەنارەکانت چەند گەورەتر بوونە، توندترن یان نەرمتر؟

جارێك وای وەڵام دابوومەوە:

هەستدەکەم پەنجەکانت بە هەنارەکانمەوە بەجێماون، تۆ لە پەنجەی خۆت دەپرسیەوە یان لە هەنارەکانی من؟

ئەوهام وەڵام دایەوە :

با تا رۆژی پەسڵانێ پەنجەکانم بە هەنارەکانتەوە بن...

کەرەتێ رەنگە بە مەستی بوویێت بۆ تازە برادەرێکمم گێڕایەوە:

من کچێکی تەمەن پازدە ساڵیم خۆشویست، حەفت پایزی خشت هەنارەکانیم لە ناو دەستی خۆم پەروەردە کرد.

برادەرەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

تۆ بەختەوەرترین کوڕی، خۆزگەم بە خۆت، ئەوەی خوا بە تۆی داوە بە پەیامبەریشی نادا.

پایزی حەفتەم بوو لە نامەیەکدا ئەوهام بۆی نووسیبوو:

پەریەکەم، لە بیرتە حەفت پایزە لە ناو دەستی خۆم هەنارەکانت گەورە دەکەم، با هەر لە ناو دەستم بمێننەوە بەلام پێیانبڵێ گەورەتر نەبن.

پەری ئەوهای نووسیبوو:

باشترە کەمێك گەورەتر بن، چونکە کاتی ئەوە هاتووە، بەشی منداڵیشی پێوەبێت، وا نیە؟

وایە، کاتی هاتووە، من دەبێ پەری بە یەکجاری بێنمە ماڵێ، بیهێنمە ئەو چاوەیەی حەفت پایزە جێژوانە، ژوانی کورت کورت، بەڵام پێش ئەوەی بیگوازمەوە وا باشە بە هەرشێوەیەك بێت لەو مەترسیەی دوورخەمەوە کە قەستی سەریەتی و بە دواوەیەتی و خۆیشی لێی بێ ئاگایە، ئەو کچە دەبێت بێتەوە سەرخۆی، دەڵێی ژیانی خۆی دۆزیوەتەوە، ئەدی هی من! ئەوەی ساڵی پێشوو روویدا گاڵتە نەبوو:

لە پەنجەرەوە دیتم رایدەکرد، قەت بەو حاڵەوە نەمدیتبوو، کاتێ هاتە ژوورێ، رەنگی پەڕیبوو، ئەو رەنگە هەرگیز رەنگی پەری نەبووە، وەك ئەوەی بە حەفت پیاو دەسدرێژیان کردبێتە سەری، پرسیم:

چیتە، بڵێ، بۆچی وا پەشۆکاوی؟

بە هەناسەبڕکێوە:

ها، جارێ ئەوانە لە جێگەیەکی قایم بشارەوە.

کۆمەڵێك بڵاوکراوەی لە جانتاکەی دەرهێنا، ئەو بڵاوکراوانەی بە من با، بوونیان نەبا، من لەو پتر پەشۆکام، بە ترسەوە هاوارم کرد:

دووریان بخەوە، لە منیان دوور بخەوە، بۆچی قورِ بە سەرخۆت و مندا دەکەیت، بۆ، بۆ؟

بە شێنەیی گوتی:

باشە، تووڕە مەبە، ئەوجارە پەنام بۆ تۆ هێناوە، تۆش ئەوها دەمحەوێنیەوە، کێ دەبێتە مێردم!

منیش کەمێك هێوربوومەوە و خەمبارانە گوتم:

کچێ، بۆتۆمە خۆت لەو ئاگرە دوورخەوە، بۆ دەتەوێ هەردووکمان بسووتێنی، دەبێت من بڵێم کێ دەبێتە ژنم!

هەڵچوو:

خۆ خۆم بە سەرتا نەبڕیوە، ژنێك بێنە بە دڵی خۆت...

دەستم بە قژیدا هێنا:

پەریەکەم، تووڕە مەبە، بێنە بچم بیانسووتێنم.

دەستمی هێنایە خوارێ، توورە نابم، بەڵام ئەو بڵاوکراوانە بۆ سووتان نەهاتوونەتە ئێرە.

یەکپێ هەستا و رۆیشت، کەوتمە دوای نەمگرت، دوور بە دووری لە دووی رۆیشتم، دیتمی، وەستا، گەیشتمێ.

+بە دوامدا مەیە.

-دەترسم، خەمی تۆمە.

+مەترسە، جێگەی تر هەیە، بگەڕێوە، دەڵێم بگەڕێوە.

گەڕامەوە، ئەو کچە نابێت وا کەللە رەق بێت، ژنی من نابێت بە دەستی خۆی من و خۆی بخاتە ناو ئاگرەوە، وا چاکە چارەی بکەم، رێگەیەك ببینمەوە رێگەی دەستەمۆکردنی بێ و لە قسەم دەرنەچێ، هەر ئەو رێگەیەی کە برادەرێك دەیگوت:

هەموو کچێکی ئەو وڵاتەی پێدەگیرێ، تەنها ئەوە چارەیە.

کاتێکی باشە بۆ دەستەمۆکردنی پەری بۆ دوورخستنەوەی لە ئاگری سیاسەت، هەردووکمان رێککەوتووین کە وادەی داخوازی هاتووە و دەبێت بێمە پێش، قسە لە ناوی یەکەم منداڵیش کرا. من دەبوو پێش ئەوەی

بنێرمە داخوازی کاری خۆم بکەم، ئەگەر بە زۆرەملێش بێت، ئەو نەخشەیەی لە سەرمە هەر لەو ژوورە بینەخشێنم و وا بکەم پەری بە مەرجی من رازی بێت، مەرجی دوورکەوتنەوە لە ئاگر، ماوەیەکی باشیشە لە نامەکانم ئامۆژگاریی لە ئاگر دوورکەوتنەوەی ناکەم، لە سیاسەت، لە برادەر دوورکەوتنەوەی ناکەم.

پەری هات، لە تەنیشت یەك دانیشتووین، دەستم خستە سەر شانی ماچێکی چاویم کرد، بە دەم باسکردنی ناردنە داخوازیەوە، ماچێکی لێوی دەکەم و بەرکۆژەی دەترازێنم، زەردەپەڕ کەوتبوو، پەری پرچی کردبۆوە، کتومت لە زەردەپەڕی بەهاران دەچوو، بەم دواییانە پەری کەمتر زەردەپەڕی هەڵدەدا، ئەوە یەکەم جارە پەلەی نەبێ، بۆ پەلەی بێت، هەر چەند رۆژێکیترە ئێمە زەماوەندمان کردووە، هیچ قسەیەکی نایەتە سەری، هیچ گرفتێك لە گەیشتنمان بە یەکتر نیە، باوکی منی زۆر خۆشدەوێ، دڵنیام زۆری پێخۆشە ببمە زاوای، ئەوەی تا هەوکە ئێمەی بەیەک نەگەیاندووە، ئاگرەکەیە.

من دەمەوێ لێیدوورکەوێتەوە و ئەویش رۆژ دوای رۆژ لێی نزیکتر دەبێتەوە، هاورێیەتیشی لەگەڵ کوران هێندە فراوانە، دڵم پێوەی بوو حەزمنەدەکرد لە کەس نزیکبکەوێتەوە، هەمیشە لە بن باڵی من بێت، من

دەبێ هەر ئێستا چارەی ئەو گرفتە بکەم، ئێستا سینەی تەواو رووتە، هەرگیز ئەوها رووت نەبووە، ئێستا لە ناو قژە زەردە پەڕیەکەی پەریم، داپۆشیوم، پاڵم خست، لەو ساتە کاسێتەکەم گەیاندە گۆرانی:

یار بەرەو رووی ماڵان هات دوگمەی کردەوە

شەو لە سەر سینەو مەمی رۆژم کردەوە

دەم لە ناو دەمە

دەست لە سەر مەمە...

لاڵ بم...

هەرگیز پەری ئەوها شل نەبووە، ئاخر منیش هەرگیز بەو شێوازە قسەم نەکردووە:

ژنە جوانەکەم، قوربانی ژنە .........، وای دانێ ئێستا شەوی.........، دەی بۆم ........ با هەموو ............

لە ناوکی بۆ سەرەوە جێی پەنجەیەك نەما ....، چاوی داخستبوو، وەها راکشابوو وەها خۆی شل کردبوو، کاتی بوو، نەدەبوو، لە دەستی خۆمی بدەم، دەبێ بڵێم لەو کاتە بۆ چەند چرکەیەك جۆرێك هەستکردن

بە ناپاکی دایگرتم، بەڵام زوو ڕەویەوە، خۆزی نەدەڕەویەوە، من ..............، مایۆکەی پرتەقاڵی بوو، ئێستاش ڕەنگەکەی لە چاومە، یەکەم جارم بوو ئەو جێیەی ژن ببینم، بە رووتی نەمدیت، بەڵام وەك رووت وابوو، وەک ئەوەی بکەوی بە سەر کانی نەمریدا وا کەوتمە سەری، ڕانەکانی توند دەکات، لێکیان ناکاتەوە، گوتم:

ژنە جوانەکەی خۆم،................... دەی.........، بمکوژێنەوە، کچێ...

بە شەرمەوە گوتی:

منیش ......... بەڵام...

ویستم بە زۆر ........، پاڵێکی توندی پێوەنام، نەمدەزانی هێندە بە هێزە، ئەو کچەی تازە هێند نەرم و شل بوو، دەتگوت هێز لە گیانی نیە، ئەو هەموو هێزەی لە کوێ کۆکردبۆوە، بە سەر خۆم نەهێنا، داوای لێبووردنم لێیکرد، هەستایەوە ماچێکی چاومی کرد و گوتی:

هەڵیگرە بۆ...

لە دڵی خۆم گوتم، نا، بۆ ئەو دەم نا، بۆ هەڵێکیتر...

لە خۆم خۆش نابم من چی بووم!

# ٦

# پەری

ئەگەر دەنگی بابم نەدەبوو، چۆن دڵم دەهات ئەو پاڵە توندە بە کوڕی پیاوە مەستەکەوە بنێم، ئەو پاڵەی هەستمکرد لە فیشەکێ قووڵتر برینی خستە گیانیەوە، بە چاوی خۆم برینەکەیم دیت، ئەو نەیویست بە سەرخۆی بێنێ، شاردیەوە، بەڵام من دیتم، گۆرانیەکەشم تاساند، لە رێێ سەرکۆنەی خۆمم دەکرد بۆچی بە برینداری و بە تەنێ لە ژوورەکەیم بەجێهێشت، چ دەبوو ئەوجارە گوێم بە دەنگی بابم نەدابا، ئەرێ من رەنگ نیە لێوم لە لێوی ئەو کوڕە نزیکبکەمەوە، بابم دەنگمدەدا! دەستم بشکێ، بۆچی بە دڵشکاوی بە جێمهێشت، بۆچی پاڵمپێوەنا و نەمهێشت، نای چەند پاڕایەوە، بە پاڕانەوەی وی وەك شەکری ناو ناو دەتوامەوە، کەچی رەقیم نواند، باشە خۆ هەر چەند رۆژێکیترە من شەوێك بە بووکی دەچمە ئەو ماڵە، بۆچی بۆ ئەو شەوەم هەڵگرت، خۆ ئەو دەمیش هەر ئەو تامە دەدا، رەنگە کەمتریش، خۆ لەو

شەوە هێندە ناپارێتەوە، چەند خۆش بوو لە ساتەکانی پاڕانەوە ڕێمدابا، خوا دەزانێت چ چێژێکم لێدەبینی، تا ئەو جارە ئەگەر پاڕایەوە، با ئەوەی نەبووە ببێت، خۆ من هەر...

لە تەنیاییەکی دڵشکاویدا بە جێمهێشت، لە کۆڵانیَ دیتم لە پەنجەرە ڕووناکەکەوە تەماشام دەکات، وەخت بوو بۆی ئاگر بگرم، بانگمی کردبا دەگەڕامەوە، چوومە لای خوشکترین خوشك، باسی دەنگی پەنهانیانەی بابمم بۆی کرد، ئەو دەنگەی سالآنێکە هەر کاتێك جێگەیەکم بەر لێوی کوڕی پیاوە مەستەکە دەکەوێت، هێندە نابا دەگات و لێکمان دەکاتەوە، ئەو دەنگە جگە لە ڕاموسانی بن دارپرتەقاڵەکە، ماچی یەکەم، هاواری لە هەموو ڕاموسانەکان کردووە، ئای لە دەنگی بابم، ئەو بابەی بەقەد دنیایەك خۆشمدەویَ، زۆر لە کوڕی پیاوە مەستەکەشم خۆشتردەویَ، ئەو بابەی هەرگیز بۆ جارێکیش بێدڵی منی نەکردووە، هەر داخوازیەکم لێی هەبوویَ، لێی هەبیَ، بیَ سێودوو بۆمی هێناوەتە دی، دڵنیام، هەرکاتێك بڵێم:

+بابە دەمەویَ شوو بەو کوڕە بکەم.

دەڵیَ، بیَ دوودڵی دەڵیَ:

بڕۆن بە باوکی بڵێن مەلایەك لەگەڵ خۆی بێنێ.

ئەوە جاری یەکەمم بوو، دەنگی لە نادیارەوە هاتووی بابم بۆ خوشکترین خوشك باسبکەم، خوشکترین خوشك تەواوێك داما، پێنەدەچوو چ سەرەدەریەك لەو دەنگە دەربکات، گوتی:

+بە من بڵێ، لەو کاتەی ئەودەنگەت دێتە گوێ، هیچ گۆتەیەکی باوکتت بیرناکەوێتەوە؟

-نا، گۆتەی باوکم! نازانم، نا...

مێشکی خۆم گوشی چ گۆتەیەکیم بیرنەکەوتەوە، دەستی خستە سەر شانم:

+بەڵام من زۆر جار گوێم لە باوکت بووە کە گوتوویەتی: کەس قسە لە سەر کچی من نەکات، من کچی خۆم باش دەناسم، لە ناو ئۆردووێك عەسکەریش بێت لێی ناترسم، کچی من هەڵە ناکات.

-ئێ، وایە، بەڵام...

ئەو ڕۆژە هەتا درەنگ لای خوشکترین خوشك مامەوە، دیار بوو لە چاویدا خوێندمەوە هەواڵێك، قسەیەکی گرنگی لە سەر زارە، بەڵام نایڵێ

و دەیگێڕێتەوە، چەندی هەوڵم لەگەڵی دا هەواڵ نەگوترا و قسەی دەهێنایەوە سەر من، لەو رۆژە دنیایەك رستە گوترا، هەرە زۆریشی لە بارەی شووکردنی منەوە بوو، لە بارەی من و کوڕی پیاوە مەستەکە بوو، لە بارەی ئێوارە بەفراوانەکە ئێوارە پرتەقاڵیەکە، ئێوارەی یەکەم ماچەوە بوو، لە بارەی گرفتی ئاگرەوە بوو، من بە درێژی بۆ خوشکترین خوشکم دەگێڕایەوە کە گرفتی کوڕی پیاوە مەستەکە چی بوو، ئەوەتە بەرانبەر پەنجەرەی دنیا دانیشتووین، بە خوشکترین خوشکم دەگوت:

+گرفتی ئەو ئاگرە، ئاگری سیاسەت و ئاگری برادەری کوڕ.

-ئێ، ئەوە پێشتر بوو، ناڵێی ئێستا نەماون و باسیان ناکات.

-وایە هەر لەبەرئەوەیە لەو رۆژانە ئەوینەکەمان دەچێتە قۆناخێکی نوێوە، قۆناخی زەماوەند.

+تۆ دڵنیای، چیدی گرفتی ئاگر سەرهەڵناداتەوە.

-نزیکەی شەش مانگێك دەبێت بە یەك وشەش، بە ئاماژەیەکیش، ئەو گرفتە نەهاتۆتە گۆڕێ.

وابوو، ئەو ماوەیە ئەوەی لێی نەدەدوا ئەو دوو ئاگرە بوو، نامەکانی هەر هەمووی لە بارەی خوازبێنی و ماڵ و ماڵداری بوون، لە بارەی

ئەوینی هەمیشەیی، ماوەیەك هیچ نامەیەکی نەبوو گرفتی هەردوو ئاگرەکە هیچ نەبێ نەخاتە رستەیەکەوە، منیش هەمیشە پێداگریم لە مانەوەی ئەو دوو ئاگرە دەکرد، زۆری نەمابوو بە تەواوی لێی تووڕە بم و دەستبەرداری ئەو ئەوینە بم کە ئێوارەیەکی پایزی لە بن دارپرتەقالێك چاندم و بەفر کلوو کلوو سپی کرد، ناخۆشی کردبوو، گرفتی کوڕی پیاوە مەستەکە بریا هەر ئاگری سیاسەت با، کوڕی برادەر لە لای من گرفتی گەورە بوو، گرفتی دڵپیسی، ئا من گەیشتمە ئەوەی کوڕی پیاوە مەستەکە دڵپیسیم لێدەکات، جارێك لە نامەیەکدا بە تووڕەیی چەند رستەیەکی تووڕەم بۆ نووسی:

تۆ دەڵێی دڵپیسیم لێدەکەیت، گوێبگرە لە لای من پیسترین پیاو ئەوەیە کە دڵپیس بێ، دڵنیابە ئەگەر هەر کاتێ دڵنیابم تۆ پیاوێکی دڵپیسی، پەیوەندیمان بە تەواوی دەپسێ و چیدی ناتناسم.

ناهەقم نەبوو، دەبوو توندتریشی بۆ بنووسم، رۆژێك پرسی:

+ئەوانەی کۆبوونەوەیان لەگەڵ دەکەیت، کوڕن یان کچ؟

-کوڕن، هەموویان کوڕن.

+چۆن دەبێت کچێك لە ناو ئەو هەموو کوڕانە...

-ئەگەر تۆ لە ناو حەفتا کچیش بیت، مـن ئەو پرسیارەت لێناکەم، بەڵام تۆ گوناهی، تۆ چەند لە ئاگری سیاسەت دەترسی دە هێندە زراوت لە ئاگری برادەری کوڕ چووە، وانیە؟

+تۆ بە هەڵە لە من مەگە.

ئەوانەی من کۆبوونەوەم لەگەڵیان دەکرد کچیشیان لەگەڵ بوو، بەڵام لە رقی پرسیارەکەی ئەو کچم نەخستە وەڵامەکەی خۆمەوە، ناهەقم بوو رستەی وا توندی بۆ بنووسم؟ لە وەڵامدا نووسیبووی:

ئەوەی دڵپیسی لە پەریی ئاسمانێ بکات! خودا چی بە سەر دێنێ؟ کچێ، تۆ پەریی ئاسمانی، کچێ من دڵپیس نیم، ئیرەیی دەبەم، حەزدەکەم ئەو پەریە ئاسمانیە هەمیشە لە سەر زەویی سینەم بێت و بە هیچ لایەکدا نەفڕێ، مەفڕە پەریەکەم مەفڕە.

نامەکەی نەبا دوور نەبوو نەنیشمەوە، من فڕیبووم، بە نامەکەی وەك زۆر جاریتر نیشتمەوە لە ژوورەکەی نیشتمەوە، ئەو کوڕە چ جادوویەکی لە من کردووە، لەو دنیا کوڕە بۆچی کوڕی پیاوە مەستەکە منی حەیران کردووە؟

بزانە، ئەوین چیت بە سەر دەهێنێ!

لە هەستاندا، خوشكترین خوشك دەستمی گرت و داینیشاندمەوە، بە هەوكی پر گریانەوە:

+ناتوانم لێت بشارمەوە.

-دەمزانی ناتوانی، من هیچ شتێکم لە تۆ نەشاردۆتەوە، تۆش هەر ئەوها.

+نامەیەکی گوڵنارم بینیوەتەوە.

-گوڵناری بەهەشتیی خوشکت!

+ئا، ها، بۆ منی نووسیوە.

بە نـابەدڵی دایە دەسـتم، نـامەکە سـێ لاپەڕەی خەتـداری گەورەی خەت کەمێك درشتە، رەنگی کاغەزەکە زەردباوە.

-ئەوە بە ئینگلیزی نووسراوە؟

+نا پیتەکەی لاتینیە.

بـۆ مـن خوێنـدنەوەی ئاسـان نەبـوو، وەك منـداڵێك تـازە فێـری پیـت لێکدان بێت، وا دەستم بە خوێندنەوەی کرد:

bo xuski temen heft saley xo

دەتگوت پێیخۆش بوو نازانم بیخوێنمەوە، لە دەستمی وەرگرتەوە و گوتی:

+ئەوها بیخوێنیتەوە، هەر لاپەڕەی رۆژێکی دەوێت.

-تۆ بۆم بخوێنەوە.

+باشە، پوختەی نامەکە ئەوەیە کە مێردەکەی زۆر لەگەڵی خراپ بووە، ئەویش جگە لە شێتبوون رێگەیەکیتری نەبووە هەڵیبژێرێ.

-مەگەر شێتبوون هەڵبژاردنە!

+وەك لە نامەکە دەردەکەوێت، خوشکی گەورەم بۆ خۆی شێتبوونی هەڵبژاردووە.

-مەبەست ئەوەیە بە ئەنقەست خۆی شێتکردووە؟

+نەخێر، ئەو شێتی بە راستی بووە، شێتترین شێتی ناو شێتان بووە، لە هەموو پیاو وژنەکانی شار شێتتر.

-من لەوە تێناگەم.

+منیش تێناگەم، پەری، منیش تێناگەم، وازی لێبێنە.

-باشە لە کوێت دیتەوە؟

+لە ناو بەرگی داخراوی ئەو جانتایە، ئەها تۆ چەند جار نەتدەگوت ئەو جانتایە چیە؟

منیش دەمگوت: دیاریی خوشکی گەورەمە هەر دەبێت بمێنێت.

ئۆی، پەری هەر ئەوەتە لە بیرمە، رۆژێك ئەو جانتایەی بۆم کڕی و گوتی: بۆ تۆ، بەڵام نایبەیتە قوتابخانە، نایبەیتە دەرێ، با هەر لە ماڵەوە بێت، با دەستی کەسی پێنەکەوێت، بۆ خۆت وردەواڵەی تایبەتی خۆتی لێهەڵگرە، باشە؟ تەڕیشی نەکەیت.

منیش بە قسەم کرد. ئەو جانتایە تەمەنی چواردە ساڵە.

-باشە زانیت نامەی تێدایە، کێ پێیگوتی؟

+خەون، پەری، خەون، لەو شەوانە خەونم بە جانتاکەمەوە دیت، لە بیرتە پێش چەند ساڵێك تۆش خەونت بە جانتاکەمەوە دیت؟

-من خەونم پێیەوە دیت!

دەمویست خەونەکە بیر خۆم بێنمەوە، بە بیری هێنامەوە:

+ئا، لە خەونەکەی تۆ جانتاکەی من لە هەموو جانتاکانی دنیا جوانترە، بە بەهاتریشە، بەڵام جارێ کەس بەهاکەی نازانێت.

وابوو، خەونەکەی من ئەوها بوو، پێیمگوت:

-ئەدی خەونەکەی تۆ؟

+هی من، دیتم خوشکی گەورەم لای جانتاکە راوەستاوە، گوتی:

ئەوە هەتا ئێستا جانتاکەت داخراوە؟

هەر لە خەوەکە قیتبـــوومەوە غـــارم دایە جانتـــاکەم، بەرك بەرك کـردمەوە، دەگەڕام نەمـدەزانی بە دوای چیـدا دەگەڕێـم، وێـنەی ئەو وێنەی خۆم، هی تۆ، هی هاوڕێکانم سەراو بن دەکرد، چی ببینمەوە، بۆ دەزانـم بە دوای چیـدا دەگەڕێـم، ئەو جانتـایە شـەش بەرگـی تێـدایە، زنجیری هەریەکەیانم شەش جار پتر دەکردەوە و دادەخستەوە، پەری ئەها وەرە تەماشـاکە، ئەوەتە لێـرە ئەو جـێ دروومـانەم دیـت، یەکسـەر هەڵمەوەشـاندەوە، دیـتمەوە نـامەکەم دیـتەوە، پەری ئەونـامەیەم، نـامەی خوشکی گەورەم لە بەرگی حەفتەم دیتەوە، نامەی شێتبوونم دیتەوە.

دەستم بۆ نامەکە برد- هەر لە ناو دەستی بوو- ویستم بە چاوی خۆم بیخوێنمەوە، دەستی کێشایەوە:

+لێگەڕێ، خوێندنەوەی ماندووت دەکات، خۆ فێرە خوێندنەوەی لاتینی بکە، هەینێ بیخوێنەوە.

-باشە، وا دەکەم.

خودایە، ئەو نامەیە هیچ کێشەیەك بۆ کەس نەنێتەوە، هەستامەوە، تاوێ رووەو پەنجەرەی دنیای رووناك راوەستام و خوشکترین خوشکم لای نامەکەی خوشکی بە جێهێشت، ئێستا وا لە کۆڵانم بە پێش دەرگای ماڵی پیاوە مەستەکەدا بەرەو ماڵ دەبمەوە، هێشتا نەگەیشتبوومە سەری کۆڵانێ، دوو تورمبێل بە شێوەیەك ئیستۆپیان گرت و وەرسووڕانەوە، پێشیان گەیشتەوە پشتیان، سێ چوار قات زەیتوونی پەلاماریان دام، ئەو رۆژەی لێیدەترسام هات، کەوتمە ناو دەوی گورگان، کەوتمە تەنیاییەکی کوشندەوە، ئەو نەهات من بە پێی خۆم بۆی چووم، دەزانن هاوارمنەکرد، نازانم نە هێندە نەترسام، نە حەپەسام و دەنگم گیرا، دیتم جانتاکەم دەپشکنن، بە عەرەبی گوتیان:

+ناسنامەکەت بێنە.

-هەڵمنەگرتووە، لەماڵێیە.

+ماڵتان لە کوێیە؟

-لێرەوە دەڕۆی پێنجەمین کۆڵان.

+با بچینە ماڵتان.

-دەچین.

لە نێوان خۆیـان کەوتـنە سرتەسرت، هیچیـان تێنەگەیشـتم، خەڵـك لە سەر دەرگاکانەوە وا بزانم تەماشایان دەکردم، ئای لەو تەنیاییە ترسناکەی دەوری داوم، لەو تەنیـاییە ترسـناکەدا پیـاوە مەسـتەکە هەر ئەو و بەس پەیدابوو، رووی لە یەکێ لە قاتزەیتوونیەکان کرد:

+ئەبو جاسم، چۆنی، ئەوە چیت داوە لە کچی من؟

-ئەوە کچی تۆیە؟

+کەس کچی خەڵکی کردۆتە هی خۆی؟

-بە راست کچتە؟ ئەو دەڵێ ماڵمان لەو لایە.

+مـن و تـۆ گاڵتەمـان هەیە؟ ئەو دوو مـاڵی هەیە، کچمە، وەك کچمە، هەر هەڵەیەکی بەرانبەرتـان کردووە، مـن لێی بەرپرسم، وەرن مـن بپشکنن، من بگرن...

-نا، هیچی نەکردووە رەنگە هەڵەیەك هەبێت.

ئـۆخەیش، چـا نەبـوو ئەوجـارە جانتـاکەم جـگە لە دەستەسـڕ و چەنـد دینارێك و بۆنێك چیدی تێدا نەبوو، مـن بەختم هەیە، دەنا جانتـای مـن کەی بێ پەڕە کاغەزی قاچاغ بووە.

لەو کـاتەی ئیزراشیلەکـان وازیـان لـێم هێنـا، کـوڕی پیـاوە مەسـتەکەش پەیدا بوو، بە هاتنی کوڕ، باوك بزر بوو، چ زوو دیار نەما.

+چ بوو؟ هەناسەم گیرا.

-چ نیە، بە هەڵە دەوریان دام.

+بەڵام جارێکیدی بە راستی دەورت دەدەن.

-مەترسە دەوری تۆ نادەن.

+کچێ، شێتە، حەفتەیەکیدی زەماوەند دەکەین...

-ناو کۆڵانە، جێی قسە نیە.

ئەوە یەکەم جار بوو چەند کەسێکی کۆڵان من و کوڕی پیاوە مەستەکە بە یەکەوە ببینن، بەڵام وێناچێ هیچ گومانێکی درووستکردبێ، قاتزەیتوونیەکان وەهایان پێنەکردم کەس هیچ گومانێکیترم لێبکات، لە ڕێیێ لەبەر خۆمەوە دەمگوت:

چ دەبوو، ئەگەر کەسێکم خۆشویستبا لە زۆر شت بە تایبەتیش لە سیاسەت کەمێك لێم نزیکبا.

زوو ئەو ئارەزووە ڕەویەوە، ئەوجارە گوتمەوە:

ئەوین لە سیاسەت گەورەترە، دژەکان هەر هەموو دژەکان لە ناو ئەوین جێگەیان دەبێتەوە، ئەوین بە هیچ ناگۆڕمەوە، بۆ دەگۆڕێتەوە !

دواتر بیستم، لە چەند کۆڵانێك لەو لاوە نزیك ماڵی موختار، پۆستەر هەڵواسراوە، گوایە پۆستەرهەڵواسەکە کچ بووە...

لە ڕێگەی گەڕانەوەم بۆ ماڵێ چەند جارێ ئاوڕم دایەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە بە دوامەوە بوو، باش نەبوو، نەهاتن و ماڵیان نەپشکنی، خۆ زەحمەتە هیچ ببیننەوە، وەهام نەشاردوونەتەوە کەس بیانبینێتەوە، ماڵ سەرو بن بکەن، جێی نامیلکە و پەڕە کاغەزە قاچاغەکان نابیننەوە، لە

گەرماوێ لە بن مەنجەڵی ئاوی سارد، لە گەرماوی ماڵی ئێمە دوو مەنجەڵی گەورە هەیە یەکیان ئاگری لە بنە ئەویدی بۆ ئاوی سارد هەردووکیان لە سەر سێکوچکەی چیمەنتۆیین، ساردەکەیان، کەس ئەو بۆشاییە نابینێ کە کەوتۆتە بن مەنجەڵەکەوە، بۆشاییەك جێگەی نیو تەنەکە پەڕە کاغەزی لێدەبێتەوە، ئەو جێگەیە جگە لە من و بابم و خودا و نەخشەسازی گەرماو کەس پێنازانێت، بابم نەیدەتوانی دەسبەرداری ئاگری سیاسەت بێت، کاتێ زانی، منیش خۆم بەو ئاگرە گەرمدەکەمەوە یان دەسووتێنم، نیگەران بوو، بەڵام رێگەی لێمنەگرت و یارمەتیشمی دا، بابم پێشتر بەشداریی شەڕی چیای هەندرێنی کردبوو، دواتریش لە شار درێژەی پێدا، ئەو ئێوارەیە هاتنی ئیزارائیلەکانم بۆ باوکم گێڕایەوە:

+چ نیە مەترسێ، ئەگەر مەبەستیان تۆ با، رزگارت نەدەبوو، بەڵام دەبێت زۆر زۆر ئاگاداری خۆت بیت، بارو دۆخەکە ترسناکە زۆر ترسناکە، ئەو ماوەیە، دوورکەوە، لە پەڕەکاغەزان دوورکەوە.

-بە قسەت دەکەم.

+دەزانی دوێنێ شەو کوڕی نەفتفرۆشەکەیان لە ماڵ بردووە، تا ئێستا بێ سەرو شوێنە و سۆراخی نیە.

- كوڕى نەفتفرۆشەكەى نزيك منارەى...

+ئا، ئەو...

باش نەبوو ئەو دەمەى ئيزرائيلە قاتزەيتوونيەكان دەوريان دابووم، هەواڵى دەسگيركردنى كوڕى نەفتفرۆشەكم پێنەگيشتبوو، خۆ هەر لەوێ دەمردم، ئەگەر بابم دەزانێ كوڕى نەفتفرۆش يەكێكە لەوانەى لە هێلى من ئيش دەكات، پێرێ بڵاوكراوەى لە من وەرگرتووە، هەر ئێستا دەستم دەگرێ و هەتا قەنديلى بەفراوى ناوەستێ، ئەو قەنديلەى زۆر جار خەونم پێوەى ديوە، لە هەموو خەونەكان منيش رێبوارێك بوومە لە رێزى رێبوارە هەميشە ماندووەكانى، بابم هەستى بە شلەژانى من كرد، تێگەيشت، شتێك هەيە، گوتى:

+شتێكت لەگەڵ ئەو كوڕە هەيە؟

-نا، هيچ...

+نە شەرم بكە و نە بشترسێ، چ هەيە بيلێ.

-شتى شەرمم لەگەڵى نيە، بەلام ترس ئا.

+مەترسێ، من ئەو کوڕە بناسم، پەل پەلیشی بکەن، سەری کەس بە قوڕدا راناکات، بەڵام وا باشترە، جێگۆڕکێیەك بکەین.

ئۆی کوڕی نەفتفرۆشەکە بۆ گیرای؟ کەسێك زمانی لێدای؟ ئەو خواگیرە کێیە؟ دوور نیە بە هەڵە تۆیان بردبێ، تۆ من بتناسم وەك بابیشم دەتناسێت، خۆراگر دەبیت، بەرد بێتە قسە تۆ ورتەت لێوە نایە، هیچت لێهەڵناکرێنن، تۆ پیاوە ئازاکەی، دڵنیام پیاوە ئازاکەی...نا، رەنگە، دەبێت، زیندان، ئەشکەنجە، ئەشکەنجە خوا دەزانێت چی لێدەکەن، تۆ بڵێی نەرووخێت، بەرگەگرتنیش سنووری هەیە، خودایە، هەرچی خۆڕاگری هەیە بیبەخشە کوری نەفتفرۆشەکە، باشە ئەوەی ئەورۆ پەیوەندی بەوەوە نەبوو؟ نا، بڕواناکەم.

+چیتە؟ کچم دەڵێی وڕێنە دەکەیت، نەمگوت مەترسە، نا، مەترسە پشت بە من ببەستە، هەر ئەو شەو دەتبەمە جێگەیەك هەرچی سەگ و سواری حکومەت هەیە بە دواتەوە بن، بۆنت ناکەن، دەستیان ناتگاتێ، هیچ مەترسێ، لەو کوڕە مەترسێ.

-نا، ناترسم، تۆم لە پشت بیت، شتێك نیە بمترسێنێ.

ئەو شەوە میوان لە سەر میوان دەهاتن، مالی ئیمە چ شەوێ بێ میوان نەبووە، بەلام ئەو شەوە رەنگی چ شەوان نەبوو، هەر میوان بوو سەلامی لە میوان وەردەگرتەوە، ژووری میوانان پەنجا کەسی دەگرت، میوان، میوان، میوانی ئازیزیش، کوڕی پیاوە مەستەکە لە ناو میوانان کز کز دانیشتبوو، لە نێوان میوانان ئەو کوڕەش کە بە کوڕە دەستگیرەکە ناسرابوو، بە کۆمەڵێك قسەی نەگوتراوەوە لە سووچێك لە سەر چیچکان دانیشتبوو، کوڕە دەستگیرەکە لە هێلی من و کوڕی نەفتفرۆشەکە خۆی تووش کردبوو، لە چاویم خوێندەوە کە قسەی بۆم هەیە، بەلام کوا دەرفەت! من جار جارە دەچوومە ناومیوانان، پتر لە پەنجەرەکەوە تەماشام دەکردن، دیوی حەوشە، دیوی من رووناك نەبوو، منیان نەدەدیت، لە ناو میوانان من پتر چاوم لە سەر کوڕی پیاوە مەستەکە و کوڕە دەستگیرەکە بوو، دیتم کوڕە دەستگیرەکە هەستا، هەستانێك کەس لە بەری هەڵنەستا، دیار بوو هەستانەکەی هەستانی ئیشی سەر ئاوییە، بەلام من تێگەیشتم، مەبەستی منە، چوومە ناو حەوشە، کە گەیشتە تەنیشتم، بە چرپە گوتی:

+وا چاکە لە مال نەمێنیتەوە، هەر ئەو نا چەند کەسێکیدیش دەزگیرکراون.

-کێ و کێ ؟

+ئێمە نایانناسین.

-باشە، وا دەکەم، بە باوکمم گوتووە، تۆش جێگەیەکی باش ببینەوە.

+خەمی منت نەبێ، جێم هەیە.

کوڕی پیاوە مەستەکە لە دوای هەموو مێوانان هەستا، ئەو نەبووە هێندە درەنگ هەستێ، لە هەستاندا لە نزیك دەرگای حەوشە دوور لە چاوان نامەیەکی هەڵدا و گرتمەوە.

٧

# بابی ماچ

ئەو حەفتەیەی ماچ هاتە دنیایێ، خولیای خانوو لە سەرم گەڕا، بەڵام با هەر بگەڕێ، گەڕانێکی بێهوودە، ئەو دەمە بەتاڵترین بەرك لە شار بە دەرۆزەکەرەکانیشەوە، جگە لە بەرکی شێتەکان بەرکی مـن بـوو، بەڵام نەیانهێشت هەژاریم پێوە دیار بێت، شێتێك کە جاروبار شەوان بە ماڵ دەکەوتەوە، دیوار بە دیوارەوە بووین، ماڵمان رێك بەرانبەر پەرژینە لە چەند جێ رووخاوەکەی باخی گڵکەند بوو، سەر لە سبەینان سێبەری درەختە گوڵاویەکەی ناو باخ دەگەیشتە سەر دەرگای حەوشەمان، شێتێك بوو زۆر جار بە شێت نەدەچوو، ئەو شێتە بە منی دەگوت:

هەرکێ داوام لێبکات با بەرکمان بگۆڕینەوە، رازیم، بەڵام لەگەڵ تۆ نایگۆڕمەوە.

هەر ئەو شێتە کە شەوانی گەرمی هاوین وا رێککەوتووە لەو دیوی پەرژینی باخەوە بە نزیك یەکەوە دانیشین، شەوێك لەو شەوانە لە بارەی جیاوازی نێوان مرۆڤەکان لەبەر خۆیەوە قسەیدەکرد، لێیمپرسی، دوو سێ جار پرسیارەکەم دووبارەکردەوە:

+جیاوازی من و تۆ لە چیدایە؟ من و تۆ وەکو یەکین؟ جیاوازیمان هەیە؟

-هەیە، جیاوازی هەیە، یەك جیاوازی هەیە.

+چیە، جیاوازیەکە چیە؟

-تۆ کرێچی من کرێچی نیم، هەر ئەوە و تەواو.

من لە بارێکی وادا خولیای خانوو کەوتبووە سەرم، قسەی شێتە گڵکەندیەکەش هانیدام کە بۆ گەیشتن بە پلەی شێتەکە و نەهێشتنی جیاوازیی نێوانمان، لەو رۆژەوە خۆم بە دار و بەرد دادەدا، پەنجا کار و جێی کارم گۆڕی، بەڵام خۆم لە هیچ کارێکی وا نەدا، گلەیم بێتە سەر، نە گلەیی ویژدان نە هی کەس، ماچ هەتا گەیشتە حەفت ساڵانیش من و شێتەکە هەر دیوار بە دیوارەوە بووین، ئەو رۆژەی کلیلی خانووەکەم وەرگرت، بە شێتەکەم گوت:

+ئێستا من و تۆ جیاوازیمان نیە.

-نا، ئێستاش جیاوازین.

+لە کرێچێتی دەرچووم.

-دەزانم، بەڵام من بوومەتە کرێچی.

+جیاوازیی پێشوومان لە هی ئێستامان خۆشترە.

-نا، من جێگەم هەیە،گڵکەند گەورەیە لە ماڵی خوا گەورەترە.

خانوو بە دڵی خۆمە، لە خانووە بڵندەکانی گەڕەکە، حەوشەیەکی گەورەی پڕ لە دار و بار هەر دەڵێی بە شێکە لە باخ، لە قاتی سەرێوە زوورگەکان، چیاکان جوان دیارن، لەوەتەی هەم حەزمکردووە لە خانووێك بم لە پەنجەرەیەکەیەوە، لە شانشینەوە چیا ببینم، ئەگەر کوڕێکم ببێ ناوی دەنێم سەفین، ئەو سەفینەی لە پەنجەرەوە لێم دیارە، ئەو پەنجەرەیەی لە یەکەم دیتنیەوە، شێت و سەودای بووم، حەزمکرد لێیەوە تەماشای شار بکەم تەماشای چیا بکەم، لێیەوە چاوەڕێی هەور و هەوری بەفراوی بکەم، لێیەوە با بگرمەوە، تالەکانی گزنگ لە دیدەم بنەخشێنم و بە سەردەرهێنانەوەش زەردەپەڕ بچنمەوە، ئۆخەیەش گەیشتمە ژوور و پەنجەرەی خۆم، گەیشتمە حەوشە و دار و درەخت و گوڵ و

گوڵزاری خۆم، هەر زوو بەچاندنی چەند نەمامێك باخەکەمم ئاوەدانتر کرد، نەمامێك پرتەقاڵ، نەمامێك هەنار، نەمامێك... دیمەنێکی چەند ناسکە لقێك لە دار پرتەقاڵ لقێك لە دار هەنار، لقێك لە ... هەر یەکە بە چەند پرتەقاڵێك بە چەند هەنارێکەوە لە پەنجەرەی سەرێوە سەر بە ژوورێدا بکەن، ئەوەتا وا خەریکە ئەو دیمەنە دەبینم، خۆزی لە سەردەمی هەرزەکاریم ژوورێکی وام دەبوو، ژوورێك پەنجەرەکەی بە سەر کۆڵاندا بە سەر ماڵاندا بڕوانیێ، چەند خۆش بوو هەینیێ پەنجەرەیەکی وەك ئەو پەنجەرەیە هەبا، بە سەر سینگی کراوە و رانی هەڵکراوی ئەو ژن و کچانەیدا روانیبا کە لە گڕ شووشتن و ماڵینی حەوشە و بەردەرگاکانیان بوون، بە سەر ئەو ئەو پەنجەرە و ئەو جێگە نەدیوانەی سەر بانەکانیدا ڕوانیبا کە جێگەی مەبەستداری کچان بوو، بریا پێش ماچ ئەو ژوورە دەبووە ماڵی من، حەیف ئەو دەم من پەنجەرەیەکم نەبوو بۆ تەماشاکردنی دیمەنە بەهەشتیەکان، ئێستاش دەڵێم خودایە وەك چۆن پاراستوومت هەر ئاوا بمپارێزە لە پەنجەرە کراوەکان.

تا سۆندەم دەستنەداییێ و دەستم بە شووشتنی ئەو ژوورە نەکرد لە سەر دیوارەکانی هیچم نەدیت، پێشتر چەند جاریێ سەرم بێرەدا کردبوو، دیواری ئەو چاوەیە وەك دیواری چاوەکانیتر خۆیان نیشان دابوو، هەر دەڵێیی لە گەڵ پرووشەی ئاوی سۆندە ئەو هەموو نەخش و نیگارە

نەخشان، ئەگەر سۆندەی ئاوەکەم نەبردایەتە ژوورەکانیدی، گومانم لە پرووشەی ئاوەکە پەیدا دەکرد، ئەو هەمووو نەخش و نیگارە لە کوێوە هاتن، تۆ بڵێی چاوم رێشکەوپێشکە نەکات؟ چاوم هەڵدەگلۆفت، دەتگوت ناوە ناوە نەخشەکان نەدەمان، دەهاتنەوە، نەدەمان، دەهاتنەوە، ئا، نەدەمان و دەهاتنەوە، ئەو دیوارە دەڵێی دیواری جادووە، بۆ وا دەکات، ئەو نەخشانە چیان لە چاوی من دەوێ! دەڵێی کۆمەڵێك گلۆپی کزی نارنجین، هەڵدەبن و دەکوژێنەوە، چاوی من بۆ وا دەکات! دەبینێ و نابینێ، ئا چەند رۆژە ئەو نەخشانە لێرە نەبوون، ئەگەر لێرە بان جارێك خۆیان نیشاندەدا، وەك ئێستا وا خۆ نیشاندەدەن، من حەفتەیەکە لەو ماڵەم چەند جارێ سەرم بەو ژوورەدا گرتووە، لەو پەنجەرەیەوە تەماشای دنیام کردووە، ئەو نیگارانەم نەدیتووە، ئا هەبێ نەبێ چاوم تووشی نەخۆشی رەنگ بووە، تووشی نەخۆشیی نەخش بووە، لە خۆیدا نەخش دەنەخشێنێ و دەیسرێتەوە، باشە بۆ لە هۆدەکانیدی ئەو نەخۆشیەی نیە؟ سەیرە، ها، رەنگە لە سەر تێکچوون بووبم:

چیتە، بۆچی وا شێتانە لەو دیوارە راماوی و ورێنان دەکەیت؟

بە ئاگای هێنامەوە، نازانم گەیشتبوومە کوێ:

تۆ لە سەر دیوار هیچ نەخش ونیگارێك دەبینی؟

بە حەپەساویەوە:

بۆ نابینم؟ هێشتا بیناییم کز نەبووە.

گوتم: لە کەیەوە لێرەن؟

بە شلەژانەوە:

روونتر قسەبکە تێتناگەم.

هەستمکرد سەرم گێژدەخوا، دانیشتم:

لەوە روونتر، چەند رۆژە لێرە بوون، من ئەورۆ دەیانبینم، تۆ پێشتر بینیوتن؟

بە نا بەدڵی:

من تاقەتی ئەو پرسیارانەم نیە، لەوەتەی هاتووینەتە ئەو خانووە ئەو وێنانەش لەوێن.

هەستامەوە و دەستم خستە سەر شانی:

بە گاڵتەی وەرمەگرە من ئەورۆ دیومن، بۆیە جێی پرسیارە.

گوتی:

سەرسوڕمانەکەت لەوەیە ئەو چەند رۆژە نەتدیون، تازە دەیانبینی؟

گوتم:

ئەدی چی؟ کێشەی من لەوەیە، باشە تۆ بۆچی بە منت نەگوت؟

بە پێکەنینەوە گوتی:

تۆ دەڵێی تێکچووی، یەکەم رۆژ کەهاتینە ئەو ژوورە نەمگوت دەڵێی ئەو دیوارە نەخش و نیگاری پێوەیە، تۆ هەر گوێشت نەدامێ، ئێ خۆ تۆش تەماشات دەکردن، بۆ خۆت نەتدیتن؟

نا، بڕواناکەم من ئەو وێنانەم دیتبێ، قسەکەی ئەویشم نایەتەوە بیر، پێکەوە وێنە وێنە لا دیوار لا دیوار تەماشای وێنەکانمان دەکرد، دیاربوو زۆر کالببوونەوە، دیار نەبوون تابلۆن یان... جوان نەدەبینران، وێنەکان پێدەچوو وێنەکێشێکی کارامە کێشابنی، پرسیم:

+تۆ هیچ لەو تابلۆیانە تێدەگەیت؟

-نا، دیار نین، دەبێت تۆ تێیانبگەیت، ئەدی ئەو هەموو چوونەت بۆ پێشانگاکان بەلاشە؟

بەلاش بوو، وێنەکان کالببوونەوە، هێلەکان نەدەخوێنرانەوە، رەنگەکان چووبوونەوە، تێکەڵیەکی ئالۆز تێکەڵی روانین دەبوو، بە خۆمم دەگوت دەبێت شتێکیان تێبگەم، دەبێت شتێك لە هۆی نەخشاندنی ئەو ژوورە بەو شێوەیە بزانم، رەنگە وێنەکێشەکە بدۆزمەوە، جارێك وێنەکێشێکی برادەرمم هێنایە سەر وێنەکان، هیچی تێنەگەیشت، بە چاویلکەی ورد تەماشای کردن، بە هۆی کالبوونەوە و چوونەوە هیچی لێهەڵنەکراندن، هەندێك شتی گوت، من لێیم وەرنەگرت، بەڵام دەیگوت:

جێپەنجەی وێنەکێشێکی زۆر بە توانای پێوەیە.

گوتم واباشە بە دوای خاوەن خانووەکە ئەوەی لێیم کڕی بگەڕێم، لە رێی دەلاڵەکەوە دیتمەوە، حەیف ئەو هیچی لێنەزانی، کاتێ بە منی فرۆشتبوو تازە کڕیبووی، نەچووبووە ناوی، سۆراخم کرد، لە رێی کوڕێکی دراوسێیەوە کە چەند جارێ لە یانەیەك یەکترمان دیت بووینە برادەر، پێیکەوتم کە خاوەن خانووەکە ماڵێك بووە ئێستا پەرتەوازە هەر یەکەیان لە شارێکن، لە دوای ئەو ماڵەش جگە لە ئێمە کەسی نەهاتۆتێ، لێیم پرسی:

+هیچیان وێنەکێش نەبوون؟

-نەخێر ئەوەی نەیانزانیبێ وێنەکێشی بووە، نەکچیان نە کوڕیان فریان بە سەر وێنەکێشیەوە نەبووە، بەوە دەزانم زۆر جار منداڵە گچکەکەیان کە مامۆستای وێنە داوای وێنەی لێدەکرد، دەهاتە لای من وێنەیەکم بۆی دەکێشا.

حەفتە حەفتە مانگ دەهات و دەچوو، ساڵ هات و رۆیشت، وێنەکان وەك چۆن لە دیوارەکە نەدەبوونەوە، ئاواش لە ئەندێشەی من نەدەسڕانەوە، هەر لە هەفتەی دووەمەوە چاوە جادووییەکەم کردە چاوەی نووستن، هەر چەندە ئەو کەمێك نارەزایی دەربڕی، بەڵام رکەی نەکرد، دیوارەکە هەر بە راستی بووە جادوو، دەمدیت روونتر خۆ نیشاندەدەن، وەك ئەوەی لە پشتەوە پەنجەیەك هەبێ هێلەکان تۆختر بکاتەوە، رەنگ بە رەنگەکان بداتەوە، وێنەکان لە شەواندا و بە تایبەتیش لە ساتەکانی سەرجێییدا لە بن تیشکی گلۆپەکە جوانتر دەدرەوشانەوە، بە تایبەتیش بە دەستپێدا هێنان، تێبینیم کرد چەندی پتر و نەرمتر پەنجەت بە دیوارەکەدا هێنابا، وێنەکان روونتر دەبوون، شتێکیان لێ دەخوێندرایەوە، من باوەڕم بە جادوو مادوو نەبوو، بەڵام لە ئاست ئەو دیوارە، چەند جار گوتوومە:

تۆ بڵێی ئەو وێنانە وێنەی جادوویی نەبن!

من دەمگوت:

+لە چاوی من وێنەکان روونترن، شەو دوای شەو روونترن، دیارترن.

-منیش وایان دەبینم، بەڵام هێندە چاوتیان پێوە ماندوو مەکە، لە جیاتی ئەوان تەماشای منیان پێبکە.

+لە چاوم نابنەوە.

-وا چاکە دیوارەکە بۆیاخ بکەین و تەواو.

+نا، وا مەڵێ، ئەو دەستەی ئەو وێنانەی نەخشاندووە، زۆر رەنجی کێشاوە.

-ئۆی! ئەگەربە قسەی منت بکردایە، ئەو خانووەت نەکڕیایە، ئێستا تووشی ئەو گرفتە نەدەبوویت.

+بە راست، لە بیرمنەمایە تۆ بۆچی دڵت لە سەر ئەو خانووە نەبوو؟

-خۆ گوتم، من حەز بە خانوێك دەکەم روو لە رۆژ...

خۆ منیش ئەگەر چیا دوورەکان نەبا، ئەگەر سپێتیی چیاکان نەبا، منیش حەزمنەدەکرد پشتم لە رۆژ با، دەزانی چ رووناکیەك دەڕژێتەوە چاوەوە لە هەورەبان و شانشینەوە، لە پەنجەرەوە تەماشای چیا تەماشای

هەوری بەفراویی سەر چیا، تەماشای بەفری چیا، ئەو بەفرەی لە چیاوە نەرم نەرم دێ و دەگاتە نزیك شار، تەماشای ئەو هەورە مێگەلیانەی با سەرەو چیا رایاندەدا، چ خۆشە پەنجەرەکەت روو لە چیا بێت، پەنجەرەکەی من بە رووی چیادا کراوەیە، چیا لە پەنجەرەکەمەوە دێتە ژوورێ، من لەگەڵ جوانیەکانی چیا تێکەڵ دەبم، لە وەرزەکانی هەوردا تێکەڵی لووتکەکان دەبم، زۆر جار هەوری سپی، من و چیا بە یەکتر دەگەیەنێ، چ جوانە لە نێوان پەنجەرە و چیا چ دیوارێك هەڵنەچنرێ، من ترسم لێنیشتووە، رۆژێ بێ بالەخانەیەك قیتبێتەوە و ئیدی چیا نەیەتە ناو پەنجەرەوە، دەترسم دانە دانە بالەخانە لە نێوان چیاو پەنجەرە بەرزبنەوە و ئیدی گزنگ لە هیچ وەرزێ رێی بەو ژوورە نەکەوێت، من لە خودام داوایە، خانووەکان هەر نەوی بن، هیچ پەنجەرەیەك جێگەیەکی بڵندتر لە پەنجەرەکەی من نەگرێ، لەو شارەدا و لە نێوان من وچیادا دیوارێك هەڵنەچنرێ.

دەستپێکی خوێندنەوەی وێنەکان، بۆشاییەکان بوو، ئەو بۆشاییەی وێنەیەك لە وێنەکەی تەنیشت خۆی جیادەکاتەوە یان دەیخاتەوە سەری، وێنەکان دەخاتەوە سەر یەکتر، بۆشاییەکان زۆر بوون، هێند زۆر ژماردنی وێنەکان ئاسان نەبوو، بۆشاییەکانیش لە هەندێ جێگە روون نەبوون، بۆیە

ژماردنی وێنەکانی زەحمەتتر دەخست، ناوە ناوە، شەوان درەنگ ئەو دەمەی تەنها من بە ئاگا بووم، دیوار دیوار دەگەڕام.

دیوارەکانی بە بەتاڵی بە وێنەداری هێشتبووەوە جگە لە ئاوێنەیەك چیدی پێوە هەڵنەواسیبوو، چاوم لە سەر وێنە وێنە رادەگرت، راگرتنێك وەك ئەوەی لە سەر درزی مەمکان رابگریت، پەنجەم نەرم نەرم بە بۆشایی وێنەکاندا دەهێنا و دەبرد وەك ئەوەی ختووکەی لێوێکی ناسك بدەیت، من دەبوو بە رێکی ژمارەی وێنەکان بزانم، تا ئەودەمە خوێندنەوەی وێنەکان هەر رێی خوێندنەوەی ژمارەی تێدەچوو، وام دانابوو ئەگەر بزانم ئەو چوار لا دیوارە چەند وێنەیان لە خۆیان نەخشاندووە، نیوەی خوێندنەوەم بۆیان کردووە، هەرێم بە خۆم دابوو هەموو بۆشاییەکان ببینمەوە، بەڵام نەمدیتەوە، نەگەیشتمە گشت بۆشاییەکان...

وێنەکان وەرز وەرز روونتر دەبوونەوە، لە سەر چەند وێنەیەك ژمارە درەوشانەوە، یەکەم ژمارە ژمارەی (٧) بوو، لای سەرەوەی وێنەیەکی نزیك دەرگا کە دەچیە ژووریّ بە لای چەپ، دووەم ژمارە کە خۆی درەوشاندەوە ژمار(١) بوو، ئەوەشیان هەر لای چەپی دەرگا، ژمارە (٧١) ئیدی من بە چاوێك بە دوای بۆشاییە ونەکان دەگەڕام و چاوێکیشم تەرخانکرد بۆ دیتنەوەی ژمارەی نویّ، حەفتەی وا بوو

ژمارەیەکم دەدیتەوە، یان چەند ژمارەیەك واش بووە بە درێژایی وەرزێك ژمارەیەکی نوێ نەهاتۆتە ناو ژمارانەوە، وەرز هات وەرز چوو، نەگەیشتمە دوا ژمارە، بۆشاییەکانیش هەندێکیان بە نادیاری مانەوە، دیار بوو بۆشایی ژمارەی دەخوێندەوە، ژمارەش بۆشایی دیاریدەکرد، من شەوان لە بن تیشکی گلۆپدا بۆشایی بۆشایی بە دوای ژمارەدا رادەکەم و لە ژمارەشەدا پەنجە بۆ بۆشایی دەگێڕم.

نیوە شەوێك، دوای لێبوونەوە لە سەر جێیی ماندووانە گوتم:

+تۆ هیچ لەو بۆشایی و ژمارانە تێنەگەیشتی؟

عارەقەی نێوچەوان و گەردنی سڕیەوە:

-خۆزگە شتێکیان تێدەگەیشتم، باشترە چیدی لەو چاوەیە نەخەوین، من هەست بە ئالۆزی دەکەم.

+بەڵام من هەستدەکەم کەوتوومەتە دوای نهێنیەکی ناسك، ئەگەر حەزیش دەکەیت دەیگۆڕین.

-نا، با بە دڵی تۆ بێت.

چاوە پێشەنگاییەکە، چاوە جادووییەکە بە چاوەی خەوتن مایەوە، خەوتنێکی پڕ لە خەونی وێنەیی، پڕ لە خەونی ژمارەیی و بۆشایی، چەندان شەو خەونم بە دیوارەوە بینیوە، دیواری وێنەیی، وێنەی رەنگاورەنگی درەوشاوە، وێنەکانی ناو خەون روونتر خۆیان نیشاندەدا، خەون خەون، شەو هەبووە خەون لە دوای خەونم بە دیوارەوە دیوە، بەڵام نەدەوێرام خەونەکانم بگێڕمەوە، دەترسام لەوەی رەنگە لێم بترسێ، دەترسام لەوەی رەنگە خەفەتم لێبخوا، دەترسام، لە گێڕانەوەی خەون دەترسام، بە وردی نەمدەزانی لە چی دەترسێم و بۆ دەترسێم، هەر جارێك دەمویست خەونی بۆ بگێڕمەوە، جارێك دەپژمی و هێواشی دەهێنا، من ماوەیەك بوو بە شێوەیەك کەوتبوومە ژێر کاریگەری پژمینەکانی ئەو، ئەزموونم هەبوو، هەر کاتێك هێواشی بهێنایە منیش لەو ئیشەی لە پێشم بوو، لەو قسەی لە زارم بوو هێواشم دەکردەوەو نەمدەکرد..

وێنەکان وەرز وەرز پتر دەدرەوشانەوە، وێنەی ژمارە(١) لە پێش هەموو وێنان کەمێك خۆی نیشانمدا، دیتم، دوو بەژن بە دیارکەوتن، نەمزانی نە بەژنی مرۆڤن نە دوو درەختی لێکدی ئاڵاوی ناو تەمێکی سپی، نەرم نەرم پەنجەم بە بەژنەکاندا دێنا، شەو هات شەو رۆیشت، دەستێکی پیاوانە لە سەر شانێکی ژنانە، دەستێکی ژنانی لە ناو قەدێکی پیاوانە، بەژنەکان بوونە بەژنی ژن و پیاوێك، لە ئامێزی یەکتر بوون، لە وێنەی

ژمارە(١) لێوێکم دیت پێدەچێت نیازی ماچێکی قووڵی هەبێت، شەو شەو وێنەیەك خۆی دەخوێندەوە، وێنە روونتر دەبۆوە، کچەکە وێنە وێنە روونتر دەبۆوە، وێنە وێنە لەگەڵی چووم، لە هیچ کام لە وێنەکان دەموچاوەکان روون نەبوون، تەمێك داپۆشیبوون، لە نێوان وێنەکان هەندێکیان خۆیان نیشانم نەدەدا، شەوێك لێیمپرسی:

+تۆ بە من بڵێ ئەو وێنانە تۆش دەیانبینی، یان هەر خۆ نیشانی من دەدەن!

-لە تۆ جوانتر دەیانبینم.

+دەبێت کێ ئەو وێنانەی نەخشاندبێت!

-خۆزی دەمزانی.

شەوێك لەو شەوانە لەلای راستی دەرگا وێنەیەك خۆی رووتکردەوە، لە هەموو وێنەکان رووتتر، روونتر، درەوەشاوەتر، بەڵام ژمارەکەی نەخوێندرایەوە، دیتمەوە ئەوەی قەت بۆی نەگەڕاوم دیتمەوە، لە وێنەکان بۆ هەمووشتێك گەڕاوم بۆ ئەوە نەبێت، ئەو وێنەیە دەڵێی بە هەڵە لێرە نەخشاوە، دیتمەوە سێ خاڵ کە سێگۆشەیی هەڵکەوتبوون، خۆیان بوون، ئەوەتا لە سەر پشت راکشاوە، لە ناوکیەوە هەتا سەرەوەی چۆکی دیارە،

بەشەکانیتری جەستەی نەخراونەتە جغزی وێنەکەوە، ئەها خاڵێك لە خوار ناوکیەوە، ڕێك لەو جێگەیەی پاوانی بەهەشت، پاوانە تەنکەکە دەستپێدەکات، دوو خاڵەکەیتریش بە دوورایی بستێکی ژنانە لە خاڵی یەکەم یەکیان بە سەر ڕانی چەپەوە ئەویدی بە ڕانی ڕاستەوە، خاڵەکان ڕەش ڕەش دەڵێی مێوژی ڕەشن، سێ مێوژ سێگۆشەیەکی دوو لا یەکسانن، هەون ڕێك سێگۆشەکەن، پێش سێگۆشەی خاڵان، خاڵەکانی دەوری گۆی مەمکانم دیتبۆوە، بینینەوەی ئەو سێگۆشەیە سێ هەفتە دوای شەڕەکەی یانە بوو، ئەو شەڕەی نهێنیی ترسناکی تێدا گوترا، بەر لەوەی نهێنیم بۆ بگێڕێتەوە گوتم:

+ئەوەی من دەیبینم تۆش دەیبینی؟

-نامەوێت بیانبینم.

+ئەو سێگۆشەیە، بڕوانە ئەو سێگۆشە مێوژیە.

-باشترە تەماشاینەکەین.

+با بە دڵی تۆ بێت.

# ٨

# پەری

پێش ماڵنووستنان دوای سووتاندنی پەڕە کاغەزەکانی بن مەنجەڵی گەرماوی ماڵێ، دەستمی گرت و رۆیشتین، خۆزی لە خۆزیداران نەدەرۆیشتین، هێشتا هەر لە سەری کۆڵانێ بووین، لە رۆیشتن پەشیمانبوومەوە، پژمین پەشیمانیکردمەوە، هێواشی هێنا، باوك دەستی کچە تاقانەکەی گرت و ماڵی بە سەر ژن و کوڕەکانیدا بەجێهێشت، نەمدەزانی ئەوشەو ماڵی کێ دەبێتە ماڵمان، یەك دوو جاریش لێیمپرسی، بەڵام خۆی لە وەڵامدانەوە لادا، گەیشتینە سەری ئەو کۆڵانە درێژەی لە گردی دەکردەوە، گردی قالینجاغا، ئەو شەوە زەوی تەڕوتووش بوو، بەڵام ئاسمان روون روون، مانگ نەوی نەوی، کەمێکیتر دابەزیبا روومەتە گەشەکانی لە منارەی چۆلی دەخشا، کزەبایەکی سارد سارد پێدەچوو لە سەفینەوە هەڵیکردبێت، بە گەستن سەری لووتی دەگەزتم، شان بە شانی یەکتر دەڕۆیشتین، ئەو شەوە جانتاکەم تەنها یەك پەڕە

کاغەزی تێدابووە، ئەویش نامە کورتەکەی کوڕی پیاوە مەستەکە بوو، لە بیرم نیە بۆچی تا ئەو کاتەش نەمخوێندبۆوە، قەت نەبوو نامەی بگات و یەکسەر نەخوێنمەوە، ڕەنگە دۆخەکە بە شێوەیەك بووبێت فریای خوێندنەوەی نەکەوتبم، لە بیرمە لە ڕێیێ، خولیای خوێندنەوە کەوتە سەرم، ئەگەر شەرمم لە بابم نەدەکرد، لە کۆڵانێ لە بن گلۆپی سەر دەرگای حەوشەی ماڵێك دەوەستام و دەمخوێندەوە، بە خۆم نەوەستام:

+بابە، دەچینە ماڵی کێ، دوورە؟

-ماڵی برادەرێکم، خۆش برۆ، ئەوە گەیشتینێ.

ئەو شەوە ئەگەر چەند هەناسەیەك زووتر گەیشتباینە ماڵی برادەرەکەی بابم، هیچ ڕووینەدەدا، دەستی چەپم لە ناو گیرفانی ساقۆ تووکنەکەی خۆم و دەستی ڕاستم لە گیرفانی ساقۆ درێژەکەی بابم، جاری یەکەمم نەبوو لە رۆیشتنێ دەست بخەمە گیرفانی بابمەوە، زۆر شەوان شەوانی ساردی پایز و زستان کە دەچووینە سەردانی ماڵە دۆست و خزمان، وام دەکرد، دەزانن چەند خۆشە دەستی تەزیو بە گیرفانی گەرمبکەیتەوە! خودایە، بابمم لێنەستێنی، بابم بپارێزە لە بەلا، خودایە، بابم لە رۆیشتن مەیەخە، با هەتا من هەم ئەو لە من خۆشتر

بڕوا، من بڵێم: بابە، هێواش، هەناسەم سواربوو، پێم لە دووم نایە، دەستم لە گیرفانت بەردەبێ.

+بابە، بۆ هێندە خێرا دەڕۆیت؟ من ناتگەمێ.

-با...

(بـا) ی بـابە بـووە (ئـای ی..) ئـایەکی وا هەرگیـز لە بـابم نەبیستووە، خۆزگە قەت نەمدەبیست، ئای و بەربوونەوە و تەقەیەك هەر سێك پێکەوە، کە بابم لە سەر دەرگای ماڵێکدا بە دەمدا کەوت، دەستی مـن لە گیرفانیـدا بـوو، کە بـابم کەوت جـگە لە مـن و ئەو کەس نە لە سەری کۆڵان و نە لە هیچ جێگەیەك دیار نەبوو، ئەو گوللەیە لە کوێوە هـات؟ بـۆچی هـات؟ بـۆ بە بـابم کەوت و لە خـوێنی هەڵکێشـا، ئەوەتـا خوێن لە شانی بابمەوە دێ و هەردووکمانی سوورکرد، ڕەنـگە لەو دەمە قیژەیەکی تونـدم لێـدابێت، قیـژەیەك گەڕەکێکـی بە کـۆڵان ئێخسـتبێت، ڕەنگە، بەڵام کەسم نەدیت، کەس بە هاوارمەوە نەهات، لە چەند لایەکەوە بـووە تەقوتـۆق، دەمێـك بـوو شـار کـپ بـوو، کەس گـوێی لە تەقوتـۆق نەدەبوو، لە ناو گرموهۆڕدا بابم دەیگوت:

چ نیە کچم چ نیە، مەترسێ، برینەکە سووکە.

خودایە سووك بێت، خودایە هەر هێندەی سەر شکانێکی سووك، هێندەی دەستبڕینێك لە کاتی پیاز وردکردن، هێندەی زمان گەستنێك لە کاتی جوینی پاروو، ئەو گوللەیەش هەر هێندە کاریگەری لە شانی بابم کردبێت، شێتانە کەوتمە کوتانی دەرگاکە، بێئەوەی بزانم ماڵی باشە یان جاشە، دەرگا کرایەوە، ئاهێکم هاتەوە بەر ئەو دەمەی پیاوێك تەماشای رووخساری بابمی کرد و گوتی:

ئەوە تۆی، چیت بەسەر هاتووە؟

ئەو پیاوە برادەری بابمە، هەر ئەو برادەرەی بابم منی هێنا تا لە ماڵەکەی بمشارێتەوە، چەند باش هاتەوە، کچەکەی پزیشکە، بە دەستە فریشتەییەکەی برینی شانی بابمی دەرمان کرد و پێچای، گوتیشی:

پێناچێت، گوللەکە جێی خراپی گرتبێت، مەترسن جێی مەترسی نیە، دەرهێنانی گوللەکەش رەنگە ئاسان بێت.

لە رۆژی سێیەم باوکم تەواو هاتەوە سەرخۆی، من پێشتر ئەو ماڵەم نەدەناسی، لەو شەوەوە ماڵێکم ناسی شایەنی ناسین بوو، شایەنی ئەوە بوون برادەری بابم بن، من لەوێ پێکەوتم برادەرەکەی بابم لە رووی بیروباوەڕی سیاسی نەك هەر لە من لە هی بابیشم جیاوازە، من و بابم و

برادەرەکەی هەر یەکەمـان لە ئاشی سیاسـەتێکمان لێدەکرد، ئەو شـەوانە بابم بە بریـنداری هەر دەتگوت ڕەنگی پرچی منـی گرتـووە، ئەو شـەوانە برادەرەکەی بابیشم دەتگوت لە گەڵای دارپرتەقاڵەکەی حەوشـەی مـاڵی پیاوە مەستەکەوە هاتووە، منیش لەو خوێنەوە هاتبووم کە لە پێش دەرگـا لە شانی بابمەوە ڕژاو من و شەوی سوورکرد، لە مـاڵی برادەرەکەی بـابم خۆی گوتەنی بە منی دەگوت:

کچی خۆم مەترسێ، بۆ کاتی لێقەومان و بە سەردادان جێگەی وەهـا بـۆ خۆشـاردنەوە هەیە مەگەر لە قەنـدیل پەنـای وەهـا دوورەدەسـت دەستبکەوێ.

لەو ماڵە درەنگ نامەی کوڕی پیاوە مەستەکەم بیرکەوتەوە، خوێنی باب چی لە بیرناباتەوە، بە تایبەتیش بابێك لە شەوێکی ترسناك، شـەوێك لە ترسـی گورگەکـان ئەو گورگـانەی بە دوای کـچەکەیەوەن، دەسـتی کچەکەی دەگرێت و کۆڵان کۆڵان تـرس و دڵەڕاوکێ دەبڕێت تـا دەگـاتە پێش دەرگای ماڵێکی دڵنیایی، لەوێ پێراناگا لە دەرگا بدا، گوللەیەك دێ و شـانی دەسـمێ، لەوێ خـوێنی بـاوك شـەو سـووردەکات، لەوێ خوێنی گەرمی باوك بە ناو پەنجەکانی کچەکەیدا دەچۆڕێتەوە، ترسناکە بینینـی خـوێنی بـاوك ترسـناکە، مـن دێـرە شـیعرێکم لەبەر بـوو، نـازانم

شاعیرەکە مەبەستی چی بوو بەڵام من دوای رژانی خوێنی بابم بۆ مەبەستی خۆم زۆرم دەگوتەوە:

خوێنی باب جودایە

لە هی دایك لە هی مرۆڤ لە هی فریشتە ناچێ

خوێنی باب لە رەنگ و گەرمی رێك خوێنی خودایە.

نامەکەم خوێندەوە:

دڵم دەڵێ ترس هەیە، کون بە کون بە دواتەوەیە، تۆ نابێت لە ماڵی خۆتان بیت، حەزیش ناکەم بچیە ماڵی کەس، من جێگەیەکی باش شك دەبەم، ئەگەر ماڵەوەتان رازی بن خۆت و دایکت وەرن، خەمت نەبێت جێگاکە مەترسی نیە، چەندی زووش زەماوەند بکەین باشە.

زەماوەند زەماوەند، چەند خۆشە هەواڵی زەماوەند، زەماوەندی بێ مەرج، کوڕی پیاوە مەستەکە وا دیارە بە تەواوی وازی لە مەرجی لە ئاگر دوورکەوتنەوە هێناوە، ئەگەر وایە هەرچی زووە هەر بابم تەواو چاکبێتەوە، کوڕی نەفتفرۆشەکە سۆراخێکی ببێ و مەترسی نەمێنێ من شوو بە کوڕی پیاوە مەستەکە ئەو کوڕەی وا ساڵانێکە دڵی منی لە ژوورەکەی بە دیار پەنجەرەی دنیاوە داناوە، ئای ئەو کوڕە چی لە من

کردووه، ئەوەی وێنەی من ئەویندار نەبیّ، چ لەوه تێدەگات! کوڕێك چەندی لە ئاگرەکە دوورتر دەکەوێتەوە من پتر خۆشمدەویّ، ئەو ئاگرەی من ناتوانم لێی دووربکەومەوە، ئەو ئاگرەی خەریکە ئەویش لێی نزیکدەبێتەوە، ئەوە نیە ماوەیەکی زۆرە باسی دوورکەوتنەوە ناکات، ئەوە نیە لەو نامەیەی دەیەوێت لێشی نزیکبکەوێتەوە، من دەبێت چەندی زووە شوو بکەم، چیدی بەرگەی ئەو هەموو کوڕە ناگرم، دەڵێی کچ بڕاوە هەموو هەر بە دوای منەوەن، من دەمەویّ بابیشم رزگاربکەم لەو هەموو داخوازیکارە دوور و نزیکە، هەتا ئێستا بابم سیّ جار بە خۆمی گوتووە:

کچەکەم من حەزدەکەم هەمیشە لە پێش چاوم بیت بۆ شەوێکیش لێم دوورنەکەویتەوە، بەڵام ئەوە هەتا سەر نابێت، راستە هێشتا منداڵی لە چاوی من هەر زۆر منداڵی، بەڵام ناکریّ من مانگی کەسێك بەرێکەم و بڵێم کچەکەم جاریّ شوو ناکات، دەی کچی خۆم چ کوڕێکت دەویّ چ لە ئێستا زووتر نیە، ئەوە خوێندنیشت تەواوکرد.

چ کوڕێکم دەویّ، جگە لە کوڕی پیاوە مەستەکە بۆ شوویپێکردن کوڕێکیدی هەیە لەو شارە! ئای کوڕی بن دار پرتەقاڵەکە چۆن منت بە کەزیی خۆم لە دارپرتەقاڵەکەی حەوشەتان بەستۆتەوە، جگە لەویّ، لە ماڵی تۆ ناتوانم بیر لە هیچ جێگەیەکیدی بکەمەوە، کوڕی پیاوە

مەستەکە کوڕی باش بە بە تەواوی واز لە مەرجی ئاگر بێنە هەر دوو ئاگرەکە، تا بە هەمیشەیی بێمە ئامێزتەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە منی سەرمابردەلە هەر لە ئامێزی تۆی لە ئاگر ترساو گەرمدەبمەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە، کوڕی ماچی یەکەم، من جگە لە تۆ ماچم نەداوە بە کەس، کەسم ماچ نەکردووە هەر تۆ و بەس.

دوو هەفتە من و بابم لە ماڵی برادەرەکەی بابمماینەوە، لەو ماوەیە چ هەواڵێك لە کوڕی پیاوە مەستەکە نەبوو، لە خەم و ترسی کوڕی نەفتفرۆشەکە شەو و رۆژم دەکردەوە و لە چاوەڕێی هەواڵێکی خۆش بووم، خودا بە دڵی منی کرد، هەواڵ گەیشت، هەواڵی بەربوونی کوڕی نەفتفرۆشەکە، هەواڵی خۆراگری و هیچ لە سەر ساخنەبوونەوەی کوڕی نەفتفرۆشەکە، هەر ئەو شەوە چووینەوە ماڵێ، کەس بە بریندار بوونی بابمی نەزانی، بەیانیەکەی کوڕی پیاوە مەستەکە گەیشت بە دیتنی شاگەشکە بووم، ئەگەر ئەو دیدارە لە ژوورەکەی ئەو دەبوو، خۆم دەخستە باوەشیەوە و لێی نەدەبوومەوە، چاوەکانی پڕ تامەزرۆیی بوون، لە چاوەکانیدا مێردێکی جوان دەدرەوشایەوە، مێردێکی راستگۆی بێ مەرجی ئاگر، پێش ئەوەی بڕوا خێرا دوو خەتێکم بۆی نووسی، تێیدا گوتبووم سبەی دێم، لە هەستاندا و لە نزیك دەرگای حەوشە کە

باشترین جێگە بوو بۆ نامە گۆڕینەوە، نامەیەکم بە نامەیەك گۆڕیەوە، زوو دەستم بە خوێندنەوەی کرد:

ئەوە دوو هەفتەیە لە سەر ئاو و ئاگر بووم، هەرچەندە پێکەوتم سەلامەتی بەڵام دڵم ئۆقرەی نەدەگرت، ئەگەر دەمزانی لە کوێی لە رێی هەوریشدا با دڵۆپەیەك دیدارم لەگەڵ دەکردی، کە زانیم هاتیەوە باڵم گرت، کەی بێمە داخوازیت؟ وەرە با قسەیەکی لێبکەین.

وەخت بوو باڵ بگرم و بفرم و لە ژوورەکەی بنیشمەوە، کەی سبەینێ دێت، بۆ نەمگوت ئەورۆ دێمە لات، دەڵێم ئێستا بچم، خۆم گرت نەچووم، تا سبەی خۆم گرت.

بەر لەوەی بچمە ماڵی کوڕی پیاوە مەستەکە لەگەڵ قومری سەرمان لە ماڵی نەفتفرۆشەکە دا، کز دانیشتبوو، دیار بوو پیس ئەشکەنجە دراوە، هەموو گیانی هەنجن هەنجن بووە، من خۆم پێنەگیرا باوەشم پێیدا کرد، باوەشی برایانە ئەوە یەکەم جارمە باوەش بە کوڕێکدا (کوڕی پیاوە مەستەکە لەویٚ) بکەم، داوای لێبووردنم لێیکرد ئەگەر تووشبوونەکەی بە هۆی منەوە بووبێت، کوڕی نەفتفرۆشەکە پارچەیەك بوو لە خۆڕاگری، رەنگە لەبەر خۆمەوە گوتبێتم:

خۆزگە کوڕی پیاوە مەستەکەش وەك کوڕی نەفتفرۆشەکە دەبوو.

بۆیە لە رێیێ وەبیرمدێ دەمگوت:

نا، نا،نا کوڕی پیاوە مەستەکە با وەك کەس نەبێت وخۆی بێت، مـن وەك خـۆی خۆشمویسـتووە، تەنهـا واز لە ئاگرەکـان بێنێت، ئەوە وازیشـی هێنا، ئای کوڕی پیاوە مەستەکە دەڵێی جادووت لە من کردووە، جگە لە تۆ...

ئۆی پەنجەرەی دنیا رووناکە، هەناوم رووناکبۆوە، لە کۆلانێ هێواشی هێنا، بەڵام من هێواشم نەکردەوە و رۆیشتم، خەونەکەشم بیرکەوتەوە، بەڵام ئەویشم بە ئیرەیی خەڵك لێکدایەوە، قـومری مـالاوایی لێمکـرد، دڵنیـام ئێستا گـۆرانیی (هـاتەوە) دەڵێتەوە، وەك ئەوەی پـێ بخەیـتە سـەر تـاتی نوێژ ئاوا پێم خستە سـەر کۆسپی دەرگـای حەوشـەکەیان، بە دەسـتنوێژەوە چــوومە ژوورێ، دیـتم، لا شـانێکی پیــاوە مەســتەکەم دیــت، لە نــاو درەختەکانی ئەو سەری حەوشەکەوە دیتم و بزر بوو، هیشتا هەر لە سـەر دەرگای هۆدەی کوڕی پیاوە مەستەکەم، باوەشم پێدا دەکات، بـوار نـادات تەماشای چاوە رەشەکانی بکەم ئەو چاوانەی لە چاوی مـنەوە جوانترین چـاو بـوون و دەمویسـت هەمیشـە لە دیدەنیانـدا بـم، دەمویسـت هەمیشـە

ماچیان بکەم و برژانگە تیژەکانی کە دەتگوت گوڵی رەژگوڵن لە لێوەکانم بچەقن، بواری نەدا، گۆرانیەکە:

خودا هەڵکەی بای شەماڵی

با دەرکەوێت خەت و خاڵی...

وا بزانم دوگمەی کراس لە خۆشیدا هەر بۆ خۆیان دەترازان و سینگ و مەمک رووتبوونەوە، سەرەتا هەر بە پێوە بەرانبەر پەنجەرەی دنیا پشتمی بە دیوار دابوو، پەردەی پەنجەرەکە کەمێك لادرابوو، دار بیە بەرزەکەی حەوشە جوان دیار بوو، دار پرتەقاڵەکەش دیار بوو، ماچ ماچ ئەگەر بڵێم هێندەی گەڵای پرتەقاڵەکە ماچی لە کوڵم و لێو و گەردن و سینە و کردووە بە زێدەرۆیی ئەویندارانەی تێمەگەن، جارێ گۆی مەمکەکانمی .... ، گۆرانیەکە:

ئێمە گیانێکین لە دوو جەستەدا

..........

لەگەڵ مژینی گۆی مەمك هەموو دەمارەکانی لەشم خاو دەبوونەوە و خۆم لە سەر پێیان رانەدەگرت، کەوتمە سەر مافوورە گوڵگوڵیەکە، لەو لاوەش سۆبەکە دەسووتا، ژوورەکە گەرم گەرم، ئای لە

گەرمیی جەستەی پیاو، کەوتە سەرم لەو ماچ و لە من ماچ، مەست بووم، هێندەم زانی من رووت رووتم، تەنها.... رانەکانم توندتر بە یەکەوە نووساند، هەتا ئێستا نە لەو نە لەمن ژوور گوێی لە قسەیەك نەبووە، گۆرانیەکەش دەنگی نەما، نەرم نەرم هاتە قسە، قسەی وا، رووی گێڕانەوەیان نیە، بیرمە گوتی:

ئێوارە دەنێرمە خوازبێنیت، باشە.

جێی سەرە زمانێك لە لەشم نەما بەر زمانی کوڕی پیاوە مەستەکە نەکەوێت و بە توانەوە لە ناوە لێوەکانیدا نەتوێتەوە، تا دەهات شلتر دەبووم، دەتوامەوە، کچێك بە پێی خۆی بچێتە ژوورێك و لەوێ بە رووتی لە بن کوڕێك خۆ ببینێتەوە، کوڕەکەش کێ بێت! کوڕی پیاوە مەستەکە، چۆن ناتوێتەوە، من دەتوامەوە، توامەوە، دەنگی بابم هات، بەڵام ئەو جارە بە کزی، جاری یەکەم بوو لە ساتی راموسانێ دەنگی بابم بە کزی ببیستم، لەگەڵ توانەوەش دەبوو ئاگام لە رانەکانم بێت، ئەو رۆژە هەموو جێگەیەکی لەشم هەموو میوەیەکی لەشم لە سەر مێزێك پێشکێشی کوڕی پیاوە مەستەکە کردبوو، بەڵام دەبوو کچێنیەکەم هەڵگرم، نایدەمێ.

بە شەرمەوە گوتم:

-نەکەی...

+نا، مەترسیّ...

پێنەدەچوو خۆی رابگرێت، نیازی خۆکۆکردنەوە کەوتە سەرم، هەندێك خۆم توند کردەوە، پاڵێکم پێوەی نا، پاڵێکیتر، توندتر، دەتگوت پاڵ بە چیاوە دەنێم، دەمزانی پیاو بەهێزن، بەڵام ئەوهاش نا، زۆر بەهێز بوو نەدەجوولا، بەرزەفتی کردبووم، خۆم توندتر کردەوە، نیشانەکانی جەنگ بە دیارکەوتن، خۆم بۆ جەنگ کۆکردەوە، ئا جەنگ دەستیپێکرد، کوڕی پیاوە مەستەکە جەنگی راگەیاند، ئالۆشی جەنگی راگەیاند، پێدەچوو چوویێتە خولی پاڵەوانبازیەوە، بە دەستێك هەردوو دەستمی بە کەلەپچە کەلەپچە کردبوو، دەمویست دەوم بگاتە جێگەیەکی تا وەهای بگەزم بیبەزێنم، زانی نیازم باش نیە، پارێزی کرد و لە بەشی سەرەوەم نزیك نەدەکەوتەوە، خوارەوەی مەبەست بوو، ئیشی بە سەرەوە نەما، لەو کاتە هەر جێگەیەکی لەشیم بەر ددان بکەوتایە دەبوایە خوێنی لیّ بڕژیّ، بە شێوەیەك خوێنرشتنی خوارەوی منی لە بیربچێتەوە، لە چرکەیەکی دیاریکراو چەند رووداوێك پێکەوە روویاندا، هەستکردن بە نیوە تێڕاچوونێك، هاوارێکی بەرز و زرمەیەکی گەورە لە پەنجەرەکەوە هاتنە ژووریّ، قیژەیەکی بەرزی منیش، ئەگەر زرمە و هاوارەکە نەبا،

قیژەکەی من دەگەیشتە کولان، رەنگە بە گوێی خوشکترین خوشکیش گەیشتبا، دەنگەکان پالەوانەکەیان بەزاند و کێشایەوە، بە پرتاو خۆم کۆکردەوە، ویستم تفێکی لێبکەم، پەشیمانبوومەوە، لە هاتنە دەرێ، پالەوانە براوەکە گوتی:

ئیدی هیچ چارت نیە، دەبێت شووم پێبکەیت بەو مەرجەی لە هەردوو ئاگرەکەش دوور بکەویتەوە.

لە تووڕەییدا رەنگە لێوی خۆم کرۆشتبێت، گوتم:

لە تۆ دووردەکەومەوە، بەلام لە ئاگرەکان نا.

گوتی:

ژنە جوانەکە ناچاریت.

لە تووڕەیی نەمتوانی هیچ بلێم، لە هەلاتنێ، ئا من هەلاتم، هەلاتنێك رەنگە گەڕانەوەی نەبێت، دیتم، پیاوە مەستەکە لە لە بن دار بیەکە لە سەر پشت راکشاوە هاوار هاواریەتی، خوێن بە دموچاویەوە بوو، ئاورم لێیان نەدایەوە، لە بەر خۆمەوە گوتم:

بە نەفرەت بن بە خۆ و بە کورەوە، بۆچی چەند چرکەیەك زووتر هاوارت لێ بەرزنەبۆوە، زرمەت لێوە نەهات!

چ رۆژێك بوو ئەو رۆژە! ناگێڕدرێتەوە، من چیم نیە بیڵێم، ئەگەر ژنە کەسکپۆشەکەی سەر کۆسپی دەرگای سەری کۆڵان قسەیەکی هەبێ.

# ٩

# ژنە کەسکپۆشەکە

دەمبیستەوە، زۆرم دەبیستەوە کە لە گەڕەك بە ژنە چوارمێردکەرە ناوم ڕۆیشتووە، چوار مێرد! بە هەر چوار مێردەکەش هێندەی نیو مێردی ژنی ئەو گەڕەکە تەمەنیان نەکرد، یەکەمیان نازانم چ خواگیرێك لە بن گوێی خوێند و دەستی گرت و بردی، خۆی لە دەوری کۆماردا گێڕا، کەچی کۆمارەکەش ساڵێ نەژیا، دووەمیشیان حەرەس قەومی ڕاوی ناو لە سەری سەفینێ گۆتیان گوللەیەکی گرتەوە، نازانم گۆڕەکەیشی کەوتۆتە کوێ، سێیەمیان بە ردێنی سپیەوە جلکی سەربازییان لەبەر کرد و کردیانە بەلاگێڕی قادسیە، ئەویش تەرمەکەی نەهاتەوە، چوارەمیشیان لە هەلاتنەکە لە بەر دەمی خۆم ساچمەیەکی گەرمی گرتەوە و ساردبۆوە، لە تەرمی چوار مێردان تەرمی یەکیانم دیتەوە.

میراتی چوار مێردانیش، کاکل چوار مریشك و کەڵەشێرێکی لە پاش بەجێما، خورشید بزنێکی یەك گوان، لە بەهرامیش ئەو کوڕە شێتەی هەموو شار دەیناسی و بە ماڵ نەدەکەوتەوە، ئەو کوڕەی لە ساڵی گرانیەکە، لە شەڕی دوو بەرازەکە تێدا چوو، لە نزیك مزگەوتی حاجی لەقلەقەکان بە گوللەیەك ساردیان کردەوە، ئەوانە شێتیان کوشت شێت! چەتۆش ئەو خانووە، ئەو خانووەی چەند کۆلانێکی لێوە دیارە، کەرەتێ گۆتمە پەری:

+ئەها ئەو پیاوەی کۆلانی پشتەوە چوار ژنی هەیە و هەمووشیانی لە یەك ژوور کردووە، کەچی کەسیش بە پیاوە چوار ژنەکە بانگی ناکات، کەچی من لە کاتی جیا جیا چوار مێردم هەبووە، هەموو گەڕەك بە ژنە چوار مێردکەرە ناوم دێنن.

-من هەوڵدەدەم چوار مێردەکەت لێبکەمەوە.

+بە تۆ لێمنابنەوە.

-دوازدە مێرد لە سەلما بوونەوە، چوار مێرد لە تۆ نابنەوە.

وابوو سەلما کاتێ لە لای مێردی نۆیەمی بوو، ماڵیان نزیك مەزاری عەلیی پێنجەم بوو، ئەو ژنە کە هەر دەتگوت لە مانگەوە

هاتووە، مەگەر پەری هێندەی وی جوان بێ، بە مردن و جودابوونەوە سەری دوازدە مێردی خوارد، بە حەسرەتی مێردی سێزدەمەوە سەری نایەوە، سەردەمانێک بە ژنی مێردژمێر ناوی لە شار رۆیشتبوو، هەر لە بارەی ژنی مێردژمێرەوە، قسەیەکی خۆش کەوتبووە سەر زاری منداڵانەوە، پەریش بە منداڵی بە دەنگە ناسکەکەی دەیگوتەوە:

دوازدە مانگ بۆ ساڵ بێ و

دوازدە قلیش بۆ یەك دەستە

شار چەند گەڕەکی هەبوو

سەلماش نیو هێندە مێردە

لە سەردەمی مێردی دوازدەهەمیشیەوە قسەیەکی خۆش کەوتبووە سەر زاران، مێردەکەی داوایلێکردبوو کە دەعباکەی بۆ بشێلێ، دیارە سەلما باشی بۆ نەشێلاوە، مێردی دوازدە دەڵێ:

کچێ شێلان کوو ئەوهایە!

سەلما دەڵێ:

ئەدی کووە؟ دە فێرمبکە

مێردی دوازده دەڵێ:

تازە! بە یازدە مێرد فێرنەبوویت بە من فێر دەبیت؟

سەلما دەڵێ:

ئەوان هیچیان پێویستیان بە دەعبا شێلان نەبووە.

بەڵام لە پڕدا سەلمای دوازدە مێرد بووە سەلما خان، هەتا نەتگوتبا سەلما خان کەس نەیدەناسیەوە، کەسیش نەیزانی هۆی لێبوونەوەی دوازدە مێرد لە سەلما خان چی بوو، بەڵام تا ئیستاش ئەگەر بە کچێك یان بە ژنێك بڵێی دەڵێی (دادە سەلما)ی توورە دەبێت، ئەگەر بە تۆش بڵێم دادە سەلما واتە تۆ دوازدە مێردت لە پێشە، چیرۆکی منیش نزیکە لە هی سەلما، لەو دەمەوەی بە ژنە کەسکپۆشەکە کەوتمە زاری پەری و لە کۆڵانێ گوتیەوە هەر گوتیەوە:

ژنە کەسکپۆشەکە ژنە کەسکپۆشەکە.

ئیدی کەم کەمە چوارمێردەکەم لە کۆڵ بۆوە.

ئێستا من ژنە کەسکپۆشەکەم، پەری ئای پەری، شیرنترین کچی گەڕەکێ، لە دنیایێ کچ نیە بگاتە پەری، ئەگەر بە دیتن بێ کەس

هێندەی من پەری نەدیتیە، بە منداڵی هەر لە کنە خۆم بووە، دواتریش هەر جارەکی سەری هێنابێتە دەرێ، پێی خستبیتە ژوورێ بە بەر چاوی منەوە بووە، رۆژ نیە ئەگەر بە وشەیەکیش بێ نەمدواندبێت، هەرچی قسەیەك لە بارەی پەریەوە لە زاران گەڕابێت، لەو سەری شاریشەوە سەریکردبێت بە من گەیشتیە، هەر کەسێك بیەوێ پەری بناسێت، دەبێت بە ساڵ لە کنە من دانیشێ، حەیف پیری بیری بردم، وەرنا منداڵی و جاحێلیی پەری هەمووی بە شەو و رۆژیەوە وەك حەکایەت لە بەرمەو دەگێڕمەوە، پەری کچی دایکی نیە، هی منە، بە هەڵە نەبۆتە کچی من، دەبوو کچی من بێت، من زۆر پتر لە دایکی دایکایەتیم بۆی کردووە، دایکی هێندەی من جلکی نەگۆڕیوە، سەری نەشووشتووە، نەیدەزانی سەری بشوا لە کەفی سابووندا چاوی کوێر دەکرد، ئێستاش فێری سەر شووشتنی منداڵ نەبووە، هەر ئەو نا ژنانی ئەو گەڕەکە کەمیان نەبێ کەسیان نازانن سەری منداڵ بشۆن، دەبێت خولی فێرکردنی سەر شووشتنیان بۆ بکرێتەوە، پەری گەیشتبووە دە دوازدە ساڵانیش هەر من سەریم دەشووشت، لەگەڵ خۆم دەمبردە گەرماوێ، ئەمن دەزانم چەند خاڵ بە لەشیەوە، هەر خاڵەی کەوتۆتە کێندەرێ، بەو دەستانەی خۆم هەزار جاریش پتر ورد ورد پرچە نەرمەکەی پەریم شانەکردووە، دەبێت پرچ هەبێت لە پرچی پەری خاوتر نەرمتر جوانتر!

دەبێت کچێك هەبێت لە پەری جوانتر و ژیرتر! پەری بە منداڵی کچی من بوو، ئێستاش هەر کچی منە، من لە دنیایێ کوڕێك و کچێکم هەیە، کوڕەکەم هەر لەگەڵ بە سەرپێکەوتن خودای گەورە لێی تووڕە بوو، چۆن دەبێت خودا لە منداڵ تووڕە بێت! خوایە تۆبە، خودا یەك چۆرە هۆشی نەدایێ، نەگەیشتە حەفت ساڵان بە کۆڵانان کەوت، هەتا ئەو شەوەی لە خوێنیان گەوزاند، لەو کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان بە ماڵ نەکەوتەوە و نەکەوتەوە، بەڵام کچەکەم لە دەوری کچەکەم گەڕێم، هۆشی گەرەکێك لە سەری ویە، جوانی شارێك لە رووخساری ویدایە، کچەکەم پەریە، با دایکی پەری هەر بڵێ پەری کچی منە، سوێندی بۆ دەخۆم هی ئەو نیە و کچی منە، پەری کچی منە کچە خاڵ لە گەردنەکە کچی منە، کچە دەم بە پێکەنینەکە کچی منە، ئۆی دە بەر پێکەنینەکەی بمرم، توخوا پێکەنین هەیە لە دنیایێ لە هەموو دنیایێ ناسك وەك پێکەنینی پەری، کەس پێکەنینی وای بیستووە، ئەوەی بڵێ بەڵی، درۆ دەکات، ئیرەیی بە پەری دەبات، بڕۆن لە پەری بپرسن:

دایکت ناوی چیە؟

ئەگەر نەیگوت ناوی ژنە کەسکپۆشەکەیە من پرچی خۆم دەبڕم، دایکی چ لە پەری دەزانێت، کەنگی ئاگای لێبووە، دایکی پەری

کەنگی فێرە شتێکی کردووە، کەنگی لە ساتەکانی دڵتەنگیدا دەستی بە سەریدا هێناوە، دایکی پەری چی بۆ پەری کردووە؟ لە کاتی ساواییش هێندە مەمکەی نەداوەتێ، هەر لای من بووە و شیری قۆدیم داوەتێ، چی بۆ کردووە، نۆ مانگ لە زگی خۆی هەڵیگرتووە، ئەوە منەتی تێدا نیە، ماین بە ماینایەتی خۆی، نازانم ماینە یان ئەویدی، نۆ مانگ جوانووەکەی لە زگی خۆی هەڵدەگرێ و هیچ منەتیشی لە سەر ناکات، ئای من داخم لە دایکی پەریە، خۆشمنەویستووە و خۆشمناوێ، ئەو کەسەی وەختی خۆی گۆتیتی:(( دایکە ببینە و دۆتە بخوازە)) ئەگەر پێشەوەی ناماقوولی وا بکات، پەری و دایکی پەریی ناسیبا، قەت گووی ئەوهای نەدەخوارد، خۆ ئەو رۆژەی لە مووسڵێ لە دیتنی دوا جاری برایەکەم هاتمەوە، هەر ئەو جارەم دیت و تەواو بردیان لە سێدارەیان دا، خوشکت بمرێت، هیچ تێکنەچووبوو، فشەی بە مردن دەهات، کە هاتمەوە و ژنی گەڕەك رژانە ماڵەکەم، لەو کاتە پەری منداڵە جوانەکەم هاتە باوەشم بۆی گێڕامەوە کە دایکی و ژنە سەگسارەکەی کۆڵانەکەی ئەو دیو پێکەوە دەرپێیان لە پێی پەری داکەندووە و بە زیڕ وهۆڕ خستوویانەتە ناو تەشتە ئاوێکەوە و ژنە سەگسارەکە مووسێکی بە ناو رانی پەریدا هێناوە و پارچە گۆشتێکیان لێکردۆتەوە، بە بیستنی ئەو هەواڵە براکەمم لە بیرچۆوە، ماوەی ساڵێك

قسەم لەگەڵ دایکی پەری نەکرد و نەمهێشت پێ بنێتە سەر دەرگا، من زانیم لێکردنەوەی ئەو پارچە گۆشتە چ ترسناکە، بە سەر خۆم هاتووە، ست نارینیش وەختی خۆی پێیگوتم:

کچێ ئەگەر کچت بوو نەکەیت بیبڕی، بە دەردی خۆتی نەبەیت.

کەچی دوور لە چاوی من پەریی کچمیان بە دەردی من برد، پێشتر دایکی پەریم لەوە ئاگادار کردبۆوە، دەست لە ناو رانی پەریی من نەدەیت، لە ژنە سەگسارەکەی کۆڵانی ئەوسەر نزیکنەبیەوە، ئەو ژنەی مووسی بە ناو گەڵی نیوەی کچی گەڕەکدا هێناوە، من دیدڤانم بە سەر ورد و درشتی ژیانی پەریەوە، پەریە بەژن زراڤەکەم، کەس وەك من پەریی خۆشنەویستووە، قسەم لە خۆشەویستیی بابی نیە، چ بابەك نیە لەو دنیایە وەك بابی پەری کچی خۆی خۆشبوێ، پەری تاقانەی بابی بوو، تاقانەی منیش، بەڵام هیچی دایکی نەبوو، من دەزانم پەری چ رۆژێك ترس راوی ناوە، خەفەت دایگرتووە، ئای پەری ئەو رۆژەی بۆ یەکەم جار لە ناو رانەکانی خوێنی دیت، چۆن زراوی چووبوو، رەنگی ببووە پەلکە پیاز، بە قورگی پر هەنسکەوە هاتە لام، رێك لێرە لەو سەر دەرگایە، شەرمی دەکرد باسی خوێنەکەی بکات، دەستیم گرت و بردمە ژوورەوە بە ئاماژە تێمیگەیاند، لە باوەشم کرد و بە بەر ماچم داو بۆی

پێکەنیم پێکەنینی سەلامەتی، تێمگەیاند، بەو دەستانەی خۆم پارچە پەڕۆکێکم بۆی بڕی و دامە دەستی، کە لە سەر(( برینەکە!))ی دانێ، پەریم کەمجار بە خەفەتباری دیتووە، هەر بە قەد ژمارەی پەنجەی دەستێك، بۆیە هەر چوار پێنج جارە خەفەتباریەکەی پەریم لە بیرماوە.

ئای ئەو جارەی لە زیندان هاتەوە، رەنگی بە بەرەوە نەمابوو، ئەو سێ شەوەی پەری لە زیندان بوو، گەڕەك نەنووست، رەنگە شاریش نەنووستبێ، پەری چۆن دەبێت لە زیندان بێت، گۆڕبەگۆڕ بچی حکومەت، چۆن توانیت سێ شەو پەری ئاسمانێ بخەیتە زیندانەوە! ئۆی دەستتان بشکێ، چۆن دەستتان بەرزبۆوە لە پەریی ئاسمانێ بدەن، ئای چیان لە پەری ئاسمانێ کردبوو، هەموو گیانی جێی قامچی بوو، توخوا ئەو لەشولارە ناسکەی پەری هی ئەوەیە قامچی لێی نزیکبێتەوە، ئۆی هەموو بەرەبەیانیی جێژنانێك بە هەڵواسراوی بتبینمەوە سەدام، تا با چیدی هەڵینەواسنەوە، ئەگەر لە رۆژی چوارەم لێبووردنی گشتی دەرنەکردایە، پەریەکەم لە دەستچووبوو، ئێستا لە بەهەشتێ بوو، پەری هەر دەبوو بگیرێ، گەلەك سیاسی بوو زۆر جار دەمگۆتێ:

تۆ هەر دەڵێی مێردی یەکەممی، ئەو مێردەی چوو چوو، لە مەهابادێ خۆی بە کوشت دا، ئەویش سەری زمان و بنی زمانی سیاسەت، دەتگوت لە قوز و کیری سیاسەت بووە.

پەریش ئەوها بوو، ئەو دەمەونیوەڕۆیەی پەری لە زیندان هاتەوە من هەر لە سەر ئەو دەرگایە و لە سەر ئەو کۆسپە و بەو جلکانەوە دانیشتبووم، من هەمیشە ئێرە جێی دانیشتنمە، بەڵام ئەو سێ ڕۆژە لە چاوەڕێی پەری لێرە دانیشتبووم، کە گەیشت بە قورگی پڕ هەنسکەوە باوەشی پێمدا کرد، ڕێك وەك ئەو جارەی کە هات و هونەری مانگانەی پەرۆم فێرکرد، بەڵام ئەوجارە نەهاتە ژوورێ، بە ئەسپایی پێمگوت:

گوێ مەدە دامەنت، کانیی کوێستانێ بە دەوی سەگی بیابانێ پیس نابێت.

پەری بزەیەکی شیرینی کرد و گوتی:

نا، نەگەیشتنە ئەوێ.

سەرم لە وەڵامی پەری سووڕما، هەر کەسێکیدی با باوەڕم پێینەدەکرد، بەڵام پەری هی درۆ نەبوو، هەرکێ بڵێ درۆم لە پەری دیتووە، درۆدەکات، بەڵام سەیریش بوو، من بیستبووم، هەموو خەڵکیش

دەزانـن، هەر کچێـك هەر ژنێـك ئەگەر بـۆ یەك جغـارەخۆریش بکەوێـتە زینـدانیێ، بێبنـی دەکەن، ژن و کـچ لە دەسـتی ئەوانە رزگاریـان دەبـێ؟ ئەوجا کچێکی وەك پەریش، کوڕی شار بۆی شێت دەبوون.

جارێکیتر وا بزانم هەر ئەو ساڵەی سێ شـەوی لە زینـدان کـردەوە، پەریـم بە خەفەتبـاری دیـوە، تـا هەر ئەو سـاڵە بـوو هێشـتا زینـدانی نەدیتبـوو، هێشـتا چ قـامچی بە لەشـولاری نەکەوتبـوو، رۆژێـك هەڵەم نەکردبێ هەر دەمەونیـوەڕۆ بـوو، پێدەچێت هەمـوو ساتە خەفەتاویەکانی پەری بکەونە دەمەدەمی نیوەڕۆیێ، هەر لێرە و لە سەر ئەو کۆسپە پەریم بە خەفتباری دیت، وەی وەی خۆزی مردبام، پەریم بەو رەنـگ پەڕیـویە نەدیتبا، ئەو جاریش هەر دەتگوت جاری یەکەمیەتی خوێنی نـاو گەڵـی خۆی ببینێ، ئەو جاریش هەر دەتگـوت سێ شـەو لە زینـدانی سـەگ و گورگـان بـووە، ئەو جـاریش لە باوەشـم کـرد و بە قەد کۆڵانێـك مـاچم لە کولمەکانی کرد، کەس هێندەی من پەریی ماچ نەکردووە، وەك من چـوار مێـردیش بکـات، نـاڵێم وەك سـەلما، بە هەمـوو مێردەکـانی هێنـدەی مـن مـاچی نـاکەن، لێـی بپرسـن لە پەری بپرسـن کەس هەیە هێنـدەی ژنە کەسکپۆشەکە تۆی ماچ کردبێت؟ ژنانی کۆڵان زۆر جار دەیانگوت:

دە، هێندەی ماچ مەکە، دوایی چ تامی تێدا نامێنێ، بە گوێی خۆم گوێم لە کوڕی کۆڵانێ بووە، دەنگیان بەرزنەدەکردەوە نەوەك تێبگەم و گوویان دەرخوارد بدەم:

خۆزگە، هەزار خۆزگەم بە ژنە کەسکپۆشەکە، خەنی بووە بە ماچی پەری، توخوا دە لە باتی من ماچێکی لێوی، خاڵەکەی گەردنی بکە.

ئەو جارە زۆر هەوڵم لەگەڵ پەری دا، بەڵام نەگەیشتمە هیچ، بە نهێنیی هێشتەوە، من گومانم بۆ ئەوە چووە کە کچێنییەکەی لە دەستدابێت، بەڵام گومانم خستە گومانەکەی خۆمەوە، پەری لەو کچانە نەبوو، ئەوەی لێبوەشێتەوە، من زوو دەمزانی پەری ئەویندارە، چاوی سەررێژ لە ئەوین بوو، کوڕە ئەویندارەکەشم دیتبوو، ئەو کوڕەی دڵی ئەو پەریە نازدارەی بردبوو، بەڵام پەری ئەو کچە نیە تا نەگاتە شەوی...، نا پەری ئەوە نیە، من لەو رۆژەدا هیچ لە پەری تێنەگەیشتم، هیچی نەگوت، چاوەکانیشی هەڵنەدەهێنا تا رووداو بخوێنمەوە، من زۆر جار وەك ئەوەی رۆژنامەیەك بخوێنیتەوە ئەوها لە ناو چاوە گەشەکانی پەری هەواڵی وردم خوێندۆتەوە، ئەو رۆژە بە شەوەکەیشیەوە پەری لای من مایەوە، پەری بە گەورەیی قەت شەو لای من نەماوەتەوە، هەتا درەنگانی شەو لام بووە، بەڵام بۆ نووستن چۆتەوە ماڵ، ئەو شەوە

بابیشی بە دوایدا هات هەر نەچۆوە، پەری قسەی بابی نەدەشکاند، ئەو شەوە شکاندی و لای من مایەوە، هەتا سبەینێش هەر وڕێنەی کردووە.

پەری لە خۆپیشاندانەکانی ئەو ساڵەی بەهرامی مێردمیان بردە قادسیە و نەهاتەوە، تاقە کچی کۆڵانێ بوو بەشداریی دەکرد و نەدەترسا، من بە چاوی خۆم دیتم کوچکە بەردی رادەوەشاندە چەکدارەکان، بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، دەنگی پەریم لە ناو هەموو دەنگان دەناسیەوە:

برووخێ داگیرکەر، پایەدار بێ ئازادی.

ئەدی هەر پەری نەبوو بۆ یەکەم جار قوتابخانەی کچانی هێنایە دەنگ و شار هەموو شار وەك بوومەلەرزەی لێدابێت ئەوها لەرزی، لەرزینێك گەڕەك بە دزیەوە دەیانگوت:

خودایە هەموو رۆژێك ئەوها بلەرزێت.

ئەدی لە یەکەم ساڵسووڕانەوە بە سەر هەڵەبجە، پەری نەبوو! پێش نیوەڕۆ وردودرشتی کۆڵانی هێنایە کۆڵانێ و بۆ ماوەی جگەرەکێشانێ قڕوقەپ دەست لە سەر سینگ، بێ هەناسە راوەستان، جاشەکەی سەری کۆڵانێ دەستڕێژێکی بە سەر کۆڵاندا هاویشت، بەڵام کەس

خـۆی تێکـنەدا، بەڵـێ پەری یەکەم کەس بـوو دابـی راوەسـتان بـۆ هەڵەبجەی داهێنا، پەری بەکار بوو، زۆر کەس دەیانگوت:

پەری دەڵێی نێرە کوڕە، خودا بە هەڵە بە کچی درووستکردووە.

بەڵام رقم لەو قسەیە هەڵدەستا، گوتـوومە زۆر جار گوتـوومەتەوە و دەیلێمەوە: کچ دەبێت وەك پەری بێت، کچ ئەگەر بیەوێت کچ بێت دەبێت وەك پەری بێت، خۆزی مـن وەك پەری دەبـووم، ئەدی هەر پەری نەبـوو لە رۆژی رابـوونی شـار کـوچکە بەردی دەدایە دەسـتی ورد و درشـتی گەڕەك هەموویانی بە دووی خۆی داو رژانە شەقامەکان، پەری لە پێش هەمـووانەوە دەڕۆیشـت و(بڕووخـێ دیکتـاتۆر)ی دەگـوتەوە، مـن بەو تەمەنەوە بە دوویەوە بـووم، ئەدی ئەو کـاتەی تفەنـگەکەی لە بـن ساقۆیەکەی دەرهێنـا، تـا ئەودەمە جـگە لە مـن کەس نەیـدەزانی پەری چەکـدارە، ئەدی ئەو کـاتەی گـوللەکە بە دەسـتی پەری کەوت مـن لە تەکـی نەبـووم، بەو دەسـتانەی خـۆم دەسـتیم نەبەسـت و لە خەسـتەخانەی کۆماری بە سەر سەریەوە نەبووم، کا، ئەودەم دایکی لە کوێ بوو؟ ئەدی لە نـان خڕکـردنەوە وەکـی بـۆ هێرشـبەرانی سـەر بابەگوڕگوڕیـان دەنـارد، پەری نەبـوو سـەرنان سـەرنان، بەرانپیـل بەرانپیـل، تلیـانە تلیـانە، نـانی خڕدەکـردەوە و عارەبانەی تەرەکتـۆری پڕ لە نـانی گەڕەك کرد و هەر بە

خۆشی دەیهاژوت و بردی، ئەدی پێشتر زۆر پێشتر هەر پەری نەبوو، نەوەی لە دەستی کەس نەدەهات ئەو کردی بۆ ئاوارەکانی بادینان و بابان بۆ....، ئەدی پێشتر و دواتریش لە نەورۆزان پەریتان دیتبا، پەری نەبا ژنانی کۆلان فێری گوتنەوەی سروودی نەورۆز دەبوون؟ پەری ژنانی گەڕەکی بە شێوەیەك فێری گوتنەوی نەورۆز کرد لە حەسەن زیرەك جوانتری بلێنەوە، پەری نەبا ژنانی ئێرە لە ئێوارەی نەورۆزێ بە دەوری ئاگردا دەسووڕانەوە، ئەو ئاگرەی ئەها لەو سەرە کۆلانە بە دەنکە شخاتەی دەستی پەری بلێسەی دەسەند و دەچووە ئاسمانێ، پەری حەفتەیەك پێشتر دارودڕی دنیای خڕدەکردەوە، پەری زوو وازی لە تایە سووتان هێنا، دەیگوت:

خۆتان بسووتێنن بەلأم تایە نا، تایە نەخۆشیی دنیای پێوەیە.

من مردنم لەبیربچێتەوە ئەو نەورۆزەم لەبیرناچێتەوە، ئەو نەورۆزەی پەری نازانم بە هۆی چیەوە بوو هیچی دەستنەکەوت ئاگری بەرداتێ و نەورۆزی پێبکات، گەڕا، کۆلان کۆلان گەڕا، جاڕی دا:

قوتابیان بۆ ئەوەی نەورۆز بێ ئاگر نەبێت، هەر یەکەو کتێبی بیرکاریی خۆی لەگەڵ خۆی بێنێ و بێتە سەری کۆلانی ئێمە.

لە ماوەی چەند جگەرەکێشانێك لەو سەری کۆڵانە خانووێك کتێب قیتبۆوە، پەری بیرکاری ئاگر دا، وێنەی سەدام کە بە کتێبەکانەوە بوو، چەند جوان دەسووتا، یەك بە هەوکی کۆڵان:

ئەم رۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە

جێژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتەوە

زۆری نەبرد جاش ئەمن گەیشتن :

ئەوە وێنەی سەرۆکی فەرماندە دەسووتێنن!

خەڵك پەرتەی کرد، چەندی پرسیان :

نەخشەی کتێب و سەرۆك سووتان کێ کێشاویەتی؟

کەس ورتەی لێوە نەهات، ئەو دەم گەڕەک چەند یەکگرتوو بوون، چەند پەریان خۆشدەویست، ئەدی لە هەڵاتنیێ ئەو دەمەی هەموو شار خۆیان لۆ هەڵاتن کۆدەکردەوە، پەریەکەی من تفەنگی دەست دایێ و بە گەڕەکی گۆت:

هەڵاتن زووە، وەرن بچین بەرسینگی دەبابە بگرین.

بە چ حاڵ پەریان سارد کردەوە، بابی ساردی کردەوە دەنا دەچوو خۆی بە کوشت دەدا و بەگەڵ هەڵاتنێ نەدەکەوت.

من ئەو چوار پێنج جارە نەبێت پەریم وا بە خەفەتباری نەدیوە، ئەو جارەشم لە بیرناچی، شەوێك هاتە لام، هەر لە دەرگاوە فرمێسکی هەڵوەراند، گریا، گریا، هەرگریا، سەریم بە سینگی خۆمەوە نابوو، دەستم بە قژە خاوەکەیدا دێنا، دڵۆپە فرمێسکە گەشەکانیم دەسڕیەوە، چەندی دەمگوت:

+چیتە؟ کچی خۆم چیتە، ناگرم گرت.

هەر هێندەی دەگوت:

-گوێت لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا نیە، ئەوە ئەوە.

گوێم لە هیچ نەبوو، رەنگە دەنگەکە دوور بووبێت، من ئەو دەمیش وەك ئێستا گوێم کەمێك گران بوو، جارێکیدیش کە دڵتەنگیەکەی ناگێڕدرێتەوە، نامەوێ کەس لە منی ببیستێ، لە قیامەتیش بۆ کەس نایگێڕمەوە، خودا لە سەر ئەوە بمخاتە دۆزەخەوە بۆی ناگێڕمەوە.

با بەس بێت، نزام بۆ بکەن لە پێ نەکەوم و خودا لە چوار شەمووانی سوڵتان مزەفەر بێ بەریم نەکات، ئای کوڕە تۆراوەکەم.

# ١٠

# پەری

ئەو شــەوەی قســەی بــابم یــان دڵــی بــابمم شــکاند و لای ژنە کەسکپۆشەکە مـامەوە، ئەو ژنەی دەبـوو دایکـی راسـتینەی مـن بێـت، چەند خۆزگەم خواستووە کە دایکم با، ئەو شـەوە لە شـەوە ترسـناکەکانی منە، بریـا بە قسەی خەونەکەی خۆمم دەکرد، شـەوی پێشـتر لە خەونـدا دەنگێك گوتی:

هایيت لە پرتەقاڵەکە بێت، ترسناکە، لێی نزیك مەکەوە.

نەدەبـوو لە قســەی خەونەکە دەربچــم، نەدەبـوو پـژمینەکە بە هەنـد وەرنەگرم، ئەو شەوە من لە شەڕدا بووم، شەڕ لەگەڵ خۆم، ئـای کـوڕی پیـاوە مەسـتەکە چیـت لە مـن کـرد، مـن لە ئـاگر دووردەخەیـتەوە، بەو رێـگەیەش هەڵەت کـرد تـۆ هەڵەت کـرد، نـا مـن هەڵە بـووم، ئەگەر ئامۆژگاریەکـانی ژنە کەسکپۆشـەکەم وەك گـوارەکەم لە گـوێ بـان، وام

لێدەهات! نا، کوری پیاوە مەستەکە بەو شێوەیە مەرجی خۆی ڕانەدەگەیاند، ئای گۆی مەمك، چیت بە من کرد، حەیف و مەخابن، ژنە کەسکپۆشەکە لە قسەی تۆ دەرچووم، چەند جوان بەلاّی گۆی مەمکت بە خۆڕایی بۆمان، بۆ کچانی تازە پێگەیشتووی کۆڵان و بێ شەرم بە گۆڕێ وەردەکرد، کچانی لە دەوری خۆی دادەنیشاند و بە ئەسپایی هەر ئەوەتە گوێمان لێدەبوو:

کچینە ئاگاتان لە گۆی مەمکتان بێ، ئەو بەلاّیانەی بە سەر کچاندا دێت هەمووی لە گۆی مەمکەوەیە، گۆی مەمك بەلاّیە بەلاّ، هیچ جێگەیەکی لەش وەك گۆی مەمك بەلاّ نیە، نەهێڵن لە لێوی کوڕان نزیك ببنەوە، گۆی مەمك ڕێك وەك کلۆ شەکر وایە لە ناو لێو دەتوێتەوە، کە تواییەوە بەرگە نامێنێ، دامەن ناو دەکات و هێزی پووشکەیەکی نامێنێ، کە گۆی مەمك کەوتە ناو لێوەوە دامەن شل دەبێ و کوڕ بە ئارەزووی خۆی لە ناو ڕاندا گەمان دەکات و هەر ئاگاشت لێنیە......، بۆ چرکەیەکیش نەهێڵی گۆی مەمکت بکەوێتە زاری هیچ پیاوێکەوە، ئاگادار بن بە چەند قسەیەکی خۆش ....

گۆی مەمك بەلاّی بە سەر مندا هێنا، گۆی مەمك نەبا، کوڕی پیاوە مەستەکە وا ئاشکرا مەرجی دوورکەوتنەوەی لە ئاگر ڕانەدەگەیاند،

ژنە کەسکپۆشەکە من دەبێت چی بکەم، ئەو شەو لە ناو بەڵای گۆی مەمکدا لەگەڵ خۆم و دنیادا دەجەنگم، بە هانام وەرە ژنی کەسکپۆش، ئەو شەوە چەند جارێ ویستم بەڵای گۆی مەك بۆ ژنە کەسکپۆشەکە بگێڕمەوە، دەهاتە سەر زارم پەشیماندەبوومەوە، نەمگوت، بە خۆم دەگوت، هیچ چارەیەکی بۆ من پێنیە، ئەو تەنها لە خۆپارێزی لە بەڵا دەزانێ، کە بەڵا هات چارەی لە کوێ بوو، چەند هەفتەیەك چ پێنەدەچوو لە سەر دنیا بم، رۆژێك کوڕی پیاوە مەستەکە هات، رووم نەدایێ، لە هەلێکدا نامەیەکی بۆم هەڵدا، بە نا بەدڵی گرتمەوە و کردمەوە بەڵام بە تامەزرۆوە خوێندمەوە:

پەریەکەم، کەی بێمە داخوازیت، بە قەد دنیایەك خۆشمدەوێیت، بۆ ئەوەی بژیین و نەسووتێین لە هەردوو ئاگرەکە دوورکەوە و تەواو، زوو وەڵامم بدەوە، هەی پەریی ئاسمانێ.

وەڵامیم نەدایەوە، من ناتوانم لە ئاگرەکان دووربکەومەوە، هێندە گوێ بە کچێنیەکەم نادەم، کە بە درووستی نازانم کوڕی پیاوە مەستەکە بردی یان هەر لە جێگەی خۆی ماوە، من شارەزاییەکی ئەوتۆم لێی نیە، نازانم بەو سانایییە دەڕوا یان نا، ئاخر تێڕاچوونەکە چ نەبوو، هێندە نەچوو، چ خوێنیشم نەدیت، ئەگەر لە دەستیشمدابێ گرنگ نیە، لای

من کوڕی پیاوە مەستەکە گرنگە، ئاگرەکانیش گرنگن، چۆن ئەوانە لێك نزیك بکەمەوە، ئای بۆ ئەو ڕۆژەی من و کوڕی پیاوە مەستەکە و ئاگر پێکەوە تەبا بین، هەر چۆنێك بێت دەبێت ئاگر و کوڕەکە ئاشتبکەمەوە، ناتوانم دەستبەرداری بم، دەکرێ ئەوینێکی پیرۆزی حەفت پایزە بە ئاگر بسووتێنم؟ دەکرێ ئاگرێکی پیرۆز بۆ کورێکی دژە ئاگر بکوژێنمەوە؟ ناکرێ، ئای کوڕی پیاوە مەستەکە!

ئۆی، من خوشکترین خۆشکم نەدیوە، دەبێت بیبینم، چووم، باوەشمی پێداکرد و گریا:

+چەند لە مێژە دیار نیت، لە پەنجەرەشەوە نەمدیوی، دەبوو سەردانم بکەیت، ئای...

_وایە، بەڵام منیش باش نیم...

ئەوەی لە ژنە کەسکپۆشەکەم شاردەوە ئەوەی لە هەموو کەسێکم شاردەوە، نەمتوانی لە خوشکترین خوشکی بشارمەوە، بە گریانەوە ورد و باریك هەموویم بۆی گێڕایەوە، خوشکترین پتر پرسیاری لە کچێنیەکە بوو، چۆن بوو؟ چەند چوو؟ ئازار؟ خوێن؟ نەیدەبڕیەوە، منیش هەر:

نازانم، نازانم، نازانم...

بە راستی نازانم، هەندێك جار دیمەنەکەم بە شێوەیەك دێتەوە پێش چاو کە خەون بووە، هیچ شتێك ڕووینەداوە، خۆم لە خەیاڵی خۆم درووستمکردووە، بەڵام چ لە بەربوونەوەی پیاوە مەستەکە دەکەیت کە لە سەر لقە بەرزەکانی بیەکەوە هاواری لێ هەستا و زرمەی لێوەهات، نا ئەوە خەون نەبوو، خەیاڵ نەبوو، پیاوە مەستەکە، خوشکترین خوشك گوتی:

تا ئێستا لە خەستەخانەیە، باشە بۆچی بە سەردارەکە کەوتبوو؟

بە تووڕەییەوە گوتم:

رەنگە ویستبێتی ئێمە ببینێ.

خوشکترین خوشك گوتی:

تۆ چی دەڵێیت؟ واز لە ئاگر دێنیت و شووی پێدەکەیت؟

نازانم چیم گوت، رەنگە گوتبێتم:

ئا، هەردووکیان ئاشتدەکەمەوە، شووی پێدەکەم.

خوشکترین خوشك بە بێزاریەوە گوتی:

ئاشت نابنەوە، ئەو كوڕە لەگەڵ ئاگر ئاشتنابێتەوە، تۆ دەڵێی شێتی.

خەمبارانە گوتم:

رەنگە شێت بم، ئەوین ئەوین، ئای...

ئەویش خەمبارانە گوتی:

نازانم، هیچ نازانم، بەڵام ئەنجامەكەی باش نابینم، ئەو كوڕە ئەوە نیە كە...

باوەشم بە خوشكترین خوشكدا كرد:

توخوا قسەی پێمەڵێ...

خوشكترین خوشك چی نەگوت، دەستی بە سەرمدا هێنا، چایەكی هێنا، گوتی:

ئەگەر لاتینیەكەت كەمێك باش بووە، نامەكەی خوشكی گەورەم بخوێنەوە.

وا بزانم گوتم:

هەر وەك خۆیەتی، بەڵام دەیخوێنمەوە، خوێندمەوە:

بۆ خوشكی تەمەن حەفت ساڵەی خۆم...

چاوە گەشەكانت ماچ دەكەم.

ئەو نامەیە تایبەت بۆ تۆ دەنووسم.

ئەو پیاوەی ئێستا مێردمە، خۆزگە قەت نەدەبووە مێردم، ئەو پیاوەی كە زۆرت خۆشدەوێ نەبێتە مێردت باشە، ئەگەر زوو دەمزانی نەمدەهێشت ببێتە مێردم، من هەڵەم كرد بە قسەی ژنە چەندمێردكەرەم نەكرد و خۆم لە بەلای گۆی مەمك نەپاراست، گۆی مەمك منی خستۆتە سەر رێی شێتبوون، من هەشت ساڵی رێك ئەو پیاوەم خۆشویست، ئەو رۆژەی بۆی بە بووك چووم، بە سەر پشتی هەوری سپیدا چووم، خۆزگە هەر لە رێ دەبووم نەدەگەیشتمە ژووری خەوتن، خۆزگە هەر لە رێ دەمامەوە لە نێوان ماڵی خۆمان و ماڵی ئەو پیاوە دەماوە، خۆزگە ئەو رێگایە هێند دوور دەبوو هێند دوور گەیشتنی نەبا، ئای خۆشمدەویست ئای خۆشمیدەویست، سێ ساڵی ئامادەیی، چوار ساڵی كۆلێژ، ساڵێكی پیاسەییش من لەگەڵ ئەو پیاوە بووم، بە درێژای چوار ساڵی كۆلیژ حەفتەی شەوێكمان هەبوو، لەو شەوەدا بە تایبەتی لە ساڵی دوایی و بۆ ماوەی دەمژمێرێك ئێمە و ژن و مێرد بووین، بەڵام ژن ومێردایەتیەكی پڕ لە خۆشەویستی نەك وەك ئێستا، درەنگ

تێگەیشتم، درەنگ، درەنگ لە حیکمەتەکانی ژنی چەند مێرد تێگەیشتم، ئەو ژنە دەیگوت:

ئەو پیاوەی دەتەوێت مێردی پێبکەیت، نەکەیت پێش زەماوەند هەڵەی وا بکەیت، بۆی رووتببیەوە، تا لە توانات هەیە نەهێڵی تامت بکات، نەکەی نەکەی وا بکەیت دەستت تێدا بگێڕێت، ئەنگۆ نازانن نەتاندیتیە، لە من بپرسن: زۆری پیاوی ئەو وڵاتە کە ژنێکی پێش گواستنەوە تامکردبێت، بە چاویدا دەداتەوە، قەت ناتوانێ لەگەڵی باش بێت، پیاو ئای لە پیاو، بە قسەم بکەن با مێردی دوا رۆژتان تامتان نەکەن، ئەگەر پێش مێرد کردن حەزتان لە ماچ و رامووسانە بڕۆن لەگەل کوڕێك رابوێرن بە خەونیش نەبێتە مێردتان.

خۆزی بۆی رووتنەدەبوومەوە، تامی نەدەکردم، وابوو قسەی ژنە چەند مێردکەرە وەك ئایەت راست کەوتەوە، هەر لە شەوی بووکێنی، پیاوەکەم ئەوەی ساڵانێك عەشقمان کرد، هێشتا کراسی بووکێنم لە بەر بوو، گوتی:

چەند خۆش بوو ئێستا لەشولارێك ببینم پێشتر نەمدیتبێت.

چەند دڵرەقانە ئەو رستە ترسناکەی گوت، ئید هاوسەریمان چلەی نەچووبوو، کێشە سەری هەڵدا، بەرە بەرە دڵپیسی چەکەرەی کرد، زۆر جار دەیگوت:

پێشتر جگە لە من بۆ کەسیتر رووتنەبوویتیەوە؟

خۆزی باس هەر لە پێشتر با، گەیشتە دواتریش، دەڵێت:

کەسێك لە سەردەمی کچێنی شت بکات لە سەردەمی ژنایەتی دەتوانێت وازی لێبێنێت؟

من دەڵێم بەو پیاوە دەڵێم:

ئاخر من لەگەڵ تۆم کردووە، تۆم خۆشویستووە، بۆیە...

بە گوێیدا ناچێت لەگەڵ هەموو ئەوانەش من ئەو پیاوەی سالانێك لە خۆمم پتر خۆشویست، ئێستاش خۆشمدەوێ و نابێت ئەوین کالبێتەوە، دەتوانم سێبەردی لێوەربگرم، بەلام ئەدی چ لە ئەوین بکەم! بۆیە من دەبێت بمرم، یان شێت بم، دەڵێن شێت ئەوین دەپارێزێ، من لەورۆوە بڕیارمدا بچمە سەر بەرماڵ و نوێژێکی درێژ دابەستم نوێژێك، نوێژێکی پەیامبەرانە و لە خودا بپاڕێمەوە کە بۆ ئەوەی ئەوینەکەم بپارێزم، بۆ ئەوەی هەر بە ئەویندار بمێنمەوە، یان بمکوژێت یان شێتم بکات، دڵنیام

شێت دەبم، زۆر نیشانەی شێتایەتیم لێ بەدەرکەوتووە، جارێ هەر خۆم هەستیان پێدەکەم.

خوشکترین خوشك نامەی خوشکی گەورەی لە دەستم بە شێوەیەك راپسکاند ئەزیەتی پێنەگات، بۆچی نەیهێشت تەواوی بکەم؟ رەنگە منی لە بارێکی زۆر نائاسایی دیتبێت، ترسابێت شتێکم بە سەر بێت، نای خوشکترین خوشك تۆ بۆچی جارەکەیدی نەتهێشت نامەی خوشکەکەت بخوێنمەوە، خوشکترین خوشك چیت لە من کرد، لە هەستاندا گوتم:

+خۆزی حەفت پایز لەمەوبەر ئەو نامەیت دەدۆزیەوە، باشە بۆچی جاری یەکەم نەتهێشت بیخوێنمەوە.

- ترسام کاری خراپ لە تۆ بکات، نەمدەویست تۆ ئەو نامەیە ببینی، بەلاّم...

+باشە ئێستا بۆ ناهێلی هەمووی بخوێنمەوە؟

- لێرە بە دواوە دوور و نزیك نزیکایەتی لەگەڵ تۆ نیە، تایبەتە زۆر تایبەتە بە خودای زۆر تایبەتە...

سەرم هەڵنەبڕی جاری یەکەمم بوو بە و کۆڵانەدا بڕۆم و چاوێ نەدەمە پەنجەری دنیا، لەو ڕۆژەوە تا ئەو ڕۆژەی لە ڕەشبگیریەکەدا گیرام، کوڕی پیاوە مەستەکە پتر لە سی نامەی نارد، وەڵامی هیچیم نەدایەوە، لە هەموو نامەکان داوای هاتنە خوازبێنیمی دەکرد بە مەرجی لە ئاگردوورکەوتنەوە، من لای خۆمەوە بڕیاری خۆم دابوو کە وەڵامی نامەیەك دەدەمەوە کە مەرجی ئاگری تێدا نەبێ، گیرام و ئەو نامەیە هەر نەهات، لە ناو زیندانیش لە چاوەڕوانی نامەی بێ مەرجی کوڕە مەرجدارەکە شەو و ڕۆژم دەکردەوە، نەهات و نەهات، دوای هاتنەوەشم لە زیندان گەڕەك کۆڵان کۆڵان ڕژانە ماڵی ئێمە نە خۆی هات نە نامەیەك، نامەی مەرجداریش نەهات، لە پێش ماڵیان دەنگی دەهۆڵ و زوڕناش هات، ئەو هەر نەهات، دڵی شووشە بوو شکا، یان بەرد بوو چەقی نەهات و نەهات.

# ۱۱

# نەخشەسازی گەرماو

هێ لە ناوی خۆم نزیکەی شەش نازناو و ناوی نهێنیم هەبوو، بەڵام هیچیان وەك نەخشەسازی گەرماو پێمەوە نەنووسا، پێوەنووسانێك بە هیچ لێنابێتەوە، نە پەرلەمانتاری نە وەزیری هیچ هیچ نەخشەسازی گەرماو لێناکاتەوە، لەو رۆژەوە کە جێگەی شاردنەوەی پەڕەکاغەزی قاچاخم بۆ پەری دیاریکرد و نەخشەکەیم بۆی کێشا، مـن بـوومە نەخشەسازی گەرمـاو، پەری بەو نـاوە نـاوی هێنـام، ئەو پەریە سـەیرە، بـیەوێ هەر نازناوێك بۆ هەر کەسێك هەڵبژێرێ، کەسەکە بیەوێ و نەیەوێ، بزانـێ و نەزانێ، دەچێتە سەر و هەموو کەس بەو ناوە دەیناسنەوە، من تا ئێستاش هەتا نەڵێن نەخشەسازی گەرماو زۆر جار بە خاترانە گەرماوەکە ناڵێن هەر نەخشەسـازم، منـداڵەکانی خۆشـم نامناسـنەوە، سـەرۆکیش هەر بە نەخشەسازی گەرمـاو بانگمـدەکات، کەم کەسـیش دەزانـی نـاوی مـن لە سەرشۆرکەکەی ماڵی پەریەوە هاتووە.

ئەو رۆژەی پەری گیرا، مـن لە شار بـووم لە ماڵێـك لە ماڵەکـانی شۆرش خۆم حەشـار دابـوو، مـاڵی پەریش هەر مـاڵی شـۆڕش بـوو، بەڵام مـن نەدەبـوو لەوێ بـم، کـوڕی نەفتفرۆشـەکە هەواڵەکەی هێنـا، رۆژی پێشـتریش پەری لای مـن بـوو، ترسـاین، دەبـوو لەو مـاڵەوە بچـمە مـاڵێکیتری شـۆڕش، ماڵێـك پەری پێینەزانێت، دەبوو لە پەری هەڵبـێم، خۆمی لـێ بشـارمەوە، جێیەك ماڵێك ببینـمەوە نەمبینێتەوە، ترسـان لە پەری ئاسـایی بـوو، زینـدان چ نـاگۆڕێ، دارکـاری بەرد دێنێتە زمـان، پەری کە دەڵێـی ناسـکە نـانە، چـۆن بەرگەی قامچیەکـانی زینـدان دەگرێ، کەس نکـوڵی لە ئـازایەتی پەری ناکـات، بەڵام زینـدان چەنـدان پاڵەوانی بە چۆکدا هێنا، لەگەڵ ئەوەش مەرجیش نیە پەری بە چۆکدا بێـت، مـن بیسـتوومە زۆر جـار ژن لە پیـاو قـایمترە، رەنـگە پەری لە زیندانێ ببێتە سەفین و نەرووخێ.

دەبـوو هەواڵێـك لە سەرشـۆرکەکەی مـاڵی پەری بـزانم، دەبـوو بگەمێ، پێشنەوەی حکومەت دەستی پێبگات، رەنگە ئێستا ماڵی پەری سەراوبن کرابێت، حەزمنەدەکرد کوڕی نەفتفرۆشەکە شتێك لە گەرماوەکە بزانێ، دەنا کەس هێندەی وی بۆ ئەو کـارە بـاش نەبوو، هەر دەبوو خۆم بچم، ئەگەر دەستیان بگـاتە بن مەنجەڵی سەرشۆرکێ، پەری و مـاڵی پەری بەو ئاگرەی گەرماوێ دەسووتێن، پەری نابێت تێدا بچێت، پەری

دەبێت بژیت، هەرچیم لە دەستبێت بۆ ئازادبوونی پەری دەیکەم، بابی پەری باش دەناسم و برادەرمە هەرچەندە ئەو لە رەنگێکیترە، بەڵام هێندەی خۆم جێی متمانەیە، لەگەڵ ئەوەش نامەوێت شارەزای نهێنیی سەرشۆرکەکەی خۆیان بێت، پەری هێند کتوپڕ دەستگیرکرا، بڕواناکەم دەستی بە کەس راگەیشتبێ کە زوو بگاتە گەرماوێ و نەهێڵێ دەست پیاوانی ئەمن بکەون.

شەوی دواتر خۆم گەیاندە کۆڵانە نزیکەکانی نزیك ماڵی مەرگ، ئا ئەو شەوانە ماڵی پەری وەك ماڵی مەرگ وابوو، کێ دەیوێرا لە کۆڵانە دوورەکانی کۆڵانی ماڵی پەری نزیکبێتەوە، بە تایبەتیش من کە ئەگەر چاوێك بمناسێتەوە، سێودووی لێناکەن و سێدارەم بۆ هەڵخراوە، هێ لە هەندێش بە درەنگانی شەوان ئەگەر کەسێك گێل نەبێ، لە دەرگای ماڵی پەری نادا، ماڵێك کەسێکیان تازە ئەمن سوڕگومی کردبێ، نیوەی شەویش دەنگی دەرگا بێت، داخوا دڵیان چ بڵێ، من گوێم نەدایە ترس و گێلایەتی و ئەو شتانە، تەق.. تەق بە ئەسپایی لە دەرگا گەورە سێ دەریەکەم دا، ئێستاش لە بیرمە سێ جار لە دەرگام دا جار لە دوای جار نەرمتر، پێچەوانەی هەموو خەڵك، لە دڵی خۆم گوتم رەنگە ئەوە نیشانەیەکی دڵنیایی بێت بۆیان و هێندە نەترسن و دەرگاش بکەنەوە.

+کێیە؟

-منم.... بیکەوە

ناوە هەرە کۆنەکەی خۆمم گوت، ئەو ناوەی بابی پەری باشی دەناسی و لێشی دڵنیا بوو، کردیەوە و پەلکێشی ژوورێی کردم، گوتی:

+وەرە، خێرا...

-لە کاتێکی خراپ هاتم.

بە هەوکی پڕ لە هەنسکەوە:

+ دەی، پەریم گیرایە پەری، زانیوتە؟

-زانیومە، خەمت نەبێت، چ نابێت.

+دەترسم زۆر دەترسم، پەری تیاچوو.

بابی پەری بە تەنیا لە ماڵ بوو، گریان گەرووی گرتبوو، دەیویست قسەیەك بکات لە قورگی عاسێ دەبوو، گوتم:

+دەڵێی بە تەنیا لە ماڵەوەی؟

-ئـا، نەمویسـت کەس لە مـاڵەوە بمێنێتەوە، مـن چـاوەڕێ دەکەم بێن بمبەن، منیش ببەنە لای پەری، نابێت ئەو زیندانی ومن ئازاد بم.

لە پـڕمەی گریـانی دا، گریـا، هەر گریـا، منیشـی لەگەڵ خـۆی گریاند، کەس نەبوو کڕمانبکاتەوە، بە پشتێنەکەی فرمێسکەکانی سڕیەوە و گوتی:

+تۆ ماڵێکی باش ببینەوە، نابێت لێرە تووش بیت.

-وا دەکەم، کەمێـك لێـرە دەمێـنمەوە، بەڵام ئەگەر بکـرێ دەمەوێـت سەرم بە ملدا بشۆم، سەرشۆرکەکە...

+بڕوا ناکەم ئاوی گەرم هەبێت.

چوومە گەرماو، یەکەم جارم بوو گەرماوی ماڵی پەری ببینم، بەڵام بە نهێنیـیەکەی ئاشـنام، خـۆم نەخشـەی مەنجەڵـی ئـاوی ساردم کێشـاوە، دیـتمەوە ئەو جـێگەیەم دیـتەوە کە بەس مـن و پەری پێیـدەزانین، دەسـتم گێڕا هیچ نەبوو، پەڕە کاغەزێکم نەدیتەوە، ئەو هەموو بڵاوکراوەیە چیـان بەسەرهات، خۆ پەری ڕۆژی پێش گیرانی گوتی:

هەمـووی لای خـۆمن و هەفـتەی دادێ دەسـت بە دابەشـکردن و بڵاوکردنەوەیان دەکەم.

چەند جارێ ویستم لە هەواڵی بن مەنجەڵی سارد لە بابی پەری بپرسم، نەمپرسی، بابی پەریم بە تەنیایی و لە تلانەوەیەکی باوکانە بەجێهێشت.

دەمێك بوو پەریم دەناسی، ئەو لە هێلی من کاری دەکرد، راستەوخۆ پەیوەندی بە منەوە هەبوو، یەکەم جار لە بناری سەفین دیتم، لەو دیوەی کە هەنارستانە، لە ناو هەناران پەریم دیت، هێشتا منداڵکار بوو، روومەتەکانی دەتگوت دنکە هەنارن، کچی وا جوانم نەدیوە، تا ئێستاش نەمدیوە، لە کاری سیاسەت زۆر گەرموگوڕ بوو، ئاگرێك بوو بۆ خۆی، دەیویست چەك هەڵگرێ، بەڵام پەشیمانیانکردەوە، منیش گوتم:

بڕۆوە، بۆ تۆ شار باشترە لەشاخ.

پەیوەندی نێوان من و پەری پەیوەندی ریکخراوی بوو، هەر زوو دەمویست پەیوەندیەکەمان قوولتر بێتەوە، بەڵام لە چاوی پەریەوە خوێندمەوە کە پەیوەندیەکە هەر ئەوەیە و تەواو، بۆیە منیش لەوێ وەستاندم و جوولەیەکی وام نیشان نەدا کە مەبەستێکیدی بگەیەنێت، پەری لەو کچانە بوو هەر کوڕێ دیتبای دەچووە دڵیەوە و حەزیدەکرد پەیوەندی لەگەڵ ببەستێ، پێشمەرگە و جاش بۆی شێت ببوون، لە پێناوی گەیشتن بە پەری ئامادەی چی نەبوون، کەس نیە (بابەلباب

جــاش) نەناســێت، بەڵام کەم کەس هەیە چیرۆکــی وی لەگەڵ پەری بزانێــت، پێشــمەرگەی دنیــا بە دوای بابەلبــاب جاشــەوە بــوون، هەزار بۆسـەیان بـۆی دانـایەوە، پێـوە نەبـوو، هەزار جـار بە سـەریان دادا، بەر نەکەوت، سـەد کەڕەت پەیوەنـدیان پێـوەکرد کە واز لە جاشـایەتی بێنـێ و بێـتە رێـزی شۆڕشـەوە و هەرچـی بـیەوێ بـۆی بـکەن، ملـی نەدا و جاشــایەتی بە پێشــمەرگایەتی نەگــۆڕیەوە، ئەدی ئەو دەمەی هەواڵ بڵاوبۆوە کە بابەلباب جاش چەکی جاشایەتی فڕێداوە و لە مـاڵی خۆی کە دەکەوتە سـەر رێی سـەفین دانیشـتووە، کـێ بـاوەڕی کـرد؟ کەس، نە پێشـمەرگە نە جـاش نە کەس، ئەدی چەنـد کەس دەزانێـت ئەو بابەلبـاب جاشە چەند جار بە رێگەی جودا جودا پەیوەندی بە پەریەوە کردووە کە مێردی پێبکـات، چـی دڵیشـی دەخوازێت بـۆی دەکـات، جگە لە پەری کەس..ئەدی ئەو رۆژەی بابەلبـاب جـاش بـانگکرایە بەغـدا و نەگەڕایەوە کێ شتێکی لە بارەیەوە زانی؟ کەس، ئەدی بۆچی بابەلباب جاش وازی لە جاشایەتی هێنا؟ هەر یەکەو قسەیەکی دەکرد، هەبوو دەیگوت:

ترسی گەیشتبووێ، دەکوژرا، ناچار وازی هێنا.

هەبوو دەیگوت:

حکومەت گومانی لێی هەبووە و چەکی کردووە.

هەبوو دەیگوت:

خەونـــــی دیتـــــووە لەو خەونە پێیانڕاگەیانـــــدووە کە ئەگەر واز لە چەکداری نەهێنێت مردنی نزیکە.

هەشبوو دەیگوت:

تۆبەی کردووە و لە ماڵی خۆی خەریکی زیکر و تەهلیلەیە.

بەڵام ئەگەر لە پەری بپرســـن وا نـــاڵێ، هێشـــتا بابەلبـــاب جـــاش بانگنەکرابووە بەغدا، پەری ئەوهای بۆ من گێڕایەوە:

وازم لێناهێنێ، بابەلباب جاش ناوە ناوە بە بەر گوێمدا دەدا کە شووی پێـبکەم، بەوەی باشـە خزمـایەتی لەگەڵ بـابم هەیە، دەنـا بە رفانـدن دەمرفێنـێ، بەڵام وا بـڕوا دەترسـم شـتێکم لێبکـات، پـێش مـاوەیەك هـاتە ماڵمـان، دیسـان دایەوە گـوێم، منـیش مەرجم بـۆی دانـا، مەرجی وا کە لێی دەرنەچێت، لە کاتێك ئەگەر دەرچووش، من یەکسەر خۆم بگەیەنمە شاخ و لە دەستی دەربچم، پێیمگوت:

+من شووت پێدەکەم، بەڵام مەرجم هەیە؟

-هەر تۆ و مەرج، هەر مەرجێکت هەیە جێبەجێیدەکەم.

+مەرجەکەم قورسە.

-لە ژنەکەم جیاببمەوە؟ ئەوە جیابوومەوە.

+نا، جیامەبەوە، هەوێ هەوڕێی نەخواردووە.

-دە، بڵێ، چیە؟

+واز لە جاشایەتی بێنە.

- جاشایەتی، ئێ...

+ئا وازی لێبێنە.

گوڕێی خۆی خوراند:

-واز لە جاشایەتی بێنم، ناتوانم، دەبێت بچمە چیا.

+......

-باشە واز دێنم و پێکەوە دەچینە چیا.

+من حەزم لە چیا نیە و نامەوێ کەسوکار و ئەو شارە جێبهێڵم.

-ئاخر، ناکرێ واز لە جاشایەتی بێنم و لە ماڵی خۆشم دانیشم.

+بۆچی ناتوانی؟ دوژمنداریت بەو رادەیەیە کە...

-نا، بەڵام ناکرێ.

+ئێ، کە ناکرێ منیش ناکرێ شووت پێبکەم و چیدی...

-باشە واز دێنم.

+باشە، لەو رۆژەوەی کە بە فەرمی وازت هێنا، شەش مانگی خۆت بژمێرە و وەرە داخوازیم، من رازیم.

-وازدێنم و چاوەڕێی شەش مانگەکە بە، بەڵام بۆچی شەش مانگ؟

+تا دڵنیابم کە بە راستی وازت هێناوە.

-من لە ژیانم هەر هەرێیەکم دابێت گەیاندوومەتە سەر، چاوەڕێ بە.

+چاوەڕێم.

شەش مانگی چی، چاوەڕوانیی پەری نەگەیشتە شەش هەفتەش، بابەلباب جاش چووە رێی بەغدا و ئێستاش نەگەڕایەوە.

ئەدی ئەو پێشمەرگەیەی (کۆپتەرشکێن)ی ناو بوو، بە هەموو شەڕەکاندا هاتبوو هەر لە هەکاریەوە بگرە تا گەرمیان و تا دەگاتەوە پشتئاشان هەمووی دیتبوو، کەس نەبوو هێندەی وی شەڕی فڕۆکە و کۆپتەری کردبێت، هێندەی وی شەڕی براکوژی کردبێت، هێندەی وی شەڕی جاش و سەربازی کردبێت، هێندەی وی دەبابەی پەکخستبێت، کۆپتەری خستبێت، لە هەموو شەڕەکان دەرچووە، بەڵام لە شەڕی پەری تیاچوو، پەری نازانم بۆ خەڵکیدی چۆن بەڵام بۆ کاکی خۆی ئەوهای گێڕایەوە، پەری بە منی دەگوت کاکە:

لەو سەر و بەندەی زانکۆکان هەرایان تێکەوتبوو، شەو درەنگانێ لە دەرگا درا، بابم دەنگی ناسیەوە و هێنایە ژوورێ، کێ هاتە ژوورێ! بەژن و بالایەکی فیشەکاوی هەر زەینەت بوو تەماشای بکەیت، بابم ئەوها بە خێرهاتنی کرد:

+کۆپتەرشکێن، هەرچەندە من و تۆ لە هەموو جێگەیەك سەنگەرمان لێکدی گرتووە و خوێنی یەکتر دەخۆینەوە، بەڵام ماڵەکەم جێگەی شەڕی لێنابێتەوە، فەرموو رووناکت کردەوە.

-مــن هەر ئەوەم لە تــۆ چــاوەڕوان دەکــرد، هەر لەبەر ئەوەش لە دەرگای کەسیترم نەدا، کەم دەمێنمەوە ناهێلم بەیان بدا، دەڕۆم، کارێکم بە ئێوە کەوتووە، ئەگەر...

+ئەگەر بە من بکرێت، منەتی تێدا نیە.

-ماشێنێکم دەوێت.

بابم هەرێی ماشێنی بە دوژنەکەی دا، هەرێیەکەشی بردە سەر، نازانم تۆ کۆپتەرشکێنت دیوە یان نا، گەنجێکی تا بلێی قۆز لەوانەی هەر بە تیچاوێ دڵی زۆر لە کچان دەبەن، یان ژنە کەسکپۆشەکە گۆتەنی:

برای خۆی عەشقی دەبێت.

ئەو شەوە کۆپتەرشکێن چاوی لە سەر من هەڵنەدەگرت، بەڵام مـن رقم لێی دەبۆوە، وەك ئەوەی جاشێك ناپاکێك تەماشام بکات، لە هەستاندا لە تاریکی حەوشەکەدا پیش هەستان بابم گلۆپی حەوشەو سەر دەرگای کوژاندبۆوە، دەرفەتێکی وەرگرت و شتێکی خستە ناو دەستم، هەستمکرد پارچە کاغەزێکە، هێشتا نەمخوێندبۆوە تێگەیشتم، کۆپتەرشکێن چی نووسیوە:

پەری چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم، تۆ دەمێکە لە دڵی من جێگەی خۆت کردۆتەوە، رەنگە تۆ یەکەمجارت بێ من ببینی، بەڵام من سێیەم جارمە بتبینم، من تۆم خۆشدەوێ، بۆیە ئەگەر رازیت، بە کوڕێك کە بەیانی پێش نیوەڕۆ دێتە ماڵتان و خۆی پێت دەناسێنێ لە نامەیەکدا هەواڵی خۆشم بۆ بنێرەوە، دڵنیاشم کە رازی دەبیت و دەتبەمە چیا.

دوو سێ جار هاتە سەرم بە بابم بڵێم:

بابە کۆپتەرشکێن بۆ ماشێن هاتبوو یان بۆ من؟

گێڕامەوەو نەمگوت، کوڕە راسپێردراوەکەی کۆپتەر شکێن لە کاتی خۆی گەیشت، گوتم:

بە کۆپتەرشکێنەکەت بڵێ، من هیچم نیە بۆی بنووسم، پێیبڵێ: رێی من و ئەو لە مردنیش تێکناکاتەوە، باشترە بە دوای کەسێکیدی بگەڕێت.

دوای ئەوە چەند جارێکیدی هەواڵی دەنارد و وازی نەدەهێنا، لە نامەیەکدا نووسیبووی:

کچی دنیا بۆ من شێت بوونە، تۆ خۆت بە چی دەزانی!

وەڵامیم نەدایەوە

لە نامەیەکیدی وای نووسیبوو:

من لە هەموو شەڕەکان شەڕی عەرد و ئاسمان براوە بوومە، دەبێت لە شەڕی تۆش هەر براوە بم.

هەر بە سەرخۆشم نەهێنا

لە نامەیەکیدی بە خەتێکی گەورە نووسیبووی:

من لەبەر خاتری تۆ واز لە چواردە ساڵ پێشمەرگایەتی دێنم، دێمەوە و دەبمە جاش، خۆشت باش دەزانی کە دەبمە چ جۆرە جاشێك، جاشێك هەر بە ئاماژەیەك بە پێی خۆت بێیە ماڵەکەم، هەر دیتت هاتمەوە و تۆش بوویتە ژنم...

ترسام زۆر ترسام، چاوەڕێی هاتنەوەی کۆپتەرشکێنم دەکرد، وام دانابوو هەر ئەو بێتەوە شار من بە چیا بکەوم، ئەو ڕۆژەی کۆپتەرشکێن حەڤدە پێشمەرگەی لە شیرنەی خەوێ لە خوێن گەوزاند و بە خۆو شەش پێشمەرگەوە خۆیان رادەست کردەوە، باش بوو من لەرێی زیندانێ بووم، دەنا هەناسەم دەگیرا، تەمەنی جاشایەتی کۆپتەرشکێن باش بوو نەگەیشتە چوار ڕۆژ، ئەو ڕۆژەی من بەربووم ماشێنەکەی کۆپتەرشکێن

دەیانگوت لە ڕێی پیرمامیێ بە ژمار حەڤدە تەقلەی خوارد، ئێستاش سەری کۆپتەر شکێن و تایەکی ماشێنەکەی نەدۆزرانەوە.

ئەدی چیرۆکی ئەفسەرەکە، پەری بۆمی گێڕایەوە بەڵام سوێندی دام بۆ کەسی نەگێڕمەوە، نایگێڕمەوە.

پەری کەلـلەڕەق بوو، شتێکی بەدڵ نەبا نەیدەکرد، پەری دوای رابوونی شار هەر وەك خۆی مایەوە، من زۆر هەوڵم لەگەڵی دا، پلەی باشم بۆی دیاریکرد وەرینەگرت، پەری، پەری...

## ١٢

# پەری

ئەو ڕۆژەی کوڕی پیاوە مەستەکە جلکی سەربازی پۆشی، دنیا لە گەرمەی شەڕ بوو، لە بیرمە ئەو ڕۆژە بە گۆرانیەکم گرت، سەد کەرەت پتریش گۆرانیەکەم هەڵدەکردەوە:

سالەکەی ئەوسالّ بە ژەهری مار بێ

هەمووی بە قوربان ڕۆژێکی پار بێ

..........

لە ئامارێکی سەرپێیی کە ژنانی سەرەکۆلانان ئەنجامیان دابوو، لە هەر سێ سەرباز سەربازێك دەگەڕایەوە و دوانەکەیدی دەبوونە بەلاگێڕی سەرۆکی ئومەی عەرەبی، سەلما خان ناوی لە جلکی سەربازی نابوو جلکی مەرگ، ناهەقی بوو ئەو ناوەی لێنێ! هەرچی لەبەری دەکرد،

لە ناو دارەبازە دەگەڕایەوە، یان هەر نەدەهاتەوە، لەو رۆژانە هەموو خەڵك بە ئاشکرا نا بەڵام لە بن لێوانەوە بە جلکی مەرگ ناویان دێنا، رۆژ نەبوو چەند دارەبازەیەك نەگاتەوە گەڕەك، سەرەتا دوا بەدوای هەر دارەبازەیەك، قەمەرەیەکی جوان دیاریی ماڵی دارەبازەکە بوو، باوك یان برای (شەهیدەکەی جەنگی رەوا) بە کەمێك شەرمەوە هۆڕنیان بۆ منداڵانی کۆڵان لێدەدا، ئەو منداڵانەی لە ناوەندی کۆڵانێ دەتگوت تاڵەبنیشتن بە عەردەوە نووساون و رێیان بەرنەدەدا، دواتر ساڵ هات و رۆیشت، ژمارەی دارەبازە لە زیادبووندابوو، قەمەرە نەما، جگە لەوەش لە سەر دارەبازەکان دەنووسرا (ترسنۆك)، کوڕی پیاوە مەستەکە لە سەردەمی ترسنۆکی نەك قەمەرەدا جلکی سەربازی پۆشی و چووە بەرەی شەڕ.

ئەو رۆژەی کوڕی پیاوە مەستەکە جلکی مەرگی پۆشی، من سەرەتا دڵتەنگی دایگرتم، ترسم لێنیشت، لە جاران پتر رقم لە شەڕ دەبۆوە، چ دەبوو ئەگەر دەستبەجێ شەڕ کۆتایی بێت، هەرچی سەربازە بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان بە کوڕی پیاوە مەستەکەشەوە.

بوەستە شەڕ بوەستە، کوشتوکوشتار بەسە، سەرباز نەما.

زۆر جار لە بەرخۆمەوە دەهاتمە دەنگ و داوای شەڕ وەستانم دەکرد، خەونم بە کۆتایی شەڕەوە دەدیت، لە خەونێکدا دیتم:

کوڕی پیاوە مەستەکە گەیشتە پێش دەرگای خۆیان، هاواریکرد:

شەڕ وەستا، شەڕ وەستا.

چووە بن دارپرتەقاڵەکە جلکە سەربازیەکەی داکەند و کراسێکی پرتەقاڵی و پانتۆڕێکی رەشی پۆشی، من چاوم لە رووخساری بڕیبوو، بەڵام ئەو نەرووی دامێ، نە تەماشایەکی کردم.

دوای دووسێ حەفتە دڵم بەو جلکە خۆش بوو، دڵم دەڵێ خەونی من لە سەربازیی کوڕی پیاوە مەستەکەدا دێتەدی، دەمویست شەڕ لەو ساتە کۆتایی بێت کە پێیەکی کوڕی پیاوە مەستەکە بە ئاسماندا بچێ و کەس نەیبینێتەوە، بە یەك پێ بگەڕێتەوە، ئای بۆ ئەو رۆژەی هەواڵ دێ کە کوڕی پیاوە مەستەکە پێیەکی فڕیوە، لە سەرەوەی چۆکیەوە فڕیوە، مەرج بێت لە هەلهەلە بدەم، شیرینی بە سەر گەڕەکدا ببەشمەوە بۆ ماڵی پیاوە مەستەکەش بنێرم، شەڕ دەی شەڕ تیلمە تۆپێك بنێرە بۆ ئەو سەنگەرەی کە کوڕی پیاوە مەستەکە خۆی تێدا حەشارداوە، بەڵام هەڵە نەکەیت جگە لە پێیەك جێیەکیدی نەبەیت، پێیەك و بەس، زۆر خوێنیشی لە بەر نەڕوات، گیانی نەکەوێتە مەترسیەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە نابێت بمرێت، قاچێکی بەسە، ئەو کوڕە شایەنی یەك قاچە،

دارشـەقی جـوان لێـدێت، کـوڕی دارشـەق نـاوێکە هەر لە خـۆی دێـت، پیرۆزت بێت ئەو ناوە.

دەچـوومە خەیـاڵەوە، بە دارشـەقەوە دەمـدیت، ئەوەتە کـوڕی دارشـەق لە پێش دەرگـا لە سـەر کورسـەیەکە دانیشـتووە، دارشـەقەکەی بە دیـوارەوە راگرتووە، چەند مەلـوول دیـارە، ئەها ئەو منـداڵە چەتـوونە دارشـەقەکەی بـرد، مـن لەو دەمە لە مـاڵی خوشـکترین خوشـك دەگەڕامەوە، کەوتـمە دوای منـداڵەکە، دارشـەقەکەم بـۆی هێنـایەوە، پێکەوە چـووینە حەوشـە، یـارمەتیم دا لە سـەر کەوتـن بە سـەر پێبلکەکـان و گەیشـتنی بە ژوورەکەی، ئەوەتە لە پەنجەرەی دنیاوە تەماشای دار پرتەقاڵەکە دەکەیـن، تەماشـای ئەو پەلە هەورانە دەکەیـن کە پێـدەچێت یەکبگـرن و بە تەنـکە بەفرێك دنیا پاکبکەنەوە، دڵەکان پاکبکەنەوە.

ئای شەڕ، ئەوانەی پێویستیان بە پێیە بێ پێیـان دەکەیت، شەڕ تۆ چەنـد شەڕی، دەستت دەگـاتە هەمـوو جێگەیەك، دنیـا هەمـووی بەرەی شـەڕە، هێنـدەی لە کۆلانـان لە سـەر بانـان گیـان دەدووریەوە لە نـاوە سـەنگەرەکان هێنـدە نـا دووریەوە، تـۆ لە ئاسـمانەوە دابەزیە کـۆلانێ و خوشکترین خوشکت بەو دەردە برد، تۆ لاقی ئەوت بۆ چی بوو؟ شەڕ چەنـد شەڕی، لە بەرە بەیـانێکی شـەڕ فـڕۆکەیەك لە بەرزایـی قەلاتەوە

پارچە ئاسنێکی تایبەت بۆ خوشکترین خوشکی هاویشتم بردی، لاقە سپی و سۆلە گۆشتنەکەی خوشکترینی برد، دارشەقێکی بۆ بەجێهێشت، شەڕ تۆ شار شار، گەڕەك گەڕەك، كۆڵان كۆڵان، ماڵ ماڵ دەگەڕێیت و دەستی دەستکرد و پێی دەستکرد و دارشەق دابەشدەکەیت، شەڕ دەڵێی چاوت نابینێت، ئەوەتە لە بەرەی شەڕ لە ئاقاری دارخورما چڕ و پڕەکان سەربازێك رەنگە لە بەرەی پێشەوەی شەڕ بێت، ببینەوە، پێویستی بە دارشەق هەیە، ببینەوە لە بەر دڵی من ببینەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە ببینەوە و بە دارشەقەوە بینێرەوە ژوورەکەی خۆی، با بە دیار پەنجەرەی دنیاوە دانیشێ و چاو ببڕێتە سەر دەرگا و كۆڵانێ، دەی شەڕ پارچە ئاسنێك لە فڕۆکەیەکەوە لە مووشەکێکەوە لە دەبابەیەکەوە لە... بنێرە بە ئەسپایی پێیەکی بۆ خۆت ببە و لە منەوە پێشکێشی تۆ بێت، چەند جوانە، کوڕی پیاوە مەستەکە بە دارشەقەوە چەند جوانە.

هەمیشە چاوەڕێ بووم هەواڵی پەڕینی پێیەکی کوڕی پیاوە مەستەکە بگات، لەو ماوەیەی ئەو لە سەربازی بوو من زوو زوو دەچوومە ماڵی خوشکترین و لەبەر دڵی وی باسی پێ پەڕین و دار شەقم نەدەکرد، جارێك پرسی:

+تۆ تا ئێستا هەر تەمات پێی ماوە؟

-ناتوانم بێ تەما بم.

+باشە تەمای چی! تازە تەمای چی! تۆ شێتی.

-بە تەمام، لە شەڕدا برینداربێت، برینێك وای لێبكات كەس پێی رازی نەبێت، كەس لە كنی دانەنیشێت، هەینێ...

+هەینێ پێویستی پێت دەبێت و تۆش شووی پێدەكەیت.

-....

+بەڵام من ئەو كوڕە بناسم هەینێش بێ مەرج ناتخوازێت.

-با ئەو ڕۆژە بێت، ناچارە دەسبەرداری مەرجی ناگر بێت.

لە چاوەڕێی پەڕینی پێ و دارشەق شەو و ڕۆژم دەكردەوە، تا ئەودەمەی هەواڵ هات شەڕ وەستا و كوڕی پیاوە مەستەكەش چۆن جلكی سەربازیی پۆشی هەر بەو شێوەیە گەڕایەوە ماڵی خۆی، ئای شەڕی هەمیشە شەڕ، هێندە ئیشەم بە تۆ هەبوو، نەتكرد، كوڕی پیاوە مەستەكەت بۆ ئەو گەڕاندەوە نەك بۆ من،

بەڵام بێ هیوا نەبووم، دەبوو کوڕی پیاوە مەستەکە بۆ من بێت، دەستبەرداری مەرجی ئاگر بێت و بۆ من بێت، کوڕی پیاوە مەستەکە ببیە بابی حەفت منداڵانیش من هەر بە تەماتم.

ئێوارەیەك لە ماڵی خوشکترین، من لەو ماوەیە ئەگەر سەردانی ئەوم بکردایە ئێواران بە تاریکی دەچووم بۆ ئەوەی کوڕی پیاوە مەستەکە من نەبینێ، نەمدەویست بە هیچ جۆرێك تارماییشم ببینێ، لە ژووری خوشکترین خوشك لە لای پەنجەرەکە بەرانبەر پەنجەرەی دنیا دانیشتبووین، رووناك ئای چەند رووناك بوو، ئای کوڕی پیاوە مەستەکە چیت لە من کرد، جگە لە من کەس شایەنی هۆدەکەی تۆ بوو! بە خوشکترین خوشکم گوت:

+من ناتوانم دەسبەرداری بم، چارەیەك،

-هیچ، کچە شێتەکە هیچ، تۆ شارێك ئیرەیی بە جوانی و ژیریت دەبات، کەچی لە راست پیاوێکی بێ ئەمەکی درۆزنی دڵپیس وا رووخاویت، تۆ ئەو شتانەت بە چاوی خۆت نەدیت، نەتبیست؟ تۆی بەو دەردە بردو خۆشی سووك و باریك بۆی دەرچوو، بیربکەوە پەری بیربکەوە.

+نا، وا مەڵێ، حەزناکەم کەس قسەی پێبڵێ.

-باشە، ببوورە.

+قسەی تۆ رەنگە راست بێت، بەڵام ئەوین ئەوین، ئەوین منی کەڕ و کوێر کردووە، لە ئەوین کوا کاتی بیرکردنەوە هەیە؟

ئەو ئێوارەیە کەوتبووینە ناو قسان، درەنگ چوونەوەم بیرکەوتەوە، خوشکترین زۆر هەولیدا بە تەنیا نەچمەوە بە قسەیم نەکرد، هێواشی هێنا، پشتگوێم خست، بە بەر دەمی دەرگای ماڵی پیاوەمەستەکەدا رەتبووم، هێندەی نەمابوو بەردێك بگرمە پەنجەرەی دنیا، دواتر دەمگوت بریا بەردەکەم هاویشتبا و پەنجەرەکەم شکاندبا، ژوورەکەم راچلەکاندبا، پژمینەکەم بیرکەوتەوە دەنا بەردێکم دەهاویشت، دواتر روونبۆوە پژمینەکە شتیتری بە دواوە بوو، گەیشتمە سەری کۆڵان، مەیلە و چۆل بوو، تاقولۆق خەڵك بە دەرەوە بوون، رێك لەو جێگەیەی کە جلکزەیتوونیەکان پەلاماریان دام، قەمەرەیەك لە بەردەمم وەستا و پەلاماریان دام، دەمیان گرتم و چاومیان بەست، بەرزەفتمیانکرد، ئای پیاوە مەستەکە لە کوێی، ئەوجارەش بگە هانام، نەهات، منیان خستبووە نێوان خۆیانەوە، بە شوفێرەکەیان گوت:

پێ لێنێ، بە لای خۆتدا...

ئیدی گوێم لە هیچ قسەیەکیدی نەبوو، دەستمیان توند گرتبوو، دەممیان توند بەستبوو، قەمەرەکە هێند پێچ پێچی کرد لێم تێکچوو بە کام ئاراستەدا ڕۆیشتین، ڕەنگە هەر چارەگێك بە ڕێوە بووبم، خۆم لە سەر قەرەوێڵەیەك دیتەوە، دەستەکانمیان بە قەرەوێڵەکەوە بەست، دەمم هەر بەستراوە، چاومیان کردەوە ژوورەکە نیوە ڕووناك بوو، دوو پیاو بە سەرمەوە بوون، شتێکی وەك توورەگەیان لە سەری خۆیان هەڵکێشابوو، تەنها دوو چاو و دەم و کونە لووتیان دیار بوو، نەرم نەرم بلووزەکەمیان هەڵدایەوە، تەنوورەکەمیان داکەند، یەکیان چووە دەرێ، ئەویدی یەکسەر دەمی بە خاڵی گەردنمەوە نا، وەهای دەمژی گوتم لە بنەوە هەڵیکەند، چەندی خۆم راپەسکاند و بەلاش بوو، بەهێز بوو، ئەو کارەی کوڕی پیاوە مەستەکە بە نیوەچڵی جێیهێشت ئەو پیاوە کە نەمزانی کێیە تەواوی کرد، هەستا، لە ژوورەکە چووە دەرێ، هێندەی پێنەچوو، ئەویدی هاتە ناو ڕانم و ئەویش دەوی بە خاڵەکەوە نا تەواو، ئای خاڵی سەر بە گۆبەند، خۆزگە نەشتەرگەریم دەکرد، هەموو ئەو خاڵەیە من بە گۆبەند دەبات، هیچم لە دەست نەدەهات، لە چاوەڕێی پیاوی سێیەم بووم، نەهات، دەستمیان کردەوە، تەنوورەکەمیان لە بەرکردمەوە و بە دەستی خۆیان پرچمیان ڕێکخستەوە و چاومیان بەستەوە هەر بە چاو و دەم

بەستراوی سوار بووینەوە، نازانم چەند بەڕێوە بووم، بە هێواشی هێنامیانە خوارەوە و کە چاومم کردەوە ماشێنەکە لە کۆڵانە مەیلە و تاریکەکە تیژ تێپەڕی، چاوم بە دەور و بەرمدا گێڕا لە کوێ بم باشە! ڕێك سەری کۆڵانی خۆمان، پێش دەرگای ژنە کەسکپۆشەکە، ڕەنگە گەشتی لاقەکردن هەمووی هەر دەمژمێرێکی بردبێت، من دواتر ناوم لەو شەوە نا شەوی گەشتی لاقەکردن، خۆزگە لەو شەوەدا کەسێك دەبوو من وەك خۆی نیشانبداتەوە، لە دەرگام دا، دایکم بە:

کچە تیوی ماڵانگەڕ، قاحپەی قاحپەخانەی مووسڵێ...

دەرگای کردەوە، بابم لە ماڵ نەبوو دەنا نەیدەوێرا قسەی وا سووك و چرووك بکات، دواتر زانیم بابم هێشتا من نەچووبوومە گەشتی لاقەکردن، هێشتا هەر لە ماڵی خوشکترین بە دیار پەنجەرەوە دانیشتبووم، هێشتا هەر سەر لە ئێوارە بووە، بە گەشتێکی کتوپڕ لە شار دەرچووبوو، لەو شەوە هەر جوێنەکانی دایکمم لە یادن، لەو شەوە نازانم خەوتم یان نا، نازانم، ئەوەشم لە بیرە بۆ یەکەمجار و ڕەنگە دواجاریش بووبێت پیاوم بە نەفرەتکرد، هەرچی پیاوە بەر نەفرەتی ئەو شەوەی من کەوتن، بە کوڕی پیاوە مەستەکەشەوە، من پێشتر زۆرم لە بارەی لاقەکردنەوە بیستبوو،

خوێندبۆوە، بەڵام تا خۆم بەرنەکەوتم، شتێکی ئەوتۆی تێنەگەیشتبووم، ڕەنگە لەبەر خۆمەوە گوتبێتم:

کە ئەوەی کوڕی پیاوە مەستەکەش کردی ڕەنگە نیوە لاقەکردنێك بووبێت، بەڵام من بە هەندم وەرنەگرتبوو.

لەوانەیە لەبەر خۆمەوە گوتبێتم:

ژن چەندێ بەهێز بێت، لە ئاست پیاو، لەو کارە ئەو هێزەی نیە و دەشێ بدۆڕێ!

بەیانی دابوو نەدابوو، خۆم لە ماڵی ژنە کەسکپۆشەکە دیتەوە، گریام گریام، ئێستاش گوێم لەو گریانەی خۆمە ئێستاش ئەو فرمێسکانەی خۆم دەبینمەوە کە ئەو ڕۆژە هەڵموەراند و ژنە کەسکپۆشەکەشم لەگەڵ خۆمدا گریاند، ئەوجارە هیچم لێینەشاردەوە، لە نووکەوە گەشتی لاقەکردنم بۆی گێڕایەوە، ژنە کەسپۆشەکە بە بیستنی چیرۆکی لاقەکردن خەریکبوو لە بانگبدا و پرچی خۆی بڕنێتەوە، هەستمکرد خۆی گرت و کەوتە هێورکردنەوەم، گوتی، وا بزانم وای گوت:

تۆ کچێکی ژیر و تێگەیشتووی، نابێت بەو شتانە وا تێکبچیت، تۆ باوکت باش دەناسیت، بە قسەی من دەکەیت وەك چۆن بۆ منت

گێڕایەوە، بۆ باوکیشت بگێڕەوە، شەرم مەکە، باوکت تێدەگات و یارمەتیشت دەدا، بۆ کچێنیەکەشت ئەوە هەر بە زیندانەوە بەندە و شوو بە هەر کێ بکەیت دەزانێ و قسەیەکی نیە.

بە گریانەوە گوتم:

نا، نابێت بابم بە هیچ شێوەیەك بەوە بزانێت، من دەزانم چەند خەفەت دەخوات، بابم بە زانینی ئەوە بە زگ دەدات، ناژیت.

ژنە کەسکپۆشەکە سەرمی خستە ئامێزی خۆیەوە و دایکانە گوتی:

ئێ، کچی خۆم، با نەزانێت، بەڵام تۆش هەوڵبدە لە بیری خۆتی ببەیتەوە، خۆ تۆ یەکەم کەس نیت تووشی لاقەکردن بێیت، رۆژ هەیە لەو شارە کچێك تووش نەبێت، هەر ئەوانەی من دەیانناسم هێند زۆرن ناژمێردرێن، ئەها خۆ کچەکەی دراوسێی ماڵی سەلماخان، خۆت لە من باشتری دەناسی، سێ رۆژ بێ سەرو شوێن نەبوو؟ بە هەشت کەس لاقەیان نەکردبوو؟ ئەدی لەو رۆژانەش جوانترین کوڕ نەیخواست؟ خۆ بابی ئەو نیو هێندەی بابی تۆش باش نیە، بیستت یەك قسەی ناخۆشی پێبڵێ! باشە با قسەی تۆ بێت لای کەس باسی مەکە، منیش هیچم

نەبیستووە، کچی خۆم هی تۆ هەر هیچ نیە، پێوەی دیار نیە، تۆ مەمنوونی ئەو سێ رۆژە زیندانیە بە.

بە قسەکانی ژنە کەسکپۆشەکە کەمێك هەناوم فێنك بۆوە:

من ئەو شتانە دەزانم، بەڵام ناتوانم، ئەو غەدرەم لە بیرناچێتەوە، ئەو غەدرەی جگە لە پیاو لە دەستی کەس نایەت، لە دەستی درندەش نایەت.

دایکانەتر گوتی:

دەزانم کچی خۆم دەزانم، کەس نەزانێت من دەزانم، گوێبگرە با منیش شتێکت بۆ بگێڕمەوە، بۆ کەسم نەگێڕاوەتەوە، بۆ مێردەکانیشم، ئێستا دەڵێم خۆزگە بۆیانم دەگێڕایەوە، دەزانم تۆش بۆ کەسی ناگێڕیتەوە:

هەر ساڵێك دەبوو شووم کردبوو، شووی یەکەم،ماڵمان نزیك مزگەوتی حاجی لەقلەقەکان بوو، زستان بوو، مێردەکەم بە سەفەر رۆیشتبوو، خوشکێکی مێردەکەم بێوەژن بوو، شەو لام بوو، ماڵنووستنان لە دەرگا درا، دشەکەم خەوتبوو، من وام مەزەندەکرد مێردەکەم گەڕاوەتەوە، هێند دڵنیابووم کە ئەوە نەمپرسی کێیە، دەرگام نیوە

لانەدابوو، دەستێك زارمی گرت و چوار پێنجێك بە ژوور کەوتن، دەمو چاوی خۆیان پێچابوو، پەری چۆنی دەگێڕمەوە ئەوهابوو، هەر بە چەفیەکانی خۆمان زاری هەدووکمانیان بەست، هەر بەکلانگوجکەکانی خۆمان دەستمانیان لە پشتەوە بەست، کەوتنە سەرمان، شەش پیاو بوون، رووتوقووتیان کردبووینەوە، لالەکەیان کەمێك کز کرد، ئا لالەمان هەڵکردبوو، لە بیرم نیە ئەو دەم لە ماڵی ئێمەدا گلۆپ هەبوو یان نا، نازانم کارەبا کوژابۆوە بۆیە لالەمان هەڵکردبوو، یان کارەبا هەر نەبوو، پەری ئەو بەرازانە یەکیان دادەبەزی ئەویدی دەهاتە سەرێ، هەر بە بەر چاوی یەکترەوە، شەرمیان لێکدی نەدەکرد، پەری وا بزانم هەر یەکەیان لە من و لە ستێیەکەم پەڕین وەك نێرەکەر پەڕین، لە ماوەی یەك دوو کاتژمێر ئەو شەش بەرازە شەش جار خۆیان لە من بەتاڵکردەوە، شەش جار خۆیان لە دشەکەم بەتاڵکردەوە، بەوەی باش بوو هیچمان زگمان لەو بەرازانە نەگرت.

بە بیستنی زگ ترسێك رژایە گیانمەوە هەستمکرد دەلەرزم، بە دەم لەرزینەوە، پرسیم:

ئەدی ئەگەر من لەو دوو بەرازە زگم گرت؟

ژنە کەسکپۆشەکە بە پێکەنینێکی شیرینەوە گوتی:

خەمت نەبێت، ئەوە بۆ دایکی خۆت هەڵگرە، هەر هەستت پێکرد من ئاگاداریکەوە، لە سەر من...

لەرزی ترس بەرینەدەدام:

من هیچی لێنازانم، هیچ...

بە پێکەنینێکی شیرنترەوە:

نیشانەی دیارە، دوای مانگێك پتر هەموو شت ڕووندەبێتەوە، خۆ گوتم تۆ خەمی ئەوەت نەبێت، خۆت بە نیشانەکانیشەوە خەریك مەکە، ناتەوێت ئەگەر شتێك دیارکەوت من وەکات، بێنەوەی کەس شك بە شتێك بکات، کۆتایی پێبێنم و هیچ ڕوونەدا.

لە قسەکانی ژنە کەسکپۆشەکەوە دڵنیایی دادەچۆڕا و ئارامدەبوومەوە.

مانگ و نیوێك پتر کەمتر من بە سەر دنیاوە نەبووم، بابم هەر بە دەورمەوە بوو، جگە لە ژنە کەسکپۆشەکە قسەم لەگەڵ کەس نەدەکرد، وەڵامی کەسم نەدەدایەوە، جگە لە کەسکپۆشەکە هاتووچۆی کەسم نەدەکرد، قومریشم نەدەدیت، هەموو ڕۆژێ لێیم دەپرسی:

+چی بوو، گەیشتمە کوێ؟

-هێشتا چەند رۆژێکە وا زوو دەرناکەوێت.

زوو زوو دەمگوت:

+دە وەرە دەستێك لە زگم بگێڕە، بزانە بەچکە بەرازێك شتێك...

لە بەر دڵی من دەستە بچووکە نەرمەکانی دەخستە سەر زگم و نەرم نەرم دەیشێلا:

-هیچ دیار نیە، کچی خۆم هیچ دیار نیە.

دیسان دەچوومەوە لای:

+ئێستا چی لێهات بۆ نیشانەیەك بە دیارنەکەوت؟

لە پێکەنیندا لە سەر پشت دەکەوت:

-کچێ، شێتە، تەواو، ئیدی تەواو، نەمگوت تەواو، من زگم هەبێ تۆ نیتە، ئەو جارەش تەواو، باش بوو پیاوی سێیەم لەگەڵی نەکردی، دەنا لە سێیان یەکیان دەیگرت، ئیدی لەوەو دوا نەکەیت بە تاریکی بە

تەنێ بە کۆڵان بکەویت، هەرنا من لەگەڵ خۆت ببە،(بە پێکەنینەوە) با منیش ئەو خۆشیە ببینمەوە.

کاتێك دڵنیابووم لە شەوی لاقەکردن منداڵ نەکەوتۆتە زگمەوە، هێندە دڵخۆش بووم وەك ئەوەی کچێنیەکەم گەڕابێتەوە، ئەو کچێنیەی بەڵای خودایە بە کچی ئەو وڵاتەوە، ئەو کچێنیەی بە درووستی نەمزانی یەکێك لەو دوو پیاوە نەناسراوە بردیان، یان پێشتر کوڕی پیاوە مەستەکە بردبووی، من هەمیشە بیرم لەو دوو پیاوە دەمامکدراوە دەکردەوە، دەبێت کێ بن، هەبێت نەبێت ناسیارن ئەگەر ناسیار نەبن، بۆچی خۆیان دەمامك دەدا، خۆ من نەمدەناسینەوە لە کوێ دەمناسینەوە، نا ئەو دوو پیاوە ئاشنان، رەنگە هاتبنە ماڵیشمان، رەنگە رۆژانە بە بەردەممدا پیاسە بکەن و لە بەر خۆیانەوە بڵێن:

ها ژنی خاڵ لە گەردن، هەر ئاوڕمان لێمەدەوە، ئێمە کاری خۆمان کرد.

من لەوەدەمە بە دواوە ئەو پیاوانەی لە رێوبانان زۆر دەمدیتن، تیچاوێکم دەدانێ تا بزانم شەوی گەشتەکەیان پێوە دیار نیە، دوای ئەوە رۆژێك چوومەوە سەردانی خوشکترین خوشك، لەو جێگەیەی کە دوو جار لێم قەوما، جارێك پیاوە مەستەکە رزگارمی کرد و جارەکەیدیش

خواش فریام نەکەوت، ڕێك لەو شوێنە دوو منداڵ بە دار لاستیك بەردیان دەهاویشتە داربیە بەرزەکە، جانتاکەم کردەوە و هەندێك پارەم دەرهێنا بەشی چەند جار چوونە سینەمایان دەکرد، گوتم:

ئەگەر، ئەها ئەو پەنجەرەیەم بۆ بشکێنن، هێندە پارەتان دەدەمێ.

یەکیان گوتی:

بیدە من ئێستا وەهات بۆ دەهێنمە خوارەوە و پارچەی گەورەی هێندەی بەردی دارلاستیکەکەم بێت.

ئەویدیان بە تووڕەییەوە:

نا، وا نەکەیت، عەیبە پەنجەرەی ماڵان بشکێنی.

نەیانشکاند، منداڵەکان پەنجەرەی دنیایان نەشکاند، چەند حەزمدەکرد بیشکێنن، شاوڕم لە دەرگای ماڵیان، لە پەنجەرەی دنیا نەدایەوە، کاتێ خوشکترین خوشك دیتمی هێندەی نەمابوو بقیژێنێ:

+کچێ، پەری ئەوە بۆچی وات بە سەر هاتووە؟ ئەو هەموو جوانیەت بۆ کوێ چوو؟ کێ بردی؟ ئەو کوڕە ناکەسەی ئەو

پەنـجەرەیەی ئەو بەر، ئـای دەسـتم بیگـاتێ شـەرتبێت سـەد تـف لە نـاو چاوی بکەم.

پشت لە پەنجەری دنیا دانیشتم وبە شێنەیی گوتم:

-نا، جوێنی پێمەدە، ئەو...

+باشە، بزانم ئەو ماوەیە بۆ دیار نەبوویت؟

-نازانم، بەڵام رەنگە لەمەودوا نەتوانم ئەو کۆڵانە ببینم.

+پێمخۆشە، ئیدی پشت لەو پەنجەرەیە بکەیت، بەڵام مـن گونـاهم چیە؟ خۆت دەزانی من...

-دەزانم، بەڵام منیش...

## ١٣

# کوڕی پیاوە مەستەکە

من هەمیشە گوتوومە و دەیڵێمەوە، خۆزیا چەند چرکەیەك زووتر بابم هاواری کردبا و زرمەی لێوە هاتبا، خۆزیا داربیەکە زووتر لێی تووڕە دەبوو، بابم زۆر جار بە کەلکم هاتووە و لە کاتی خۆی بە هانام گەیشتووە، بەڵام ئەو جارە نا، چەند چرکەیەك دوا کەوت، چەند چرکەیەکی ترسناك، ئەز هەرگیز لەگەڵ دەستدرێژی نەبوومە، کەچی لەو چەند چرکەیە لە ژیانی خۆمدا دەستدرێژیم تۆمارکرد، دەستدرێژیم کردە سەر پەریی ئاسمانیێ، ئای پەری چەند بە دەنگە ئاسمانیەکەی پاڕایەوە، چەند بە دەستە فریشتەییەکانی پاڵی پێوە نام، چەند هەوڵی دا جێگەیەکی لەشم بەر ددانە برنجیەکانی بکەوێت، من درەنگ زۆر درەنگ پەژیوانبوومەوە، هەتا درەنگیش بە لاقەکردنم نەدەزانی، دەبوو پەری ببێتە ژنی من، جگە لەو رێیە چ رێم لە پێش نەمابوو، پەری لە ئاگر دوورنەدەکەوتەوە، دەبوو دووری بخەمەوە، جگە لەو رێیە چیم لە

دەستدەهات، دەزانن چەند هەوڵم بۆ لە ئاگر دوورخستنەوەی پەری دا، پەری، پەری، لە پەریان پەریتر پەری، راستگۆترین کچی دنیایێ پەری، لاملترین کچی دنیایێ پەری، من دەمزانی پەریی خاڵ لە مل لامله، بەڵام بەو رادەیەش نا، چیم لەگەڵ پەری نەکرد، کەچی هەرێی لە ئاگر دوورکەوتنەوەی نەدا و نەدا، بەس سووکە هەرێیەکی پێمدابا، باوەڕم پێیدەکرد، پەری لە سەریان دابا لە قسەی خۆی پەشیماننەدەبۆوە، من دەمتوانی مەرجی ئاگر لە دێری نامەکانم لە ریتمی قسەکانم بکوژێنمەوە تا پەری دەگوازمەوە، دوای گواستنەوە دایگیرسێنمەوە، بەڵام دەمزانی بەجێمدەهێلێ، باشە من بۆچی هێندە لەو ئاگرە دەترسام کە پەری باوەشی پێدا دەکرد و خۆی گوتەنی خۆی پێ روونـاك دەکردەوە.

درەنگ پەژیوانی دایگرتم، چەند هەفتەیەك دوای دەهۆڵ و زوڕناکەی کۆلانێ، دوای هاتنی ئەو ژنە لە جیاتی پەری هاتە چاوەی چاوەڕوانی، ئەو چاوەیەی تایبەت بوو بە پەری، ئەو چاوەی حەفت پایز حەفتانە مێواندارێی پەریی کرد، حەفت پایز لە پەنجەرەوە دەمڕوانیە کۆلان ، کاتێ پەری بە دیار دەکەوت باڵم دەگرت، تازە چلەی زەماوەندم چووبوو، من عاشق بوومەوە، عەشقی پەری بوومەوە، پەری تەنها چل رۆژێك بە گەشتێک ماڵی دڵمی جێهێشت، زوو گەڕایەوە، پەری بۆ

هەمیشە گەڕایەوە ماڵی خۆی، ماڵی دڵی من، نا، شەوی یەکەمیش من لەگەڵ پەری خەوتم، بانگمکرد پەریەکەم، ئەو رەنگە لە وشەی پەری خراپ تێگەیشتبێ، ئەو چوزانێ من حەفت پایز عەشقی کچێك بووم، دێوانەی کچێك بووم ناوی وی پەری بوو، پەریی ئاسمانێ بوو بەڵام بۆ من دابەزیبووە سەر زەوی، ئەو چوزانێ بە هەڵە بە بووکی بۆ من هاتۆتە ژوورەکەی پەری، ئەو ژوورە هی پەریە و کەسیدی، هەر دەبێت بۆ پەری بێت.

نەدەبوو، پەری رووتبکەمەوە، نەدەبوو جەستەی پەری وەك قەندی شەکر لە ناو لێوەکانم بتوێنمەوە، نەدەبوو لەو حەفت پایزە تامی پەری بکەم، دەبوو بە پیرۆزی بیهێلمەوە، نەدەبوو پیسی بکەم، من جەستەی پەریم پیسکرد، ئەگەر لەشولاری پەریم بە پیرۆزی هێشتباوە، دڵنیام هیچ کچێك نەدەهاتە ژوورەکەی ئەو، نەدەهاتە باوەشی من.

ئای، پەری لە سەرەتادا چەند هەوڵی دا بە پیرۆزی بیهێلمەوە، نەمهێشتەوە، پەری لەبەر دڵی من نەبا خۆی بە پیرۆزی دەهێشتەوە، پەری نەیدەویست دڵی من بشکێنێت، ئای پەری جوان دڵی منی رادەگرت، کێ هەیە وەك ئەو رایگرێت، لەو رۆژەوەی هەڵات و نەهاتەوە، تا شەوی دەهۆڵ و زوڕناکە من بوومە تینووترین تینووی جەستەی ژن،

هەر کچێك هەر ژنـێکم دەدیت خۆم پێڕانەدەگیـرا، دەمویست پەلامـاری بـدەم، وەك چـۆن پەلامـاری پەریـم دەدا، جەسـتەی پەری منــی فێرکـرد نەتوانم بێ مـاچ و رامووسـان بژیم، مـن حەفت پایزی رێك تـا حەفتە وەردەسووڕاوە و پەری دەهات، ئاگرم دەگرت بۆ مـاچێکی لێوەکانی، لەو مــاوەیە زۆر هەوڵمــدا ژنێـك بـۆ رابـواردن بـدۆزمەوە، بەڵام منــی بــێ دەسەڵات، منی ترسنۆك دەستم دەگاتە ژنێك، من ئێستاش نازانم بۆچی لە ئاسـت پەری وا ئـازا بـووم، مــن ئەو کـوڕە نـیم لە چـاوی کچـانەوە سەرنجراکێشــن، لە تەمەنــم هەســتمنەکردووە کچێــك، ژنێــك تیچـاوێکی واتـاداری دابێتمـێ، نـازانم نیگـای پەری بە کـوێی مـن فریـوی خـوارد، جارێك برادەرێکم بە نێوان من و پەری زانیبوو، گوتی:

تـۆ زۆر بەخــتەوەی کە کچێکــی وەك پەری خۆشــتیدەوێ، نەکەیــت هەرگیز دڵی بشکێنیت.

ئۆی دڵیم وەك شووشەی بادەکەی باوکم شکاند، ئەو شووشەیەی لە شـەوی دۆڵ و زوڕنـاکەدا بـابم لە داخـان، لە داخـی پەریـی دڵشـکاو لـێم تووڕەبوو، بە دیواری حەوشەی دادا و ئێستاش بـڕۆ لە بـن داڕپرتەقـاڵەکە وردە شووشەی ئەو شووشەیە خڕکەنەوە، من نەمتـوانی پتـر بەرگە بگـرم، دەبوو ژن بێنم هەرچی زووە ژن بێنم، ئەو رۆژەی دایکم هاتە بن گوێم:

+کچێکی گەلێك جوانم بۆت دیاریکردووە.

-کێیە؟

+کێ بێت باشە؟ کچی بازرگانەکەی...

-بە راستتە!

بێ سێودوو رازیبووم، لەو ساتەدا کچی بازرگانەکە لە چاوی مـن بە جوانترین کچ خۆی نیشان دا، لە پەریش جوانتر، بە تامەزرۆییەوە گوتم:

- ئەو رازی دەبێت؟

+مەمنوونیشە، کوڕی قۆزی وەك تۆی دەستدەکەوێ؟

هەتـا کـچ بـوو مەمنـوون بـوو، بە هەمـوو شـت رازی بـوو، چەنـد مەرجیشم بۆی دانابوو، هەر هەموو لە سەر چاوی خۆی دانابوو، تـاکە مەرجی ئەویش چی بێت باشە!

جگە لە من کەسیترت خۆشنەوێت.

ئەو سـاتەی ئەو رسـتەیەی گـوت مـن چ پەریـم لە بیـر نەمـابوو، سـوێندم بـۆی خـوارد کە هەر ئەوم دەوێ و بەس، مـن درۆم کـرد، کچـی

بازرگانەکەش درۆ، تەنها پەری راستگۆ دەرچوو، تەنها پەری بە بالا بەرزی مایەوە و بۆ هیچ مەرجێك نەچەمایەوە.

سەرم بە سینگی کردبوو، دەبێت خەوتبم، رەنگە خەونم دیتبێت، هێند بە توندی رایتەکاندم، هێندەم لە خۆم هەڵدا، قیژاندی بە سەرمدا:

+بە من بڵێ، ئەو پەریە کێیە، تۆی شێت کردووە، تۆی لە من بردووە؟

-پەری کێیە؟ نایناسم، تۆ پەریی منی، من لای تۆم.

+درۆ دەکەیت، من پەریی تۆ نیم، تۆ لای پەریەکی، لە یەکەم شەویش لە خەوێ بانگی پەریت کرد، بە من بڵێ کێیە، دەنا هاواردەکەم.

-کچێ شێتە، شێتم مەکە، جگە لە تۆ پەریتر شك نابەم، وەرە ئامێزم با بخەوین.

درۆی هێند گەورەم ریکدەخست رێی تێنەدەچوو، بەڵام ئەوی هێور دەکردەوە، ئەگەر نامەکەی پەریی دەستنەکەوتبا، درۆکانی من کاری خۆیان کردبوو، هێندەی بە دوای (پەری کچێ پەری)ی خەو و زیندە خەوی مندا نەدەگەڕا، ئەو نامەیەی پەری بۆچی لە سێسەدو حەفتا نامەکە دابڕا و کەوتە دەستی کچی بازرگانەکە؟ ئەو نامەیە درێژە،

پەڕێکی گەورەی هەردو دیو، نامەکانی پەری زۆربەیان کورتن، لە نێوان چـوار هەتـا حەفـت دێـری خەت وردن، خەتێکـی هێنـد خـۆش لە کۆمپیـوتەریش هیـچ خەتێکی وا خـۆش نـیە، حەفـتەیەك پێش زەماوەند نامەکانی پەریم کردە شەش جێ، هی هەر ساڵێکم خستە نایلۆنێکەوە، رەنگیان پرتەقاڵیە، لە چەپ و راستی پەنجەرەی دنیا هێندەی قەبارەی نایلۆنەکان کەرپووچم دەرهێنا، بە جوانیش گەچکاریم کردنەوە، ئێستاش نامەکان هەر لەوێن، خودایە تا دنیا دنیایە ژوورەکەی پەری بمێنێ، با نامەکان هەر بمێنن.

ئەو نـامەیە بـۆچی لە نامەکـان دابـڕا؟ هەر دەڵێـی دەستێکی پەری تێدایە، دەڵێی ئەو لە نامەکـانیتری دابڕیـوە و تـایبەت و لە جێگەیەکـی تـایبەتی دانـاوە تـا ئەو بەزمە بنێتەوە، زوو زوو نـامەکەی دەردەهێنا و بە چـاومی دادەدا زووتـریش چەنـد دانەیەکـی لـێ کـۆپی کردبـوو، نەبـادا بیـدڕێنم و بفەوتـێ، نـاوە نـاوە دەیخوێنـدەوە، سـەد جـاریش پتـر خوێندوویەتیەوە، هەموو جارێکیش کە دەگەیشتە ئەو چەند دێرە دەنگی بەرزتـر دەکـردەوە، هێنـد بەرز ئەگەر کەسـێك لە کـۆڵانێ لە ئاسـتی پەنجەرەکە راوەستابا، گوێی لێیی دەبوو :

چوار شەمەکەیتر پاڵێکی توندم پێوە نای، هێندەی نەمابوو سەرت بەر پەنجەرەکە بکەوێت، ناهەقت ناگرم کە لێی توورە بوویت، مـن گازەنـدە لە دەستی راستم دەکەم، نەدەبوو هێندە رەق بێت، دەستم لە ئاست تۆ رەق بـوو لێی خۆش نابم، تا ئەوها بە رەقی بمێنێتەوە لێی خۆش نـابم و هەمیشە سـەرکۆنەی دەکەم، بەڵام هەرێـی داوە نەرمبێـتەوە، بـا هەردووکمـان چاوەڕێ بین بزانین هەرێکەی خۆی دەباتە سەر، کوڕە چاو رەشەکە، من دەزانم ئەگەر پەشیمانبێتەوە لەو رەقیەی بەرانبەر تۆ نواندی، دڵت نەرمە و لەگەڵـی ئاشـتدەبیەوە کە تـۆش لەگەڵـی ئاشـبوویتەوە منـیش ئاشتدەبمەوە، دەزانی هەرێی چی داوە؟ سەری مانگ بە چاوی خۆت دەبینی، دەزانم حەزت لێیە شتێکی لێ بزانی، دەستی راستم ئەوەی لە دار توندتر بوو لەگەڵت دەڵێ: ئەو جارە بە خۆم بەو پەنجانەی خۆم یەك یەك دوگمەی کراس دەترازێنم، بەو پەنجانەی خۆم مەمکی چەپ...

کوڕە چاو رەشەکە، ئەو دەستەی توندیی نواند ئێستا وا دەڵێ، تۆ چی دەڵێی؟ لێی خۆش دەبیت؟ کوڕە چاو رەشەکە ئەوجارە کە هاتمە ژوورەکەت من مێوانداریەکت دەکەم هەرگیز لە بیری نەکەیت، کوڕە چاو رەشەکە، لە سەر سینیی سینەم تۆ مێوانی، دەست بۆ چ میوەیەك درێژ دەکەیت بە لێـوە جوانەکانـت تـامی چ میـوەیەك دەکەیـت؟ کـوڕە چـاو رەشەکە، ئەو جارە کە هاتم لە ناوك بۆ سەرەوە هەر هەمووی....

خۆزیا بەو کاتەی کە ئەو نامەیەی پەریم خوێندەوە و تا گەیشتمە سەری مانگ چرکە چرکەم دەژمارد وەك چۆن بەرۆژووێك کە رەمەزان کەوتبێتە چلەی هاوینێ، لە بەر هەتاوێش بێت، چەندی تینووە و چۆن کات دەژمێرێ بۆ بانگدان، منی لەویش تینووتر ئەوها چاوەڕێی فتارم دەکرد، فتار لە سەر سینەی بەهەشتیی پەری، حەیف، سەری مانگ هات، بەڵام پەری نەهات، پەری هەرێی خۆی هەر گەیاندۆتە سەر بەڵام ئەو جارە نازانم چ کارێکی هەبوو بە لایەکدا رۆیشتبوو، زۆری پێچوو تا گەڕایەوە.

بە خوێندنەوەی نامەکە بە شێتبوون شێت دەبوو، پەلامار دەدام، یەخەمی رادەوەشاند، من سەرەتا نکوڵیم لێیدەکرد، ئەو نامەیە پەیوەندی بە منەوە نیە، بەڵام نەچووە سەر، ئەو هەموو پەریەی کاتێ خەوێ هیچی نەدەشاردەوە، جگە لەوەش پێشتر هەر لەو ژوورە کۆندۆمی دۆزیبۆوە، هەرچەندە ئەوکات گوتم، ئەوانەم تازە کڕیون، دەمەوێ لەگەڵ تۆیان بەکاربێنم، بەڵام ئەو وەڵامەم جێی گاڵتە بوو، ئاخر ئێمە دەمانویست منداڵمان ببێت، لەگەڵ ئەوەش زۆر لەسەر کۆندۆم نەڕۆیشت، بەڵام کە نامەکەی دیتەوە کۆندۆم ئاڵۆزتر هاتە ناو قسانەوە و بووە کێشەی گەورە، راستی ئەوە تایبەتە بە پەری، من ئەو دەمەی لای

خـۆمەوە بڕیـاری سـەرجێیکردنم لەگەڵ پەری دا، کـرێم و ئەو دەمەی باوکیشم لە سەر داربیەکە کەوتەوە خوارەوە من ...

کۆنـدۆمەکە نـا بەڵام دانـم بە نـامەکە نـاو هەوڵمـدا تێیـبگەیەنم کە ئەوەی روویـداوە هـی پێشـترە، نـاکرێ لە سـەرم ئەژمـاربکرێ، بەڵام ئەو دووبـارەی دەکـردەوە کە بـۆچی پێشـتر پرسیاری لێمکـردووە و منـیش بەو شێوەیە وەڵامـیم داوەتەوە کە هـیچ کچێك لە ژیانمـدا نەبـووە، ئـێ وابـوو، مـن وام گوتبـوو، دوای دانپێـداهێنان و هەنـدێك چـاو سـوورکردنەوە ئەو نەرمتر بوو، بەڵام دەیویست لێم دەربێنێ ئەو پەریە کێیە، پەریـی کۆڵانی پشتمانە، یان ئەوەی سەری کۆڵانێ؟ بەوەی بـاش بـوو بیری بۆ پەریـی خـاڵ لە گەردن پەریـی ئاسـمانێ نەدەچـوو، ئەوجـا کـێ بیـری بـۆ ئەوە دەچـوو پەریـی ئاسـمان پەریەکەی مـن بێـت و نـامەی ئەوهاشـی بـۆم نووسـیبێت، کەس بیـری بـۆ ئەو نەدەچـوو، پەریـی گەردن بە خـاڵ دنیـا بـۆی شـێت بووبـوو، ئاوڕیشـی لە کەس نەدەدایەوە، رێـی تێـدەچێ وا وابەسـتەی مـن بێ و لە سـەر سـینەی خـۆی مێوانـداریی مـن بکـات؟ منێـك نە هێنـدە بەر چـاوم، نەهێنـدە تێگەیشـتوو، بە مـن نـاڵێن پەریـی ئاسـمانێ عەشـقی کـوێ و چـی مـن بـووە؟ بەوەی بـاش بـوو بیـری بـۆ هەرچی پەری هەیە دەچوو، بۆ پەریەکەی من نەدەچوو.

ئیدی من بە دیار ژنێکەوەم، لە باوەشی دەخەوم، بەڵام بە هەمیشەیی لەو پەنجەرەیەوە دەڕوانمە کۆڵانێ، لە چاوەڕێی پەری شەو و ڕۆژدەکەمەوە، پەنجەرەکەم هەمیشە ڕووناکە، ئاخر پەری حەزی دەکرد چرای ئەم ژوورە هەمیشە داگیرساو بێت، سوێندم خواردووە تاریکایی سەرتاپای شار داگیربکات، ئەم ژوورە نابێت ڕووناکایی لێ ببڕێت.

گریەی منداڵێك پەیدا بوو، چاوم هەر لە پەنجەرەیە، پێکەنی، کچە سەرپێ کەوت، چاوم هەر لە پەنجەرەیە، برایەکی بوو، ئەویش سەرپێ کەوت...، من باوکم، باوکی...، بەڵام هەر چاوم لە پەنجەرەیە و چاوەڕێی دەرکەوتنی پەریی خاڵ لە گەردنم، پەری هەر دەبێت بێت، من دەبێت بە لای کەمی حەفت پایزێك چاوەڕێی پەری بکەم، کچی بازرگان بەردەوام فشار دەخاتە سەرم کە ئەو خانووە بفرۆشین بچینە جێگەیکیتر، هەر جێگەیەك بێت، زۆر جار هەستدەکەم زگی پێمدەسووتێ، دەیەوێت دڵم بداتەوە بەڵام نازانێ چۆن، ناتوانێ، لەو ساڵانەی چاوەڕوانی فێری خوێندنەوە دەبم، دەبێت فێربم، دەبێت بگەمە ئاستی پەری لە نامەنووسین، لە بیرمە دەمگوت:

+من چۆن بتوانم نامەی جوانی وەك تۆ بنووسم؟

-من هێشتا لە نامە نەگەیشتوومەتە ئەو ئاستەی خۆم دەمەوێ، هێندەش لە خوێندنەوەی چیرۆکان فێربوومە، بخوێنەوە، چیرۆکان بخوێنەوە.

ئەودەمانێ، جگە لە کتێبی قوتابخانە چیدیم نەدەخوێندەوە، هەتا من و پەری هەفتانە نامەمان دەگۆڕیەوە، هیچم نەدەخوێندەوە، لەو رۆژەوەی کچی بازرگان بە دەنگی بەرز نامەکەی پەریی بۆم دەخوێندەوە، من بڕیارم دا هونەری نامە نووسین فێربم، هاتم ئەو چیرۆکانەم دەخوێندەوە کە پەری خوێندبوونیەوە و باسی دەکردن، ئەوەتە وا خەریکە دەبمە خوێنەرێك دەیان نووسەری دنیا بناسم، لە سالآنی چاوەڕوانیی پەری هونەرێك فێردەبم، رەنگە کەمێك بە هانامەوە بێت، رەنگە هونەر، هونەر، فێری زۆر هونەر بم، دەبێت نامەیەك بۆ پەری بنووسم، نامەیەك کەس نەینووسیبێت، نامەیەك ئەگەر پەری بۆ رۆژێکیش منی لە دڵەوە خۆشویستبێت، ئەگەر دایکی حەفت کوڕانیش بێت، ئەگەر لە ناو زیندانێ یان لەوبەری دنیاش بێت، لە شەقی باڵ بداو لەو ژووورە بنیشێتەوە، پەری من چاوەڕێتم، تا رۆژی قیامەت چاوەڕێتم، دڵنیاشم دێیتەوە، من لە سالآنی دابڕان و چاوەڕوانی لەگەڵ هەڵکردنی هەر شنە بایەك هەر کزە بایەك لە گەڵای درەختەکانی ئەم حەوشەیەوە بۆنی قژی پەری مەستم دەکات، قژی پەری لە ناو ئەو گەڵایانەوە زەردەپەڕ دەدا،

لە پرتەقاڵەکانەوە لە سێوەکانەوە لە تاریکایی شەودا گۆنای پەری لە بیناییمدا دەدرەوشێتەوە، لە گوڵە لێویەکانی دارهەنارەوە دەبینم، بەو چاوانەی خۆم دەبینم لێوی پەری دەبینم، لێوی هەمیشە بۆ ماچ پشکوتووی پەری، لێوی هەمیشە تەڕی پەری، دەمێکە دەڕوانمە ئەوینی کۆترەکان، چۆن دەمیان دەخەنە دەمی یەکترەوە، بە یادی پەریەوە سەیری ئەوینی کۆترەکان دەکەم، من ئەویندارییی کۆترم نیشانی پەری دەدا و ئەو بە شەرمەوە پێدەکەنی، ئای پەریی ئاوابوو لە من، لەم پەنجەرەیەوە چاوەڕوانی هەڵاتنی تۆ دەکەم، حەوت پایزی بە یەك گەیشتن چ ساڵانێکی روناك و پڕ هەڵهاتن بوون، حەفتانە تۆ بۆ من هەڵدەهاتی، پەری ئاخ و داخ لەم دابڕانە ساڵە و ساڵە، جارێك تەنیا جارێك رووناکمت نەکردەوە، پەری تۆ ئاگات لێنیە من چۆن لە پەنجەرەوە دەستم بۆ بەفر دەگرمەوە ئەو بەفرەی لە ئێوارەیەکی پرتەقاڵیدا بە سەر دار پرتەقاڵەکەدا باری، بە سەر ماچی یەکەم، بە سەر ئەویندا باری، بە یادی ئەو ئێوارەیەوە من هەمیشە دەستم بۆ بەفر گیانم بۆ بەفر گرتۆتەوە، بباریێ پەری بباریێوە، سپیم بکەوە وەك ئێوارەی یەکەم سپیم بکەوە، پەری چاوێکت لێمبیێ، لە پەنجەرەی چاوەڕوانیەوە، پایز پایز ناو لەپم بۆ یەکەم بارانی پایز دەگرمەوە، بە یادی تۆوە دەبێت یەکەم دڵۆپە بارانی پایز من بیگرمەوە، ببینە پایزان بمبینە دەستم لە پەنجەرەوە لە

منارەی چۆلی درێژترە وا دەگاتە هەور، من لە پێش منارە دڵۆپە باران دەگرمەوە، بە یادی تۆوە پەری بە یادی تۆوە، لە بیرتە لە نامەیەك گوتبووت:

ئەگەر منت زۆر خۆش دەوێت، هەوڵدە یەکەم باران خۆت بیگریتەوە.

پەری ئەودەم من باش تێنەگەیشتم لە گرتنەوەی یەکەم دڵۆپە بارانی پایز، بەڵام ئیدی من بۆ هەمیشە دەبێت یەکەم دڵۆپە بارانی پایزیی خۆم بیگرمەوە، سینەم بۆ بۆ بای وادە بکەمەوە، پەری لەو دابڕانە جاروبار لە ڕێوبانان دوور بە دوور پەریم دیوە، دوور بە دوور بە دوایدا ڕۆیشتووم، بەڵام نەمدەوێرا، ڕووم نەبوو لێی نزیکبکەومەوە، جارێك ئاوڕێکی لێمنەدایەوە، جارێك تیچاوێکی نەدامێ...

دامناوە تا دوایی تەمەن هەر لە ژوورەکەی پەری و لە چاوەڕوانیی پەری بمێنمەوە بەڵام، بەڵام کچی بازرگان ئەها دەستی منداڵەکان دەگرێت:

+بزانە، من تۆم خۆشدەوێ، بەڵام ئیدی لەو خانووە نامێنمەوە، مێرد بە و بابی منداڵان بە و لەگەڵمان وەرە، با سەرگەردان نەبین.

-دێم، بەڵام دەرفەتێکم بدێ.

+ژن هەیە لەو دنیایە لەوە پتر دەرفەت بدا؟

-سەد بارەی دەکەمەوە تا حەفت پایز بە سەر هاتنی تۆ بۆ ئەو ژوورە تێنەپەڕێ من ئێرە چۆلناکەم.

ئای ئەگەر کچی بازرگان دڵی نەرم دەبێ، بۆ هەتایە بە دیار ئەو پەنجەرەیە دەمێنمەوە، من هەر پەری بە ژنی خۆم دادەنێم جگە لە پەری رێ بە خۆم نادەم بە هیچ ژنێك بڵێم ژنەکەم، بۆیە بە دایکی منداڵەکانیشم ناڵێم ژنەکەم و هەر بە کچی بازرگان ناوی دەبەم، بە دایکی هیچ کام لە منداڵەکانیشم بانگی ناکەم، ئاخر ئەو منداڵانەی من دەبوو لە پەری بن، نەك کچی بازرگان، نا من دەستبەرداری ژوورەکەی پەری نابم.

# ١٤

# پەری

شەوێکە، دەڵێن: شار لە سەر ئاو و ئاگرە.

شەوێکە شەوی ترس و دڵەڕاوکێ و موچڕکە، شەوێکە جاشەکەی سەری کۆڵانێ فەرمانڕەوای کۆڵانە و پڕ بە گەرووی هاوار دەکات:

هەر کەسێ لە ماڵێ بێتە دەرێ، هەر کەسێك ماڵەو ماڵ بکات، دەیکەمە قوربانی گوللەیەك، گوێتان لێیە! گوناهی خۆتان لە ملی خۆتان...

ئەو شەوە دەبوو ژنە کەسکپۆشەکە بە سەربکەمەوە، دەبوو خۆم بگەیەنمە بەرمیلی ئاوەکە و بەتاڵی بکەم و چەمەنتۆ تەنکەکەی بنی بشکێنم، وەختی هاتووە، هەر من ئا بابیشم دەیگوت:

ئەو شەو شتێك نەبێت، زەحمەت دەكەوێ و كارەسات دەقەومێ، هەر دەبێت ئەو شەو بگەن و بیقەومێنن.

نەدەبوو بن بەرمیلەكەی ماڵی ژنە كەسكپۆشەكە لای بابم بە نهێنی بمێنێتەوە، دەشترسام ئاشكرای بكەم، دڵنیا نەبووم داخوا لێم تووڕە دەبێت یان دڵخۆش، جاشەكەی سەری كۆڵانێ لە بانگەوازی خۆی ناكەوێت، شەو درەنگە، رادیۆش كە باوكم لە گوێی خۆی ناكاتەوە بە (وا هاتن پێشمەرگێت مە) هێند نزیكی كردوونەتەوە هەر دیتت جاشی سەری كۆلانێیان بە دەست گرت، بە خۆم نەوەستام بابمم تیكردەوە:

+بابە، من تفەنگێكم لە جێگەیەك شاردۆتەوە

-بە راستتە، تفەنگ، لە كوێ؟ ئەدی فیشەك؟

بابم لە خۆشیدا خەنی بوو، خستمیە باوەشی خۆیەوە و نێوچەوانمی ماچ كرد، سێ چوار رۆژ پێشتر كوڕی نەفتفرۆشەكە ئەو تفەنگەی بۆم هێنابوو، رێك ئەو رۆژەی كە لە سەرەوەی پردەكە هەرایەكمان نایەوە و خەریك بوو بە دەستی ئەمنە سمێڵ گەسكەكە تێدا بچین، هەر ئەو رۆژە تفەنگەكەم وەرگرت و كاتێ گۆتمە ژنە كەسكپۆشەكە:

+دەكرێ لە ماڵی ئێوەی بشارمەوە؟ كەس گومان لێرە ناكات.

- بۆ منی لێگەڕێ، لە جێگەیەکی وای دەشارمەوە بە حەفت حکومەت نەبینرێتەوە، جگە لە من و لە تۆ و لە چەتۆ کەس کەس نەیبینێتەوە.

هێشتا سپێدەی نەدابوو، کچ و باب بوونە خاوەن تفەنگێك باب دەیگۆ:

کچم، با من لەشانمی بکەم، گەلەك لەو ئەمن و جاشانە داخ لە دڵم.

کچ دەیگۆ:

نا، بابە، پیاو لەوەتەی هەیە چەکدارە، با من...

لە نێوان کچ و باب مشتومڕێکی خۆشە، کەس نەبوو ئیرمیی بە مشتومڕی ئەوان نەبا، ناکام بابەکە بۆ کچەکەی داهێنا و دڵی نەشکاند، بەڵام گوتی:

با بە نۆرە بێت، قەیناکە.

رۆژی رابوونی شار رۆژێك بوو، سەد بریا جارێکیدی دەمدیتەوە، رۆژێکە لە یادەوەریمدا، لە دڵیِ من ئاوا نابێت، لەو رۆژەدا رابردووی تاڵی من بە توانەوە دەتوانەوە، بەو بەهارە دەتگوت عارەقەن و لە منەوە

تنۆك تنۆك دەڕژێن، دەیانبینم دەڕژێنە سەر پێڵاوەکەم، ئەو ڕۆژە تاڵیی ژیانی من دەتوانەوە هەر لەوەی کە خستمیانە ناو تەشتە ئاوەکەوە و ژنە کەسکپۆشەکە گوتەنی، ژنە سەگسارەکەی کۆڵانی ئەو سەر مووسێکی بە ناسکترین ئەندامی لەشمدا هێنا، لەوێوە تا گەشتی لاقەکردن ئەو شەوەی دوو پیاو بە دوای یەکدا هاتنە ناو ڕانمەوە، تا دەگاتەوە نیوە تێڕاچوونەکەی کوڕی پیاوە مەستەکە، هەموو تاڵیی ژیان لەو ڕۆژەی ڕابوونی شار توانەوە، من ئەو ڕۆژە لە ڕابردووم دابڕام، تاڵیەکانی ڕابردوو نەمان، دیمەنە تاڵەکان ڕەوینەوە، هەر لە پێیە پەڕیوەکەی خوشکترینەوە تا خوێنەکەی سەر دەرگای ماڵی برادەرەکەی بابم و کەوتنی بابم، تا قامچیەکانی زیندان و هەڕەشە و جوێنی ئەمنەکان و لەوێشەوە بۆ سووکایەتیەکانی بازگەکان، دەنگە تاڵەکانی ڕابردوو لە گوێمدا نەمان، هەر لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕناکەی کوڕی پیاوە مەستەکە تا دەگاتەوە دەنگی جاشەکەی سەری کۆڵانێ، من ئەو ڕۆژە هیچم لەو تاڵیانە لەبیر نەما، لەو ڕۆژەدا تا درەنگانی ئەو ڕۆژە ئەوەی لە ڕابردووی من لەگەڵم بوو دارپرتەقاڵی ماڵی پیاوە مەستەکە بوو، بە دوای خۆمەوە جارو بار تارمایی کوڕی پیاوە مەستەکەم دەدیت، هەستمدەکرد بە دوامەوەیە، ئاگای لێمە، چەند جار ئاوڕم دەدایەوە و نەمدەدیت، نازانم بۆ نەمدەدیت، دڵم دەیگوت، کوڕی پیاوە مەستەکە بە دواتەوەیە، لەو کاتەی تەقەشم

کرد، ئا لەو رۆژەدا من تەقەم کرد، یەکەم جارم بوو گوللە بە ئاوەدانیەوە بنێم، لەو کاتەی هاویشتم نزام خوێند:

خودایە، من هاویشتم، بەڵام تۆ کارێك بکە بەر کەس نەکەوێت.

لەو کاتەش هەر لە چاوەڕوانیی ئەو بووم، لە بیرم بێت کاتی خۆی هەر لە دەورو بەری سەفین، لە سەر دەستی نەخشەسازی گەرماو من فێری بەکارهێنانی چەك بووم، تا ئەو کاتەی خوێن لە باسکیشمەوە چۆڕاوگەی بەست و دانیشتم، چاوەڕێ بووم کوڕی پیاوە مەستەکە بمگاتێ و هەڵمگرێتەوە و بمباتە خەستەخانە، نەهات کوڕی پیاوە مەستەکە نەگەیشت، ئەو دەمژمێرەی لە خەستەخانەش بووم هەر چاوەڕێ بووم، لە گەڕانەوەش لە چاوەڕوانیی کوڕی پیاوە مەستەکە نەرم نەرم هەنگاوم دەنا، نازانم بۆچی ئەو رۆژە من هێندە تامەزرۆی بینینی ئەو بووم، ماوەیەکی زۆر بوو نەمدەویست چارەی ببینم، بمزانیایە لە کۆڵانێکە من لەو سەرە کۆڵانە نزیك نەدەبوومەوە، ئەو رۆژە هێندە بۆ بینینی کوڕی پیاوە مەستەکە بە تاسەوە بووم، گەیشتمە ئەوەی بچمە پێش ماڵیان و ئەگەر لە دوورەوەش بێت تەماشایەکی بکەم، دەمگوت: رەنگە ئێستا لە پەنجەرەی دنیاوە تەماشای دنیا بکات، نا، نابێت لە ماڵ بێ.

گەیشتینە بن دوو دارە گەورەکەی سەری ئەو سەری ماڵی کوڕی پیاوە مەستەکە، داربیە بەرزەکە جوان دیارکەوت، باشی هێنا وا دیارە رێی گەڕانەوەمان دەکەوێتە کۆڵانی ئەوان، ئێمە شەش حەوت کەسێك بووین، بابم و ژنە کەسکپۆشەکە و قومری و کوڕی نەفتفرۆشەکە و کوڕە دەستگێڕەکە.

هەر بابا بوو پاتارێکی بە دەستەوە بوو، لە سەر شانی بوو، بابم گوتی:

وا دیارە هێزی پاتار لە زیاد بووندایە.

کوڕی نەفتفرۆشەکە گوتی:

ترسناکە، ئەو هێزە زۆر ترسناکە.

بابم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

ئاکامەکەی باش نابینم، شار ئەو هەموو دزەی لە کوێ بوو؟

ژنە کەسکپۆشەکە گوتی:

قەیناکە ماڵی حکومەتە با بیبەن.

من گوتم:

نا، ئەوانە ماڵی میللەتن، ئەها ئەو قوتابخانەیە وا تالآن دەکەن.

ژنە کەسکپۆشەکە، پەشیمانبۆوە:

تۆ راست دەکەیت، نابێت ئەو شوێنانە تالآن بکرێن.

هێشتا هەر لە نزیکی دوو درەختە گەورەکەین و تەماشای هێزی پاتار دەکەین کە لە زیاد بووندایە، رێك لە بەر دەم ئەو قوتابخانەیەی کە شەش ساڵی سەرەتایی ماڵی دووەمی من بوو، لەو دەمە چیم دیت! باوەڕم بە چاوی خۆم نەکرد، رووم وەرگێڕا تا جوانی نەبینم، بەڵام دەبوو تەماشای بکەمەوە تا دڵنیا بم هەوە یان نا، ئاخر لە دنیایێ هەندێك کەس لە سیمادا زۆر لە یەك دەچن، جوانتر تەماشام کرد، هێندە لێم دوور نەبوو، نا لە دنیایێ کەس بەو ناچێت، کەس بە کوڕی پیاوە مەستەکە ناچێت، هەو بوو خۆزیا ئەو نەدەبوو، نا، باش بوو خۆی بوو، ئەویش چووە رێزی هێزی پاتاڵەوە، لە قوتابخانەکەی من و خۆی پاتاڵی دەکێشایەوە، نەمویست بابم بیبینێت، پتر خەفەتی دەخوارد، وا بزانم قومریش نەیدیت، کەس نەیدیت، بە بینینی پاتار لە سەر پشتی کوڕی

پیاوە مەستە دارپرتەقاڵەکەش لە یادەوەریمدا نەما، بە تەواوی دابڕام لە حەوشەی ماڵی پیاوە مەستەکە.

پێشەوەی بچەمەوە ماڵێ، سەرم لە خوشکترین خوشک دا، گریا خوشکترین خوشك بە کول گریا، هەرگیز بەو شێوەیەم نەدیوە، ئەوەدەمەی هەواڵی برینەوەی پێیەکیشی پێگەیشت ئەوها نەگریا، خوشکترین گریا، لە ئامێزی خۆمم گرت، ماچبارانم کرد، درەنگ هاتە قسە:

+پەری، من بۆ پێیەکەم دەگریم، چەند خۆش بوو، ئێستا بە دوو پێوە بە شەقامەکاندا بگەڕێم، پەری باش بوو هاتی، پەری تۆ لە مێژە بزری، پەری ئەوها نابێت...

-لەمەودوا زوو زوو سەردانت دەکەم، بەڵام دەبێت تۆش بگەڕێیت، چەندانی وەك تۆ وا لە جادەکاندا پیاسە دەکەن.

+واز لەوە بێنە، چەند بارەیە.

-باشە، تۆ هەمیشە خوشکترینی، خۆزگە لە زۆر شت بە قسەی تۆم دەکرد.

+وەك چی؟

-کوڕی پیاوە مەستەکە پانکە و شتی قوتابخانەی دزی.

+پەری تۆ شایانی پیاوێکی گەورەی، گەورە بە قەد خۆت.

ئەو پیاوە کێیە؟ لە کوێی ببینمەوە؟ من بێ خۆشەویستی چۆن دەتوانم مێرد بکەم؟ بڕواناکەم توانای عاشقبوونەوە تێدا مابێت.

کاتێ گەیشتمەوە ماڵێ، چووم هەرچی نامەی حەفت پایزەی کوڕی پیاوە مەستەکەیە هێنامن و بردمنە پێش دەرگای گەرماوەکە، کەس چاوی لێنەبوو، دنکە شخاتەیەکم لێدا، فووێك کوژاندیەوە، دنکێکیدی فووێکیدی، دنکی سێیەم، فووی سێیەمی بە دوادا هات، پێکەنینم بە خۆم هات، باشە بۆچی دەستم نەچووە سووتاندنی نامەکان، نەمزانی بۆ.

رۆژێك نەخشەسازی گەرماو هاتە ماڵمان، هێشتا ژنە کەسکپۆشەکە گۆتەنی:

سەردەمی ئاین گۆڕین نەهاتبووە گۆڕێ.

هەر لە سەر ئایینی خۆی بوو، نەچووبووە سەر ئایینی بابم، یەکەم شتێك کە قسەمان لێیەوە کرد گەرماوەکە بوو:

- به مـن بڵـێ، ئەو رۆژەی گیـرای، کاغەزەکـانی بـن مەنـجەڵە ساردەکە چیان لێهات؟ بۆچی لەوێ نەمابوون؟ کێ شاردنیەوە؟

+تۆ چوزانی لەوێ نەمابوون، بابم ئاگری دابوون.

نەخشە سازی گەرماو چاوی لە سەرم هەڵنەدەگرت، دەتگوت یەکەم جارە دەمبینـێ و نیـازی داخـوازیمی هەیە، ترسـام بە هەڵەدا رۆیشـتنێك هەبێت، خۆم لێی شاردەوە، پاش ماوەیەك لە بارەگا سەرەکیەکە دیتمەوە، دوای پێشەکیەکی دوورو درێژ، منـی بردە ڕاڕەوەکە، بە دەم پیاسەکردنەوە گوتی:

+مـن تـۆم بـۆ پۆسـتێکی زۆر بەرز دەستنیشـانکردووە، پۆسـتێك شایەنی خەبات و لێهاتوویی تۆ بێت، لە ژنان کەس لە تۆ بە شایەستەتر نازانم بۆ ئەو جێگەیە( ناوی پۆستەکەشی گوت)

-با بزانم، چۆن دەبێت.

+بزانمی بۆ چیە؟

-من...

نەیهێشت هیچ بڵێم، دەنگی نزمکردەوە و گوتی:

+پەری، دەمەوێ هەندێك قسەیتر بكەین كە بەلای منەوە زۆر گرنگن، ئەگەر ئامادەی گوێم لێبگری هەتا بیانلێم.

-بیانکە، کێشەیەك نیە.

+من زانیومە کە تۆ وەختانێك کوڕێکت خۆشدەویست، بەڵام ماوەیەکە وازت لێهێناوە، ئەوە راستە؟

سەیر بوو، ئەو ئەوەی لە کوێ زانی، من لای خۆمەوە پێموابوو جگە لە سێ چوار کەس، کەس بە نێوانی من و کوڕی پیاوە مەستەکە نازانێت، رەنگە بە شلەژاویەوە گوتبێتم:

-بۆچی ئەو پرسیارە دەکەیت؟ دوایی کێ دەڵێ من کەسێکم خۆشویستووە!

+پێویست بە خۆ تێکدان ناکات، من پرسیارێکم کرد تۆ ئازادی وەڵام نەدەیتەوە.

-...

+پەری با راستو رەوان پێتبلێم من تۆم خۆشدەوێت و دەمەوێت بێمە داخوازیت.

-تۆ برا گەورەی منی، برا چۆتە داخوازیی خوشك!

+تۆ واز لەو خوشك و برایەتیە بێنە، ئەوە پێشتر بوو ئێستا من...

-من خوشك و برایەتی دەگەیەنمە سەر.

+بە راستتە؟

-زۆر بە راستمە، من هەمیشە وەك برایەك تەماشای تۆم کردووە و دەکەم.

+پەری، ئەوها نابێت..

-یانی چی ئەوها...

+پەری تۆ لە بیرت ماوە سێ شەو لە بن دەستی ئەمن بوویت، هەموو کەس...

-من هەمیشە شانازی بەو سێ شەوەی زیندانەوە دەکەم.

+ئێ، قەیناکە، بەڵام خۆ خۆشەویستەکەشت بە هۆی ئەو سێ شەوەوە وازی لێت هێنا.

-درۆیە، تۆ درۆی گەورە دەکەیت.

+من درۆ دەکەم؟

-تۆ و ئەوانەی وەك تۆش تێیگەیشتوون.

نەخشەسازی گەرماو بە تووڕەیی رۆیشتە ژوورەکەی خۆیەوە و منیش لەو تووڕەتر لە بارەگاکە هاتمە دەرەوە، هێشتا هەر لە سەر دەرگا بووم، سوێندم خوارد چاوم بەو بارەگایە نەکەوێتەوە، هەر لە پێش بارەگاکە یەکێك لە چەقۆکێشەکانی گڵکەند کە هێندەم دیتبوو وەك ناسیاری لێهاتبوو، بەرەو بارەگا دەچوو، دیار بوو لە رووخسارم تووڕەیی دیتبوو، گوتی:

+خوشکێ ئەوە چ قاچەبابێك تووڕەی کردووی؟

-کەس، هیچ نیە.

+ئاخر ئەگەر کەسێك لە بارەگا گێچەڵی پێکردووی، هەتا شەش چەقۆی لێدەم.

-سوپاس، چ نیە.

+باشە، بە خێر چی .

لە ڕێگــا لە وێســتەگەیەکی پــاس کوڕێــك ڕاوەســتابوو، ئەو وێستگەیەی دەکەوێتە نزیك باخەکە لە خۆوە حەزی تەماشاکردن چووە دڵمەوە، هەرگیز من ئەوها نەبوومە، بە دڵی خۆم لێیم ڕوانی، بەڵام ئەو کە دیتی تەماشای دەکەم، سەری خۆی داخست، من پتر تەماشامکرد، ئەو پتر سەری خۆی داخست، کە دواتر ئەمەم بۆ خوشکترین گێڕایەوە گوتی:

سەیرە کوڕێك هەبێت لەو دنیایە لە ئاست خاڵی گەردنی پەری چاو داخات، هەبێت نەبێت ئەو کوڕە شێتە.

باش بوو پاسەکە گەیشت و کوڕە لە نیگاکانی من ڕزگاری بوو، بڕواناکەم ڕزگاری ببێت.

پاش ماوەیەك زانیم ئەو پۆستەی نەخشەسازی گەرماو بۆ منی دیاریکردبوو درایە ئەو بەڕێوەبەرەی کە کاتی خۆی لە قوتابخانە وازی لێمنەدەهێنــا دەیویســت بە زۆر بمکــاتە بەعســی، هێنــدەی نەبــرد، نەخشەسازی گەرماو ئایینەکەی گۆڕی و هەڵکشا، زۆر هەڵکشا، کە بەرێیەکــدا دەڕۆیــی لەبەر چەکــدار ڕێ نەبــوو، ڕۆژێــك بە دنیــایەك چەکـدارەوە هــاتە ماڵمــان، جاشــەکەی ســەری کــۆڵانێش یەکێــك بــوو

لەپاسەوانەکانی، کوڕە دەستگیڕەکەش پاسەوانی بوو، مـن بە خێرهاتنیـانم نەکرد، گوێم لێبوو بە پێکەنینەوە بە بابمی گوت:

+هەر دەتگوت دێیتە سەر ئایینی من، ئەوە هاتم.

بابیشم بە پێکەنینەوە گوتی:

-بە خێرهاتی، بەڵام وا بزانم من و کچەکەم بێ ئایین ماوینەتەوە.

+کچەکەت هـی ئەومیە پلە وەرنەگرێت! مـن ئامـادەم بـیگەیەنمە پلەی وەزیری، تەنها ئەو هێندە لامل نەبێت.

-لێگەڕێ، کچی مـن بە لاملیەوە رێکە، وەك مـن بزانم، کچـی مـن هیچ پلەیەکی ناوێ.

بابم راستی گۆ من پلەم نەویست.

لەو سەرو بەندە ناوە ناوە بە دزیـی کۆلانی پیاوە مەستەکە سـەرم لە خوشـترین دەدا، ئەو لە ژوورەکەی خـۆی نەدەهـاتە خـوارەوە بە دیـار پەنجەرەوە دەتگوت کۆتری باڵ بەستراوە، مـن هەمیشە پشت لە پەنجەرە دادەنیشـتم و نەمدەویسـت پەنـجەرەی دنیـا ببیـنم، ئەومـاوەیە سـەرم بـۆ پەنجەرەی دنیا هەڵنەدەبڕی، کوڕی پیاوە مەستەکە هێندە کال ببووەوە

هێنـدە کـاڵ لە بەر چاویشـم بـا نەمـدەدیت، نەمویسـتووە نە بمبینـێ نە ببینم، لەو ماوەیە تەنها جارێك دیتم ئەویش چ دیتن.

ئێوارەیەك لە سەر نانخواردن بووین، دیتم پیاوێك لە تەلەفزیـۆن قسـە دەکـات، ئـای دەڵێـی هەوە، هەوبـوو، هەنـدێك دەنگـم دایە تەلەفزیـۆنەکە، دیـاربوو دوا رسـتەکانی دەگـوت، شـتێکی ئەوتـۆی تێنەگەیشـتم هێنـدە نەبێـت بە نـاوی راوێژکـار لە وەزارەتێـك قسـەی دەکـرد، بابیشـم دیتـی و گوتی:

+وا بزانم بۆتە راوێژکار، پێمخۆش بوو، کوڕێکی باش و دەستپاکە.

-بابە ئەو رۆژگارە زۆر سەیرە، خەڵك ئاسان دەگۆڕێ.

+راستە سەیرە، دەزانی کوڕی نەفتفرۆشەکەم ئەورۆ لە کوێ دیت؟

- لە کوێیە؟ دەمێکە نایبینم.

+خۆزی منیش نەمدەدیت، لە ناو تەڕەفرۆشان کەچە عارەبانەیەکی داناوە، منی دیت، شەرمی کرد....

سبەی چێشتانێ گەیشتمە ناو تەڕە فرۆشانی سەر پردەکە، دیتمەوە کوڕی نەفتفرۆشەکەم دیتەوە، بە تەنیشت ئەو تەڕەفرۆشەوە بوو کە کاتی

خۆی نامەیەکی لە سەر تاروو بۆم نووسیبوو، لە گەرمەی دەردەدڵ کردن بووین بۆ یەکتر، پۆلیسەکە ئەوەی پێش رۆژی رابوونیش هەر ئەوە پیشەی بوو گەیشت و تەرازووەکەی کوڕی نەفتفرۆشی برد بە چ حاڵ بۆم وەرگرتەوە، لە بیرمە گوتی:

+دڵگران مەبە، ئەوەی دەیکەیت مەرج نیە بۆ خۆت بێت.

-حەیف، با وابێت، منیش وەك تۆ بیردەکەمەوە.

لە گەڕانەوەم سەردانی خوشکترینم کرد، هەر پشتم لە پەنجەرەکە کرد، دیسانەوە باسی کوڕەکەی وێستگەی پاسم بۆی کرد، لەگینە ئەوە جاری سێیەم بووبێ کە ئەو باسە بێنمە گۆڕێ، خوشکترین گوتی:

+چاوەڕێی بارینی بەفرێکم، بەفرێك زۆر جیا لە بەفری پێشی، بەفرێك...

-من رۆیشتم هیچم بە بەرەوە نەماوە، بەرگەی هیچ بەفرێك ناگرم.

+تۆ، من چەند تۆ دەناسم خۆزگە خۆت نیو هێندە خۆت ناسیبا، ئێ، دڵم دەڵێ ئەو کوڕە دەبینیەوە.

-بیبینمەوە، کوڕێك بە ڕێکەوت لە جێگەیەك دیتم، ئێستا بشیبینمەوە نایناسمەوە، دەیبینمەوە؟

+نازانم، دڵم وا دەڵێ.

-زانیت بۆتە راوێژکاری...

+پەری، باش بوو تێکچوون، دەنا ئێستا تۆ خانمی راوێژکاری پانکە دز بوویت.

مالاواییم لە خوشکترین کرد، چەندی کردم ڕێی ماڵێم دانەگرت، هێزێك لە پشتەوە رایدەکێشام، گەڕامەوە، بڕۆ بڕۆ نەمدەزانی نیازی کوێم هەیە، هێزێکی نادیار رایدەکێشام، منیش خۆم بۆی شل کرد و بە دوایدا چووم، هێندەم دیت لە شەقامەکەی نزیك باخم، وا لە وێستگەی پاسەکە نزیکدەبمەوە، ئای! ئەوە کوڕەکەی گۆرین نیە؟

دەڵێی هەوە، نا، خۆ من نایناسمەوە، رەنگە بیناسمەوە، ئەویش کتێبێکی بە دەستەوە بوو، با، تەماشای بکەم بزانم، چاوم لە رووخساری بڕی، چاوی داخست، سەری داخست، ڕێك وەك جاری پێشی، من چاوم لە سەری هەڵنەگرت، باشە من شێتم بۆچی وا لەو کوڕە بەستەزمانە دەکەم، ئەوەتە وا ئارەقە دەکات، لە شەرما دەتوێتەوە، نا، تا سەر بەرز

نەکاتەوە چاوم لە سەری هەڵناگرم، پتر لێی نزیککەوتمەوە، هێندەم زانی دوو چاوی گەش گەشتر لە هەموو ئەو چاوانەی دیومن، زۆر گەشتر لە چاوی کوڕی پیاوە مەستەکە ڕۆژ ئاسا هەڵهاتن، هەستم بە گەرمایی کرد، گەرمتر، تەواو گەرم داهاتم، خۆم ڕانەگرت، چاوم داخست و رووم وەرسووڕاند و بە نیوە هەڵاتن هەڵاتم.

کاتێک هەڵاتنەکەم بۆ قومریش گێڕایەوە، بە زمانە شیرینەکەی خۆی و تێکەڵ لە پێکەنین زۆری برد هەتا ئەو چەند وشەیەی گۆکرد:

پەری، ئەو جارە منیش لەگەڵ خۆت ببە بۆ وێستگەی ئەوین، ئەگەر تۆ هەڵاتی من لای دەمێنمەوە.

# ١٥

# بابی ماچ

درەختە گولاویەکەی گڵکەند درەختێکە کەس نیە رێی بەوێ کەوتبێت و لە سێبەرەکەیدا هەناسەیەکی نەدابێت، هەستیپێکردبێت یان نا، یەك بەسینەی خۆی گولاوی هەڵنەمژیبێت، درەختێکی گولاویە، چوار وەرزەی ساڵ گولاویە و گەڵا گەڵا بۆن و بەرامە دەپژێنێ، لە وەرزی وەرینیشدا هەر گولاویە، کەس نازانێت گولاوی درەختە گولاویەکە لە دەستی کێیە، کێ ئەو درەختەی بۆ هەمیشەیی لە گولاو گرتووە، هەر کەسە و قسەی خۆی هەیە، شێتە جیاوازەکە دەڵێت:

ئێوە نابینن، بایەك دێت، لە چ بایێ ناچێ، نە بای وەشتە، نە وادەیە نە شەماڵ... من بە چاوی خۆم دەیبینم، جگە لە من کەس نایبینێت، پێش رۆژهەڵات بێرەدا ئەها بەو کەلێنەدا دێت، من دەیبینم، بۆنی دەکەم، دێت دێت، دەچێتە ناو ئەو درەختە و بزر دەبێت، ئەو بایە

هەموو رۆژێك هەڵدەکات، هەموو رۆژێك ئەو وەختە دێت، ئێوە نایبینن، جگە لە من کەس نایبینێت.

بەڵام دارا کە هەمیشە شووشەیێ بادەی بە دەستەوەیە، زوو زوو دەیڵێتەوە:

باوەڕی پێمەکەن، ئەو شێتە لە تەمەنی خۆی یەك فڕ بادەی نەخواردۆتەوە، بۆیە باوەڕی پێمەکەن، درۆ دەکات، من دەزانم ئەو درەختە گوڵاو لە دەستی کێ وەردەگرێت و گەڵاو لقەکانی پێ گوڵاوپڕژێن دەکات، ئەگەر دەتانەوێت بزانن ئەو دەستە دەستی کێیە، وەرن بۆنی دەستی من بکەن، من هەموو درەنگانی ئێوارەیەك ئەو دەمەی جەنگۆش لێرە نامێنێتەوە، بەو دەستانەی خۆم یەك بوتڵ گوڵاو بەو درەختەدا دەپڕژێنم.

جەنگۆش کە ناوە ناوە چەقۆ دەسك رەشەکەی دەردێنێ و پیشانی خەڵکی دەدا، زۆر کەس لێیان بیستووە:

لەو گڵکەندە لە دارا درۆزنترم نەدیوە، ئێواران قەت من لە پێش ئەو ئێرەم بەجێنەهێشتووە، کەس هێندەی من شارەزای ئەو باخەو ئەو درەختە گوڵاویە نیە، ئەگەر رێ لە چەند کچێك بگرم و نەهێلم بێنە ئەو باخەوە

و لەو درەختە نزیکببنەوە، ئەوجا با درەخت بۆنی گولاو بدا، من بە چاوی خۆم دەبینم، ئەو کچانە ناوە ناوە دێن و لە بن درەختەکە شووشە شووشە گولاو دەشکێنن، ئەگەر باوەڕیش ناکەن، وەرن ببینن، ئەو هەموو وردە شووشەیە ببینن.

هەرچی پیاوە سپیپۆشەکەیە ئەو پیاوەی لە چلەی هاوینێش دەڵێی لە زستانێ هاتۆتەوە، دەڵێ:

جەنگۆ تەنها چەقۆناسە، چ لە شووشان نازانێت، ئەو وردە شووشانە، شووشەی گولاو نین، هی عارەقخۆرەکەن، گولاوی گەڵای ئەو درەختەش هەمووی لە گیرفانی منە، وەرن ببینن.

هەموو کەس گولاو لە درەختە گولاویەکەی باخ وەردەگرن، بەڵام کەس نازانێت درەختەکە لە کێ گولاو وەردەگرێت، دەمەو عەسرانێك لە نزیك درەختە گولاویەکە دوو کچ بە لەنجەولار لە پێشمەوە دەڕۆیشتن، بە دەنگێ بەرز قسەیاندەکرد، دیاربوو قسەیان لە بارەی درەختی گولاویەوەیە، گوێم دانێ، یەکیان دەیگوت:

من دڵنیام چۆلەکەکان، باڵندەکان گولاو بە گەڵاکاندا دەپژێنن، ئەو درەختە بە باڵی باڵندە نەبێ ئەو هەموو بۆن و بەرامەیەی لەوکوێ بوو،

باڵنـدەکان لە هەمـوو لایەکەوە گـوڵاو بـۆ ئەو درەخـتە دەکێشـنەوە، ئەو چیرۆکە زۆر ناسکە من زۆریم لە بارەیەوە بیستووە دەڵێن...

ئەو کـچە بە دەنگێکـی هێنـد ناسـك چیرۆکـی باڵنـدە و گـوڵاو و درەختـی دەگێـڕایەوە هـی ئەوە نەبـوو لە دوایـان بـبمەوە، رایانکێشـام، بە کەزی خۆی رایکێشام ئەوەی چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە دەتگوت زەردەپەڕ بە سەر شانیەوەیە، زەردەپەڕ کێشی کردم، لە زەردەپەڕدا بزربووم، زەردەپەر لە بیری بردمەوە گوێ لە چیرۆکی درەختەکە بگرم، لەگەڵیدا بڕۆم و بزانم دەگاتە کوێ.

ئیـدی لەو رۆژەوە پتـر هـۆگری درەخـتە گـوڵاویەکەم، بەرم نەدەدا، باخەوانەکە دەیگوت:

تۆ لە من پتر لێرەی.

گوێم لە مۆسیقای باڵندەکان رادەگرت، درەخت نیە لە دنیایێ هێنده باڵنده بگرێت، کەس نازانێت ئەو درەختە مـاڵی چەند جۆری باڵندەیە، رەنگە لە هەموو دنیاوە باڵندە روو لەم درەختە بـکەن و گـوڵاوی وڵاتـانی بـۆ بکێشـنەوە، لەو درەخـتەوە باڵنـدە بە هەمـوو زمانێـك دەخـوێنن، خوێنـدنێکی هێنـد نەرم و ناسـك بێـزار نابیـت، خەو دەتبـاتەوە، درەخـتە

گـولاویە مۆسـیقیەکە هێنـدە گەورەیە لە نیـوەڕۆی چـلەی هـاوینێ گەڕەکیك لە بنی دانیشن کەس هەتاوی پێناکەوێت، هێند چڕوپڕە، بڕۆ بنی و هەورێك بارانی لە سەر راگرە تەڕ نابیت، ئەو درەختە وەك دەڵێن هێنـدەی دارسـتانێك گەڵای پێـوەیە، هێنـدەی گەڵاکانیشـی باڵنـدەی گرتووە، هێندەی باڵندەکانیشی شووشە گولاوی لە خۆی داوە، کەم نـین ئەوانەی لە بـن ئەو درەخـتە چیرۆکیـان هەیە، مـنیش چیـرۆکم هەیە، لە مێـژە زۆر لە مێـژە لەو بـن درەخـتە دەنگـانی ئێـوارەیەك بـۆ یەکەم جـار چەقۆیەك رۆچووە رانمەوە و رەنگە لەو کـاتە تەماشـای کچێکم کردبێت، چەندی بە بیری خۆم دێنمەوە چ کچم لێوە دیار نەبوو، هێنـدەی بەرانێك خوێنم لەبەر رۆیی، من کەسم نەدیت، یەك رستەم بیست و تەواو:

تەماشای ئەو کچە دەکەیت!

چاوم لە سەر هیچ کچێك نەبوو، بەڵام بە گۆتەی گۆتیاری:

ئەو چەقۆیەی رۆچووە رانی تۆوە، چەقۆ دەسـك رەشـەکەی جەنگۆ بوو.

کەچی جەنگۆ لە ترسان نا، لە ئازایەتی حاشای کرد و گوتی:

من لە تەمەنی خۆم لە ناخافڵەتی چەقۆم رانەوەشاندووە و راشیناوەشێنم، من بە ئاشکرا، بە ئاگادارکردنەوە چەقۆ دەوەشێنم، خۆ ئەگەر کەسێك چەقۆی لانەبێ من بمەوێ بەر چەقۆی بدەم، ئەوەتە چەقۆیەکی زیادەم پێیە لە چەقۆکەی خۆشم باشترە، چەقۆکەی دەدەمێ.

لەمێژە زۆر لە مێژە، هەر لە بن درەختی گولاوی بۆ یەکەم جار هەناری کچم بە رووتی و لە ناو لێوان دیت، هەینێ هەر لە سێبەری درەختی گولاوی بە لای رۆژئاوایەوە هەندێ بنە داری کورتە بنەی سەر قژن سەریان بە یەکتر کردبوو، دەتگوت تایبەت بۆ دەستلەملانێی ئەویندارا‌ن پەنایان درووستکردووە، چێشتانێکی زوو بوو، دیتم لە نزیکەوە دیتم، ئەوان ئاگایان لە من نەبوو، کچ و کوڕێك بە دانیشتنەوە دەمیان خستبووە دەمی یەکترەوە، دیتم بەو چاوانەی خۆم دیتم کچەکە بە دەستی خۆی هەناری خۆی دەرهێنا، جاری یەکەممە ببینم، جاری یەکەمم بوو راموو‌سان ببینم، دیتم کچەکە چووە سەر کۆشی کوڕەکە لەو دەمە لە پشتمەوە گوێم لە پێکەنینێ بوو، چ پێکەنین! نەبووە نابێتەوە، ئاوڕم دایەوە دوو کچ لە پشتمەوە بوون، بەڵام لە گەڕانەوەدا بوون روویانم نەدیت، ئیدی لە تەماشاکردنی ناسکترین دیمەنیان کردم.

لەمێژە زۆر لە مێژە دەمەو نیوەڕۆیەکی گەلاوێژی بوو، یان لە گەلاوێژی دەچوو، لە بن درەختی گوڵاوی بە بێباکی مژم لە جگەرە دەدا، تازە فێری جگەرەکێشان ببووم، دووکەڵم بۆ چۆلەکەکان دەنارد ئەوانیش جریوەیان بە سەرمدا دەباراند، بێباکانەتریش ناوە ناوە قومێکم لەو دەبە بیبسیە دەدا کە لەگەڵ ویسکی تێکەڵەیەکی نیواونیویان گرتبۆوە، رەنگە لە خەیاڵێکی ناسکی چۆلەکە و گەلایی بووبم، دوو پۆلیس، ئای بۆ ئەو رۆژەی بۆ گاڵتەپێکردنیش پۆلیسێکت نەدەدیت، گەیشتنە سەرم:

+تۆ شەرمت بە خۆت نیە بەو رەمەزانە جگەرە دەکێشی، موسڵمان نیت؟

- نا، مەسیحیی عەنکاوەم.

+مەسیحی رووسیاش بیت، نابێت لە رەمەزانان جگەرە بکێشیت، کوا ناسنامەکەت؟

ئۆی لێم قەوما، من ئەو درۆیەم بۆ کرد، مەسیحی چی و عەنکاوەی چی، لەو دەمەی دەستم لە گیرفان دەگێڕا، یەکیان کە پیلێکی گرتبووم، گوتی:

+دەڵێی بۆنێکی خۆشیشت لێدێ؟

-بۆنی چی، جگەرە بۆنی خۆشە؟

+جگەرە؟

چیم بەسەرهات، خۆزگە هەر جگەرە دەبوو، یادەشی هاتە سەریێ، ئاشکرابووم، قسەیەکم نەکرد خۆم دا بەدەستەوە، پێش خۆیانیان دام، هێشتا هەر لە سێبەری درەختەکە بووین، لە پشتەوە گوێم لە دەنگی ژنێك بوو:

+ئەریێ من هەر جارێك بێمە ئێرە دەبینم ئێوە کەسێکتان دەسگیرکردووە، بۆچی؟

- ئەو سەرسەریە بەو مانگی رەمەزانە جگەرە دەکێشێ و عەرەقیش دەخواتەوە

+باشترە بیدەنە دەست خودا، با ئەو تۆڵەی لێبکاتەوە، وانیە؟

من هێشتا ئاورم نەداوەتەوە بزانم ئەو ژنە کێیە بەو شێوەیە بەرگریم لێدەکات، هەر نەشمدەتوانی ئاوڕ بدەمەوە بە شێوەیەك منیان گرتبوو ئاوڕدانەوە ئاسان نەبوو، پێدەچوو یەکێك لە پۆلیسەکان بناسێت، ئا ناوی هێنا، ئەو پۆلیسەی ژنەکە ناوی هێنا، بە توورەییەوە بە منی گوت:

+ئەو جارە لەبەر خاتری ئەو کچە بەرەلات دەکەم، بەڵام تا رەمەزان تەواو دەبێت، لێرە نەتبینمەوە.

- باشە

ئاوڕمدایەوە تا رووی ئەو کچە فریشتەییە ببینم نەمدیت، زوو پشتیان تێکردم، دوو کچی بەژن زراف بوون، ویستم بچمە دوایان لەبەر پۆلیسەکان نەموێرا.

هەر لەو بن درەختە گوڵاویە مۆسیقیە بۆ یەکەم جار لە تەمەنم لە تەوقەیەکی پایزیانە دەستی کچێکم کەمێك گوشی، نەترسام و گوشیم، نەمدەزانی هێندە ئازام، من لەگەڵ کچەکەی ناو رۆمانەکە پیاسەم دەکرد و لە بن درەختی گوڵاوی نەمابووم، لە پڕ هەستمکرد کەسێك لە بەر دەممە، ویستم لە پیاسەی خۆم نەکەوم و خۆمی لێ لادەم، لە خۆ لاداندا لە رۆمانەکە هاتمە دەرەوە و گەیشتمەوە بن درەختەکە.

سەرم هەڵبڕی چ ببینم، ئەوەی من دیتم هەر خۆم بیبینم و کەس، نۆی، ئەوە کێیە، ئەو کچەیە کە ئەو جارە لە وێستگەی پاسەکە ئەوەی ئەها لەو پشت پەرژینەی باخە، چاوی لە چاوم بڕیبوو، هەوە دەیناسمەوە بە خاڵەکەی گەردنی دەیناسمەوە، بە لەرزینەوە هەستامەوە، ئەوەتە روو

بە روو تەماشای یەکتر دەکەین، دەڵێی ناسیاری کۆنین، ماوەیەکە یەکتریمان نەدیوە، ئۆی لەو چاوە گەشە تیژانە، خۆم پێڕانەگیرا چاوم داخست.

+تۆ... حەزمکرد بتناسم.

-خخخخخخۆششحاڵم..

+من ناوم پەرییە، دەمێکە ناوی تۆم بیستووە.

- تۆ پەری! ئەو پەریەی کە...

+رەنگە، ئەو پەریە بم کە تۆ دەتەوێت باسی بکەیت.

خۆی دەستی تەوقەی هێنا، من زێدەڕۆییم کرد، کەمێکم گوشی، ئەو دەستی نەکێشایەوە، من پترم گوشی ئۆی، دەستی کچ ئەو گەرماییەی تێدایە، لەو دەستەوە هەرچی گەرمایی لەشولاری هەبوو دەڕژایە گیانمەوە، چەند خۆش دەبوو ئەو دەستگوشینە بێ کۆتایی با، لەو دەمە باران دایکرد بارانی پایز بە سەر درەختی گوڵاویدا دایکرد، بە سەر یەکەم دەستگوشینی مندا دایکرد، بە سەر چوارشەمەدا دایکرد، ئەو پەریە لە کوێوە هاتە بن درەختی گوڵاوی، ئەو پەریە من دەمێکە ناویم بیستووە، سیماشی بە من نامۆ نیە، نازانم نە زۆر بۆمیان باس

کـردووە نە لە جێگەیتـر بینیـومە، نـا، مـن ئەو پەریەم زۆر دیـوە، هەر ئەوجـارەی وێسـتگەی پاسـەکە نـا، دەبێـت پێشـتریش بینیبێـتم، ئیـدی درەختـی گـوڵاوی بـۆ مـن بـووە درەختـی دیـدار، دیـداری پەری، شـەش جـاریتریش دیـتمەوە، زۆر جـار قومریشـی لەگەڵ دەهـات، لە دیـداری شەشەم پەری ژنێکی لەگەڵ بوو، چ ژن هی ئەوە بوو خەسووت بێت، بە شەرمەوە گوتمە پەری:

ناکا ئەوە خەسووم بێت؟

ژنە لە جیاتی پەری بە گفتێکی شیرین گوتی:

لە خەسوو زیاترم.

پەری بە پێکەنینەوە گوتی:

لە دایکمـم خۆشتردەوێت، تـۆش هەر بە (ژنە کەسکپۆشـەکە) بیناسـە، هەموو گەڕەك بەو ناوە دەیناسن.

لە دڵەوە گوتم:

من لەمڕۆوە دایکم هەیە و ناوی ژنە کەسکپۆشەکەیە.

تەوقەیەکی گەرمم لەگەڵ ژنە کەسکپۆشەکە کرد، هەند جوان دەستمی گوشی هەستمکرد دەستم لە ناو دەستی دایکمدایە، ئەو دایکەی حەیف لە خەونی شەوانیش نەمدیوە، بەڵام پەری تەوقەی نەکرد، بۆ تەوقە و دەستگوشین، پەری خۆی دەپاراست و نەیدەویست دەستم بەر دەستی بکەوێت، دیدار لە دوای دیدار من و پەری پتر لێکدی نزیکدەبووینەوە، لە دیداری حەفتەم زۆر شت بڕایەوە، بەڵام لای پەری (ئەگەر) ی تێکەوت، من هێندە گرنگیم بەو ئەگەرە نەدا، هەر لە دیداری حەفتەم کە درێژترین دیدارمان بوو، باشترە بڵێم دوو دیدار بوو لە ناو یەکتردا، ئەو دیدارەی ناسکترین ژوانمان بوو، پەری هەندێك چیرۆکی خۆی و درەختی گوڵاویی گێڕایەوە:

+پێشان لێرە چەقۆکێشێك هەبوو ناوەکەیم لە یاد نیە، نا، جەنگۆ نەبوو، بە بێ ئەوەی ئاگام لە هیچ بێت، لە سەر من چەند گەنجێکی بەر چەقۆ داوە.

-وا مەڵێ.

+بە راستمە.

-لە رانی چەپم ئێستاش جێی چەقۆی ئەو چەقۆکێشە دیارە.

+تۆش!

- بەڵام من هیچ کچێکم نەدیتبوو.

پەری سەری سوڕما، نەمزانی نە پێدەکەنێت نە دەگری، داوام لێیکرد بەردەوام بێت لە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی.

+جارێك لە مێژە زۆر لەمێژە، دوو پۆلیس سەرخۆشێکیان گرتبوو، دەیانویست بیبەن بۆ بەندیخانە، من رزگارم کرد.

-سەر خۆشەکە من بووم.

پەری باوەڕی نەدەکرد، وایدەزانی من بە زۆرداری خۆم دەخەمە ناو چیرۆکەکانیەوە، نیشانەکانیم یەك یەك هەڵدەدا هێشتا گومانی هەبوو لەوەی سەرخۆشەکەی دەستی پۆلیسەکان و برینداره‌کەی دەستی چەقۆکێشەکە من بووبم، بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی چیرۆکی درەختە گوڵاویەکە:

+چیرۆکێکیدی دەگێڕمەوە بەڵام خۆت نەخەیتە ناو ئەوەشیانەوە، ئەها لێرێهیَ کوڕ و کچێك چووبوونە باوەشی یەکترەوە، ئەها لێرەش کوڕێك بە دزیەوە تەماشای دەکردن، منیش ئەها لێرەوە دەهاتم، بە دەست

خۆم نەبوو، لە پێکەنینم دا و تێکمدا، نەڵێی ئەو کوڕەی کچەکەی لە باوەش بوو من بووا!

-نا، بە چاوی تۆ، ئەو کوڕەی خۆی لێیانگرتبوو من بووم، ئێستاش پێکەنینی کچەکەی پشتم لە گوێیە، توخوا دە توند پێبکەنە بزانم پێکەنینەکە دەناسمەوە.

پەری پێکەنی، جوان پێکەنی، هەتا ئێستاش هەر پێدەکەنێت، پەری گوتی:

+چیرۆکیدی ناگێرمەوە، من خەریکە شێت دەبم.

-من لە تۆ شێتتر دەبم.

گومانم لە چیرۆکەکانی پەری پەیداکرد، هەستمکرد کەسێك هەبێت چیرۆکەکانی منی بۆ پەری گێڕابێتەوە و ئەو بە ناوی خۆیەوە بۆ منی دەگێڕێتەوە، نابێت ڕێککەوتی وا نابێت، یەك قەیناکە بەڵام سێ، سەیرە! لە هەستاندا گوتم:

-باشە، تۆ قەت لێرە لەو ناو باخە چیرۆکی گوڵاو، گوڵاوبوونی ئەو درەختەت بۆ دەستە خوشکێکت گێڕاوەتەوە.

+ئا، رەنگە، چیرۆکێکی زۆر ناسکە، تۆ نەتبیستووە؟

-با جارێك لە تۆم بیست بەڵام تا کۆتایی نا.

+لە من!

پەری لە مـن پتـر کەوتبـووە گومـانەوە، پێدەچوو وەك مـن کەوتبێتە بـارێکەوە کە نـازانین ئەو چیرۆکـانەی دەیگێـرینەوە، لە جـێگەیەك خوێنـدوومانەتەوە یـان خۆمـانین، مـن وابـووم، نەمـدەزانی لە خەیـاڵێکی جوانم یـان لە بـن درەخـتە گـوڵاویەکەم و ئەوەی دەیبیـنم و دەیبیسـتم لە درەختەکە راستی و راستیترە، هەر لەو دیدارە پەری گوتی:

+کەواتە تۆ بۆ ئەو درەختە لە لقێکی نزیکتر و ناشناتری.

-من دەبوو ناوم کوڕی درەخت بێت.

+باشە، ئەگەر حەزدەکەیت من بە کوڕی درەخت بانگتدەکەم.

-هەر ناوێك لە لێوی تۆوە گۆبکرێ، ناسکە.

ویسـتم پتـر پەری راگـرم و پتر لە گـوڵاوی دیـداری بـۆن بـکەم، پتـر جوانیی روخساری لە بینابیم بنەخشێنم گوتم:

-پێناچێت جیاوازیی تەمەنمان زۆر بێت.

+رەنگە هەر دوو سێ ساڵ بێت، تۆ تەمەنت چەندە؟

-سێ مانگە بیست و حەفت ساڵم تەواوکردووە.

+منیش چەند حەفتەیەکی ماوە بگەمە بیست و سێ.

-ناهەنگی لە دایکبوونت لە ساڵان جیایە، چەند ساڵە بە کچێنی دەتکرد بەڵام ئەو ساڵ...

زمانم بشکێ چیم گوت، خۆزی ئەو قسەیەم نەدەکرد، پەری رەنگی پەڕی، پەری پێدەچوو خۆی بە پێوە رانەگرێت، دانیشتەوە، منیش لەگەڵی دانیشتمەوە، پەری چاوەکانی سڕیەوە، نەیهێشت فرمێسکەکانی ببینم، هەر دە پەنجەی تێکئالاند و دەتگوت بە شەڕیان دێنێ و تەماشای دەکردن و دەستی بە قسە کرد:

+من زووتر ئەگەرێکم خستە ناو باسەکەوە، باشترە ئێستا پێتبڵێم، من ئەگەر ئەوساڵ لە کن تۆ ناهەنگی لە دایکبوونم بگێڕم، ساڵی یەکەم نیە کە بە ژنێتی دەیگێڕم، من دەمێکە کچ نیم.

- بمبوورە، من هەڵەیەکی زمانی بوو لە زارم دەرچوو، ئەوەی تۆ دەیڵێی من دەیزانم.

+لە کوێی دەزانی؟

-نەك من زۆر کەس دەیزانن، تۆ سێ شەو لە ئەمن زیندانی نەبوویت؟

+هەر ئەوە نیە، چیرۆکی تاڵیی من لە بن نایە.

- هەرچی بێت بە لای منەوە گرنگ نیە.

+ تۆ دەزانی من کوڕێکم خۆشویستووە، زۆریش...

-ئەوەم نەزانیبوو، بەڵام ئەگەر ئەوە رابردوو بێت، کێشەیەک نیە.

+ بەڵێ ئەو چیرۆکە رابردووە و ناگاتەوە ئێستا و دەمێکە کۆتایی هاتووە.

-پەری من چ پەیوەندیەکم بە رابردووی تۆوە نیە، من ئێستا و ئایندەی تۆم دەوێت، بەڵام دەکرێت بپرسم ئەو خۆشەویستیە زۆرە بە چی نەما؟

+نازانم، ئیدی...

-دەی، واز لەو باسە بێنە.

+باشترە من واز لە تۆ بێنم، تۆ...

-پەری، قسەی وا مەکە، منت کردە کوڕی درەخت، بەڵام هەستدەکەم درەختەکە تۆیت، من لقێکم لە تۆ، بە تۆوە کەسک و جوانم، ئیدی لێت نابمەوە.

پەری بە چاوە گەشەکانی کە پڕبوون لە فرمێسکی ئاسمانی، نیگایەکی وای دامێ لەرز دایگرتم و گوتی:

+ ئیدی تۆ کوڕی درەختی، بەڵام...

-تۆ درەختەکە و منیش لقێك لە تۆ، بێ بەڵام.

+ کوڕی درەخت، بەڵام...

-لە بیرمنەکەیت، من هەموو رۆژێك لە چێشتانێوە تا دەمەدەمی نێوەڕۆ لەو بنە درەختە چاوەڕێی تۆ دەکەم، هاتی و نەهاتی من هەر چاوەڕێتم.

## ١٦

# پەری

چەندی گەڕام، چاوم گێڕا، لە کوڕی درەختم باشتر نەدیتەوە، بەر لەوەی یەکەم تەوقە بکەین، هەندێك شتم لە بارەیەوە زانیبوو، ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بوو، نازانم بۆ، بێ ماڵی بوو، بە تەنیا دەژیا، لەگەڵ چیرۆك و درەخت و بەفر و جوانیەکانی سرووشت دەژیا، کوڕێك بوو زۆر کوێستانی هەڵکەوتبوو، رەنگە پیاوی کوێستانی یان پیاوی گەرمیانی قسە زۆر هەڵبگرن و نیشانەکانیان وا بە سانایی دیارنەکەون، بەڵام من هەر لە خۆوە هەستمکرد کوڕی درەخت کوێستانی هەڵکەوتووە، پێچەوانەی کوڕی پیاوە مەستەکە کە گەرمیانی هەڵکەوتبوو، من گەیشتمە ئەوەی کە چارەنووس بە خەتی درشت نووسیویەتی:

کوڕی درەخت، کوڕە کوێستانیەکە دەبێتە هی تۆ.

من و کوڕی درەخت بێنەوەی یەکتر بناسین، بێنەوەی یەکتر ببینین لە زۆر چیرۆکی بن درەختە گوڵاویەکە بە یەکەوە بووینە، بە یەکەوە ڕۆڵمان بینیوە، بە خۆم دەگوت: ئەو هاوبەشیە چەند جاریە چەند ساڵیە لە خۆوە نیە، شتێکی تێدابووە.

ئەدی جاری یەکەم کە لە وێستگەی پاس دیتم، بۆچی چووە دڵمەوە، تا ئەو کوڕەی من بە دوایدا دەگەڕام ئەوەیە و نابێت لە دەستی خۆمی بدەم، لەگەڵ ئەوەش دوودڵی لە دڵم بە شێوەیەك جێگەی گرتبوو بەرینەدەدا، دڵەڕاوکێ زارمی نەدەکردەوە دوا قسەم بدەمە کوڕی درەخت، چەند ڕۆژێکە چاوەڕێی دوا قسەی منە، ژنە کەسکپۆشەکە ڕۆژی دە جار چاوەڕوانیی کوڕی درەختم بە چاودا دەداتەوە، یەکبینە دەڵێ:

پەری، کچە جوانەکەی خۆم، تۆ بۆچی بەو پایزە ساردە ئەو کوڕە جوانەت لەوێ کردۆتە درەخت، بیگەیێ کچم بیگەیێ، ئێستا لەوێ وەك درەختەکە شینبووە، ڕەگی داکوتاوە، گوناهت دەگاتێ پەری، چیدی لە چاوەڕوانیدا مەیهێڵەوە، چاوەڕوانی سەختە، پەری چ لە چاوەڕوانی سەختتر نیە، پەری کچەکەم، زگت بە کوڕەکەم بسووتێ، ئەوەی بن درەختە گوڵاویەکە.

ژنە کەسکپۆشەکە بە دیدارێك کوڕی درەختی کردە کوڕی خۆی، زۆر چووە دڵیەوە، پێمگوت:

+تۆ بە یەك دیتن چۆنە وا ناسیت و خۆشتویست؟

- کوڕی باش، زوو دەناسرێ، بەڵام بەینی خۆمان بێت من زوو زوو دەیبینم لە دوای ئەو جارەوە چەند جارێکیدی دیومە، جار لە دوای جار ژیرتر و شیرینتر خۆی دەنوێنێ، پەری کچەکەم، من دەڵێم حەفت ساڵیش بگەڕێیت کوڕێکی وات دەستناکەوێت، بە قسەی من بکە و لە دەست خۆتی مەدە.

بە پێکەنینەوە گوتم:

باشە تۆ بۆچی بە بێ من دەیبینی، چی لێت دەوێ؟

لە پێکەنیندا لە سەر پشت کەوت:

چی لێم دەوێت لە تۆ زیاتر چی؟ کچێ پەری گوێبگرە تازە ئەو کوڕە کوڕی منە، من زوو زوو دەبێت بیبینم.

+توخوا تێمبگە، من دەترسم، لە شووکردن دەترسم، نازانم بۆچی بەرۆکی ئەو کوڕەم گرت، نازانم چۆن داوای لێبووردنی لێبکەم و هەر کەسەمان لە ماڵی خۆی.

-ئەوە مەڵێ، پەری ئەوە مەڵێ.

+باشە تۆ کە دەیبینی باسی چی دەکەن، ئەو چی دەڵێ، تۆ چی پێدەڵێی؟

-دەبێت باسی چی بکەین!

ژنە کەسکپۆشەکە بە جۆرێك لە دڵشکاوی هەستا و گوتی:

-هەندێك کارم هەیە، من دەڕۆم.

+دەچیە بن درەختەکە؟

- بشچم دەچمە کن کوڕی خۆم، تۆ هەقت چیە!

+هیچ، سلاوی لێبکە پێیبڵێ پێویستم بە کاتی زیاتر هەیە.

ژنە کەسکپۆشەکە ڕۆیی، چێشتانێکی درەنگە، کوڕی درەخت ئەگەر لە سەر قسەی خۆی مابێت، دەبێت ئێستا لە بن درەختی گوڵاوی

چاوەڕوان بێت، خۆ ئەگەر لەوێش نەبێ هەقی خۆیەتی، مـن لە خۆوە لە چـاوەڕوانیی ژنە کەسکپۆشـەکە مـامەوە، ئەجمـانم نـیە، بـۆ نەهـاتەوە، درەنگی پێچوو، دەبوو زووتر بێتەوە، دڵم دەڵێ، ئێستا بە خۆ و بە کوڕی درەختەوە دێتەوە، هەر چەندە ئەو گوتبووی:

نا، خەمت نەبێت، سەر بە کۆڵانەکەتان ناکەم، مەگەر بۆ داخوازیی تۆ.

باشە بۆچی مـن وا لە چاوەڕێی کوڕی درەخت چرکە چرکە کات دەژمێرم، دەڵێی شتێك لە پێشە، شتێك ڕوودەدات، ڕەنگە هەواڵێکی خۆش لە ڕێ بێـت، بەڵام هەواڵـی چـی، خـۆ مـن لە چـاوەڕوانیی هـیچ نـیم، خەڵك لە چاوەڕێی مـنە، کوڕی درەخت لە چاوەڕێی هەواڵێکی خۆشە مـن بـۆی بنێـرم، تێنـاگەم ئەوڕۆ لەوەتەی ژنە کەسکپۆشـەکە بەرەو درەختی گوڵاوی ڕۆیشـتووە، مـن بۆ وام لێهـاتووە، خەونەکەم، ئـا خەونـی ئەو شەوم، چـی بـوو، باشم لە بیر نـیە، ئـا چوکلێت، چوکلێت بـوو، لەو خەوە چـوکلێتێکم خـوارد لە چ چوکلێتـان نەدەچـوو، ئەوەتە تـامی زاری خـۆم دەکەم، تـامی چـوکلێتی خەونەکە لە زارمە، سـەیرە، تـامی خەون چـۆن لە زار دەمێنێـتەوە! تێنـاگەم، هـیچ تێنـاگەم، ژنە کەسکپۆشـەکە بـۆچی ڕۆیشـت، ڕۆیشـت بـۆچی زوو نـایەتەوە، وەرە زوو وەرەوە مـن لە

چاوەڕێی شتێکدا ئاگام لە خۆم بڕاوە، نازانم ئەو شتە چییە، لە بیرمە لە بەر خۆمەوە وڕێنە یان نزیك لە وڕێنەم دەکرد، ئەوەتا لە سەر دەرگا ڕاوەستاوم و تەماشای دەرگای ماڵی ژنە کەسکپۆشەکە، تەماشای سەری کۆڵانێ دەکەم، ئۆی هاتەوە بە تەنیا هاتەوە، ژنە کەسکپۆشەکە هەر خۆی، کەسی لەگەڵ نیە، باش بوو کەسی لەگەڵ نەبوو، ڕێك لەو کاتە گوتم:

باش بوو کوڕی درەختی لەگەڵ نەبوو، من ناتوانم شوو بکەم.

من چ لە خۆم ناگەم، نازانم چیم دەوێت، یەکەم دیداری من و کوڕی بن درەختەکە چ دیدارێ بوو، دیدارێکی بارانی، ناسك لە یەکەم بارانی پایز دەچوو، ئا لەو دیدارە و بە سەر دیداردا بارانی یەکەم باری، ئەو دیدارە بارانیە ئەوڕۆ هەستدەکەم هێند دوورە، هێند دوور، دەڵێی لە خەیاڵدا هەڵچنراوە، دوا دیداریش هەر دەڵێی خەیاڵیە، من نەدەبوو بچمە ژوانی هیچ کوڕێکەوە، هەڵە بووم، من کچێکم پەند وەرناگرم، پەندم لە کوڕی پیاوە مەستەکە وەرنەگرت، من ڕۆیشتم، لە دەستچووم، مادام بۆ کوڕی پیاوە مەستەکە نەبووم، بۆ کەس نابم، نە بۆ کوڕی بن درەختەکە و نەهی بن هیچ.

ژنە کەسکپۆشەکە نزیکبۆوە، تەماشایەکی ئەولا و ئەملای کرد، کەس دیار نەبوو، نامەیەکی خستە دەستمەوە و گوتی:

ئەگەر لە ماڵی خۆتان، دەرفەتی خوێندنەوەت نیە، وەرە ماڵی ئێمە.

نەچووم یەکپێ چوومە ژوورەوە و کردمەوە، ئەوە بڕیاریشم دابوو کە هیچ نامەیەك ئەگەر بۆنی دڵداری یان داخوازیی لێبێت، هەڵینەپچڕم و نەیخوێنمەوە، خۆ بە کوڕی بن درەختیشم گوتبوو:

تکایە هەرگیز نامەم بۆ مەنووسە، من نامە ناخوێنمەوە.

پەشیمانبوومەوە، نازانم چی پەشیمانمی کردەوە، دەستم بە خوێندنەوەی نامەیەکی چوار لاپەڕەی گەورەی خەت وردی ناسك کرد، ئێستاش ئەوەتە هەندێکی دەخوێنمەوە:

من قسەی خۆم بردە سەرێ، دەبەمە سەرێ، هەموو رۆژێك لە وادەی خۆی لە بن درەختی گوڵاوی لە چاوەڕێی کچێکی دڵ پڕ لە دڵەڕاوکێم، کچێك رێك دەڵێی ئەو پەلە هەورمیە ئەوەتا لە ئاسمانی باخ کەمێك هێواشی کردۆتەوە و نیازی داکردنە، بەڵام دوودڵە، نازانێ نە لێرە دابکات نە لە جێگەیەکیتر، رەنگە هەر حەزی لە داکردنیش نەبێت و حەز بکات تا ئاسمان ئاسمانە هەر هەور بێ و هەر بە ئاسمانەوە...

کچە هەوریەکە، لە دیداری حەفتەمەوە تا ئێستا بەو نامەیەوە کە ئەوەتە بە تەنیشت دایکمەوە بە تەنیشتی ژنە کەسکپۆشەکەوە دەینووسم رێك بیست و یەك نامەی درێژ درێژ وەك قژی کچە هەوریەکە درێژم بۆ تۆ نووسیوە و هەمووشیان ئەوەتە لە ناو جانتاکەم زیندانین و چاوەڕێی ئازادکردنن، بیست نامەیان لە سەر قسەی تۆ با هەر لە زیندان بن، بەڵام ئەوەیان قسەی تۆ دەشکێنێ و دێتە دیدارت.

قسەی من دەشکێنێ، با بشکێنێ، بزانم چۆنی شکاندووە.

کچە هەوریەکە، ئەها پەلە هەورەکە پرووشاندی بەڵام پەژیوانبۆوە، رایگرت، ئەو هەورە زۆر لە تۆ دەکات، ئەگەر بە چاوی من تەماشایبکەیت هەورەکە تۆی، کچە هەوریە پایزیەکە، من حەزدەکەم کەمێك بە خۆمدا هەڵبڵێم! سوێندت لە سەرم نیە هێندەی بەژنی خۆم چیرۆکی ئەوینم خوێندۆتەوە، لە شیرین و فەرهادەوە بە هەردو دیوی تایتانیکدا برۆ و وەرەوە تا دەگاتەوە چیرۆکی کەریم و ستی تا... بەڵام هیچیان بە کەڵکی بن درەختی گوڵاوی و پایزی ئەوساڵەم نەهاتن، هێی، خوێندنەوەی ئەوین لە کوێ و ئەوین لە کوێ، من رەنگە بە هەڵە عاشق بوویم، نەدەبوو تێبکەوم، ئیدی تێکەوتم، کەوتمە ناو تیشکە زەردەپەڕیەکانی ئەوینەوە، کچی هەور، لە تەمەنم نامەی ئەویندارانم

نەنووسیبوو، کەچی لەو بیست و یەك رۆژە ئەوە بیست و یەك نامەی درێژ بنووسم، تۆ بۆچی نامەم پێدەنووسی!

ئەدی نەتگوت مەنووسە، تۆ رەنگە ئاگات لە خۆت نەبێت قسە دەکەیت، من لەو دوورەوە گوێم لێیە دەڵێیت:

کوڕی بن درەخت بنووسە، دنیایەك وشەم بۆ بنووسە، هێندەی گەڵای درەختی گوڵاوی، هێندەی بالندەکانی درەختی گوڵاوی، هێندەی ترپەی دڵی خۆت کە بۆ من لێدەدەن وشەم بۆ بنووسە.

منیش منداڵانە نا، عاشقانە بێ بیرکردنەوە بە قسەت دەکەم و بڕیارم دا بۆت بنووسم، هەمیشە بۆت بنووسم.

لە بەر خۆمەوە دەمگوت ئەو کوڕە دەڵێی منی باش خوێندۆتەوە، رەنگە ژنە کەسکپۆشەکەش کە کردوویەتیە دایکی خۆی لەو بارەیەوە یارمەتیی دابێت.

کچە هەوریەکە، من لەو نامەیە هەر بە کچی هەور ناوت دێنم، ئەوە ناگەیەنێ کە لە ناوەکەی خۆت شیرنتر بێت، تۆ هەر لە ناوەکەی خۆت دێیت، بەڵام من ناوت ناهێنم نەبادا نامەکەم بەر دەستی کەسێك بکەوێت، چ سوێندت لە سەرم نیە، بەڵام سوێند بە هەرچی جوانە، یەکەم جارمە

عاشق بم، یەکەم جارمە دەستم بخەمە دەستی کچێکەوە، یەکەم جاریشمە نامە بۆ کچێك بنووسم، مـن دنیـایەك وشـەم لە بـارەی تـامی ژنەوە خوێندۆتەوە بەڵام هەتا ئێستا نازانم چۆنە و تامم نەکردووە...

من لە تەمەنم لە ژن ترساوم، ترساوم لێم نزیکبنەوە، لێیان نزیکببمەوە، زڕ دایکم فێری دوژمنایەتی ژنی کردم، کچێکی ئەو زڕدایکە کە کچی باوکم بـوو منـیش چەنـدی هەوڵمـدا ببێـتە خوشـکم بەلاش بـوو، نەبـووە خوشـك فێـری کـردم کە خوشـك و برایەتـی لە دنیـادا نـیە، ژنـی بـرا گەورەکەم کە دیتی براکەم شەڕ قاچێکی بڕاندۆتەوە، سێ منداڵی وردی بە سەردا بەجێهێشت و لە کۆڵانێ هاواری کرد:

من مێردی یەك قاچم بۆ چیە!

بـراژنەکەم فێریکـردم پیـاو بە رەبەنـی بـژی پاشـایە، کـچە چـاو کـاڵەکەی کۆڵانمـان بـۆ نـاڵێی! دەمـدیت گەنجـی گەڕەکـێ هەر یەکەو یـارێکی هەیە، منـیش ویسـتم یـارم هەبـێ، یەك دوو جـار تیـچـاوم دایە چاوکاڵەکە، جاری سێیەم لە پێش چاوی چەند کەسـێ هەتا تـف هەبـوو بە جوێنێکی پیسەوە لە ناو چاوی کردم، کچە چاوکاڵە دەوپیسەکە فێری کردم هەرگیز بیر لە گرتنی یار نەکەمەوە.

هەستمکرد کەسێك بە سەرمەوەیە، لە دایکم زیاتر کێیە، هەر ئەو نیە من لە خەیاڵ دەپسێنێتەوە، لە نامە دەپچڕێنێ:

+لەمێژ بوو وازت لە پەڕە کاغەزان هێنابوو، دەستت پێکردەوە؟

-وازم لێبێنە.

+خۆ بە تەمانین بە خۆت و بابتەوە ئەو حکومەتەش بڕووخێنن.

-حکومەتەکان هەر بۆ رووخان باشن.

+یان کاخەزی شتیترە، باشە بە من بڵێ تۆ بۆچی مێرد بەو نەخشەسازە ناکەیت شارێکی بە دواوەیە؟

-باشترە خۆت مێردی پێبکەیت، واز بێنە دەنا بابم بێتەوە پێیدەڵێم تەمبێت بکات.

+باشە باش، پێچکت بە قوونی بابت.

---

کچە هەوریەکە، ئەوە باران دایکرد من و دایکم شانمان بە قەدی درەختی گوڵاوی داوە و باران نامانگرێتەوە، ترسی تەڕبوونی کاخەزەکەم هەیە، دەنا حەزم لێبوو لە بن بارانێ بە تەڕی و رستەی تەڕترت بۆ بنووسم، دەزانم رەنگە بە درۆی جوانی وەربگریت، بەڵام من هیدڵیمە، تا ئەو جارەی لە وێستگەی پاس، ئەوەی ئەها لێرێهێیە، چاومان لە چاوی یەکتر نەبڕی، من عاشقە ژن نەبوومە و نەمویستووە پەیوەندیان لەگەڵ ببەستم، سەیر بوو ئەو هەموو کتێبە دڵداریە و ئەو هەموو شتەم لە سەر مرۆڤایەتی و پەیوەندی نێر و مێ خوێندبۆوە، بەڵام کە دەهاتە سەر ئەوەی بمەوێت لەگەڵ ژن بژیم، نا، من ناتوانم، بەڵام لە چاوەکانی تۆوە خولیای لەگەڵ ژن ئاشتبوونەوە کەوتە سەرم، تا ئەو رۆژەی لە تەوقەی یەکەم و تا ئێستاش دوا تەوقە، گەرماییت لە رێی پەنجەکانەوە نەڕژایە گیانمەوە، نەمزانی ژن ئەوهایە.

—

پەری، پەری...

ئەوە بابمە گازدەکات، بابم هەمیشە لە هاتنەوەدا لە سەردەرگای حەوشە، گازمم دەکات، پەری پەریی بابم لە باتی لە دەرگا دانە، ئەو دەمانەی سووڕ دەزانێ لە ماڵیش نیم هەر بە پەری پەری دێتە ژوورەوە،

دایکم ئەمەی زۆر پێناخۆشە، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت، کەیفی بە
من نایە، هەستدەکات لە دڵی بابم لە زاری بابم من جێگەی ئەوم
گرتۆتەوە، من دەستم لە هەر شتێك بێت، کە گوێم لە ( پەری، پەری )
ی بابم دەبێت، بەتاڵی دەکەم و بەرەو بابم غاردەدەم، زوو هاتمەوە سەر
نامەکە.

---

ئای ناوتم هێنا، ئەو جێگەیە کە دەبینی خەتی بە سەردا هاتووە ئەوە
ناوی تۆیە، ئاگاداربە خەتی چاوەزارییە هی سڕینەوە نیە! خەریك بوو
ئەو جارەش ناوت بنووسمەوە، من دەڵێی کەتنێکم لە چاوە، کچە
هەوریەکە دەزانی چی؟ ئەوەی لای من زۆر گرنگە، ئاشتبوونەوەمە
لەگەڵ ژن، من کە ئەو هەموو ساڵە لە ژن تۆراوم، یان ژن لە من
تۆراون، ئا هەندێك جار هەستمکردووە ئەوان خۆیان لە من دوور دەگرن،
ئەوان دوژمنایەتیان ڕاگەیاندووە، من کە دەڵێم دوژمنایەتیم لەگەڵ ژن
هەبووە، مەبەستم ئەوە نیە نەمویستووە لە جوانیان بخۆمەوە، مەبەستم
ئەوە نیە نەمویستووە تامیان بکەم، نا دوژمنایەتیەکەی من بۆ ژن ئەوە
بوو نەمویستووە هیچ ژنێك زڕدایکم بێت، دایکیشم بێت، هیچ ژنێك زڕ
خوشکم بێت، خوشکی لە دایك و باوکیشم بێت، هیچ ژنێکیش ژنم بێت،

هەر ژنێك بێت، هەر چی بێت، من ئێستا لەگەڵ ژن ئاشت بوومەتەوە، ئەوەتە تۆ دایکێکت بۆ من پەیدا کرد، ناوی ژنە کەسکپۆشەکەیە، خۆزگە زووتر دەبووە دایکم، تۆ کچەکە، تۆ من و ژنت پێکدی ئاشتکردەوە، من لەمەودوا رەنگە نەتوانم بێ ژن بژیم، چەند تامەزرۆم ئەو کچەی من و ژنی ئاشتکردەوە، زەماوەندی لەگەڵ بکەم... کچی هەور، من ئاگام لە چ بووا لە خەوێکی قووڵ بووم، لە پڕ لە ئاسمانێکی سپی، ئەستێرەیەکی رەشم لێهەڵات، چ جوانە ئەستێرەی رەش، چ نوێبوونەوەیەکی ژیانە ئەستێرەی رەش، بە مەرجێ نەبێتە بەختم، خاڵت بەختی رەشمە.

---

قیژەیەك لە کۆڵانەوە دیواری بڕی، دەستم لەرزی، غارمدایە دەرێ، ژنەکەی تەنیشتی ماڵی ژنە کەسکپۆشەکە کە لە کۆڵانێ بە ژنی سەر بەخەنە دەناسرایەوە، پەنجەکانی هەردوو دەستی لە قژە خەنەییەکەی خۆی نابوو، پێدەچوو تازە خەنەی نوێکردبێتەوە، بە پێخواسی بە کۆڵانێدا رایدەکرد، ئیدی کۆڵان بە دوای کەوت، منیش بەگەڵ کۆڵان کەوتم، نازانم بۆ کوێ دەچین و چی روویداوە، گوێم لێبوو:

ماوە، ماوە، بریندارە لە خەستەخانەیە.

ئەوە کێیە ئیرەیی بە مـن دەبـات، ئیرەیـی بە خوێنـدنەوەی نـامەی کـوڕی بـن درەخـتەکە دەبـات، هەر جـارەی شـتێك دێـتە پێشـێ و لە خوێنـدنەوەم دەکـات، خوێنـدنەوەی نـامەکەی کـوڕی بـن درەخـت، دانە ڕۆژێکی پتری ویست.

ئەوەی لە بیرمە دوای خوێندنەوەی نامەکە یەکسەر دەستم دا کاخەز و پێنووس، چەند لەمێژ بوو نامەم نەنوسیبوو، ویستم نامەیەکی درێژ لە هی ئەویش درێژتر بنووسم، پەشیمانبوومەوە، نا من ئیدی نامە بۆ کەس نانووسم، نابێت بۆ کەس نامە بنووسم، من تۆبەم لە نامەنووسین کردووە، نەمنووسی، ئۆقرەم نەدەگرت، کاریگەریی نامەکە لە سەرم بە شێوەیەك بوو دەبوو شتێك بکەم، لە بیرمە چووم، بەرە بەرەی ڕۆژئاوابوون بوو، باران نم نم دەباری، نامەکانی حەفت پایزەی کوڕی پیاوە مەستەکەم هێنا، لە پەنایەکی حەوشە، لە قوژبنێك ئاگرم بەردانێ، نامەی کوڕی بن درەختیش بە دەستمەوە، لە بن لچکی پاڵتۆکەممە، بە دیار سووتانی نامەکانی حەفت پایزەی کوڕی پیاوە مەستەکەوە، جار جارە ڕستەیەك لە نامەی کوڕی بن درەختم دەخوێندەوە:

ئەگەر وەك پەلە هەورەکە بە سـەر منـدا بارانـدت و بە وشـکی بەجێتنەهێشـتم، هەوڵ دەدەم دڵـۆپ دڵـۆپ بتگـرمەوە و

نەهێڵم............. ئەگەر ژوورێك بووە ماڵی هەردووكمان، حەزدەكەم بۆ ماوەیەك ژوورەكە لە جێگەیەك بێت كە ئەو درەختەی لێوە دیار بێت، ئەو درەختەی لە بن گەڵاكانی......... حەزدەكەم شەوی یەكەم، لە ژوورێك بین پەنجەرەكەی روو لە سەفین بێت.. ئەگەر دوا قسەشت خوانەخواستە ئەوەی لێیدەترسم نەوە بوو، ئەوا هەر مەنوونم، چاكەیەكت لەگەڵ من كردووە لە بیرناچێتەوە، ئاشتبونەوە لەگەڵ ژن، پەیداكردنی دایكێك بۆ من.........، ئیدی چیدی نامە نانێرم بەڵام بەردەوام بۆت دەنووسم.

## ١٧

# ژنە کەسکپۆشەك:

ئەو ڕۆژەی کوڕە ژیرەکەی بن درەختەکە لە دڵەوە گوتی:

تۆ دایکم بە، من کوڕتم.

بووە کوڕم، لەو ڕۆژەوە من وجاغم کوێر نیە، پێشتر کوڕێکی شێتم هەبوو، بەڵام لەوڕۆژەوە بوومە خاوەن کوڕێکی ژیر، ژیریی شارێکی هەیە، وەك کچەکەم، خەریکە کوڕەکەم هێندەی کچەکەم خۆشبوێت، بە ماوەیەکی کەم نازانم چۆن لە دڵی من بەو شێوەیە جێگەی خۆی کردەوە، ئەو جارەی لە بن درەختەکە لە تەنیشتم دانیشتبوو، نامەی بۆ پەری دەنووسی، چەند کوڕانە جار جارە سەری هەڵدەبڕی و تەماشای ناوچاوی دایکی خۆی دەکرد، ئەو ڕۆژە پایزە باراناویە من کوڕی خۆم دیتەوە، کوڕێك کە باوەشم پێداکرد هەستم بە گەرمایی خوێنی کرد، خوێنێك لە خوێنی هەر چوار مێردەکەمەوە هاتبوو، خودا بە گوناهم لە

سەر نەنووسێت، کوڕی بن درەختەکە کوڕی راستینەی من بوو لە هەر چوار مێردەکەم، میراتی هەر چوار مێردەکەم کوڕی بن درەخت، کوڕە جوانە ژیرەکەم، بەڵێنت پێدەدەم جوانترین کچ، ژیرترین کچ ببێتە بووکم، وەك چۆن گفتم بە کچە جوانە ژیرەکەم داوە کە جوانترین کوڕ ژیرترین کوڕ ببێتە زاوام، هەر دەبێت تۆ و پەری ببنە بووك و زاوا، من چ لە کن پەری چ لە کن کوڕی بن درەخت هەمیشە دەمگوتەوە:

ئێوە دەبێت بۆ یەکتر بن.

بەڵام پەری ئاخ لە پەری، هەرچیم دەکرد نەدەهاتە رایێ، پەری ترسابوو لە پیاو ترسابوو، دەبوو چ بکەم تا لەگەڵ پیاو ئاشت بێتەوە؟

ئەو رۆژە باراناویەی نامەکەی کوڕەکەمم دایە دەستی پەری، لە سەر دەرگا ئەها لە سەر ئەو کۆسپەیە لە چاوەڕێی پەری مامەوە، ئێستا نا ئێستا دێت و دەڵێت نازانم بۆچی دڵم وای دەگوت کە ئێستا پەری دێت و دەڵێت:

برۆ بە کوڕەکەت بڵێ من ئامادەم با بێتە داخوازیم.

دڵم ئەوهای دەگوت، دەی با بێت و بچم ئەو هەواڵە خۆشە کە لە بەهەشتیشەوە بێت هەر هێندە دڵی کوڕی بن درەختەکە خۆش دەکات،

ئێستا نا ئێستا پەری دێت، ئەوەتا پەری هات بەڵام قیژەی ژنی سەر بەخەنە هێنایە دەرێ، ئۆی نازانم کێ بوو بە هەواڵێك، هەواڵێك لە دۆزەخەوە کۆلانی بە دوای ژنی سەربەخەنە خست، کوڕی ژنی سەربەخەنە لە نزیك مزگەوتی حاجی لەقلەقەکان، بە ناخێری گیانی عەلاگەیەکی رەشی بە دەستەوە دەبێت، ئیدی دوو گوللە دەگرێتەوە و عەلاگەکەی دەبەن، ئەو عەلاگەیەی کە دواتر خۆی گوتی:

نرخی نیو تفەنگی تێدانەبوو.

لەگەڕانەوەی کۆلان من و پەری پێکەوە بووین، گوتم:

+کچەکەم، نامەی کوڕە جوانەکەمت خوێندەوە؟

پەری بە خەندەیەکی ناسکەوە:

-دەڵێی ئەو رۆژانە کوڕەکەت لە کچەکەت خۆشتر دەوێت!

+کەسم هێندەی کچەکەم خۆشناوێت، بەڵام کوڕەکشم هێندەی دنیایەك خۆشدەوێت، بە من بڵێ...

-هێشتا تەواوم نەکردووە، نازانم چی دەکەم، ناتوانم، نازانم.

ئەو شەوە لەو شەوانە بوو کە بە قەد ساڵێك درێژن، بەیانی نەدەدا و نەدەدا، لەو شەوەدا بایی مانگێك نوێژم کردووە، شەو نەدەڕۆیی و نەدەڕۆیی، لەوە شەوە ساڵییە بایی ساڵێك نزام خوێندووە، شەو نەدەڕۆیی و نەدەڕۆیی، نوێژ و نزاکانی ئەو شەوەم نە بۆ بەهەشت بوون، نە بۆ دوورکەوتنەوە لە دۆزەخ، تایبەت بوون زۆر تایبەت، تایبەت بە بەیەکگەیشتنی کوڕ و کچەکەی خۆم بوون، ئەو شەوە لە نزیکەوە قسەم لەگەڵ خودا دەکرد، نازانم گوێیلێمبوو، یان نا، ئەو شەوە رەنگە دنیایەك ورێنەم کردبێت، ئەگەر ئەو ژنەی وا چەند حەفتەیەکە لە حەوشەمانە و کە ساڵانێکە لە بێخەویدا شەو و رۆژ لێکدی گرێدەداتەوە، ناویشی بۆتە ژنی لە خەو تۆراو، ئەوکاتانەی دڵیشی خۆشە، قسەخۆشترین ژنە، بەڵام ئەگەر بەر لە بەیانیەکەی ئەو شەوە ئەو قسانەی لەو شەوەدا لەگەڵ ئاسمان کردبوومن، ژنە لە خەو تۆراوەکە بۆمی نەگێڕابایەتەوە من شتێکی ئەوتۆم لە بیرنەمابوو، ژنە لە خەو تۆراوەکەی ژوورەکەی تەنیشتم پاڕانەوەکانی منی لە بەر بوو:

خودایە، خودای بێکەسان، من بۆ خۆم هیچ لە تۆ ناخوازم، تازە چیت لێبخوازم، لە چوار مێردان مێردێکت بۆم نەهێشتەوە، کوڕێکی شێتم هە، من بۆ خۆم چیت لێبخوازم! خودای من بە تکا تکات لێدەکەم، دڵی پەری نەرم بکە، کوڕی بن درەخت ئاگری گرتووە، دڵی نەرم بکە، ئەو

کوڕ و کچە دەبێت بۆ یەکتر بن، تۆ ئەگەر لەبیرت بێت ئەو دوانەت بۆ یەکتر درووستکردووە، دەزانی چەند جوان لە یەکتر دێن، هاوشانی یەکترن هاوکوفی یەکترن، هیچ کوڕ وکچێك نیە لەو دنیایە هێندەی ئەو کوڕو کچەی من لە یەکتر بێن، خودای من، ئەو کوڕ و کچە بخە باوەشی یەکترەوە.

شەوە درێژە پایزیەکە نەدەبڕایەوە، لەو شەوەدا لە کۆلانێ جگە لە من و ژنە لە خەو تـــۆراوەکە کەس هەیە بە ئاگـــا؟ ئـــا، رەنـــگە ژنـــی سەربەخەنەش کە بە دیار کوڕە بریندارەکەیەوە خەو نەچووبێتە چاوی، کێ نالێ پەریش بە ئاگایە، رەنگە نامەی کوڕی بن درەخت خەوی لە چاو تۆراندبێت، خودایە تۆراندبێتی و لە خەوزڕاندا خەونی من بێتە دی، پەری هەرێ بە خۆی بدا کە دەبێت شوو بە کوڕی بن درەخت بکات، ئەوجا چاوەکانی لێکنێ و هێند بخەوێت هێند بخەوێت لە ئێستاوە لە جیاتی شەوی بووکێنی خەوی خۆی بکات.

دڵنیام ئێستا لە کۆلانێ لەو شەوە پایزیە کە باران نم نم دەبارێ، دەڵێی لایەلایە بۆ زەوی دەکات، لەو شەوە جگە لەو چوار ژنە کەس بە ئاگا نیە، پەری هەر دەبێت بە ئاگا بێت، دیتم، پێوەی دیار بوو نامەکە کاریگەریی زۆر لە سەر دانابوو، چ شەوێکی هێمن بوو ئەو شەوە جگە

لە دەنگی نەرمی باران دەنگی هیچ نەدەهات، بارانەکەش سات لە دوای سات نەرمتری دەکردەوە، رێك وەك ئەو دایکەی کە سەرەتا بە دەنگی بەرز لایە لایە بۆ کۆرپەکەی دەکات و بەرە بەرە لەگەڵ برژانگ لە سەر یەك دانانی کۆرپەکەی ئەویش لایە لایە خاوتر نەرمتر دەکاتەوە، بارانەکەش ئەوها، دڵێی دەزانێت گەڕەك خەوتووون، شار لەوەتەی هەیە کپی وای بە خۆیەوە نەدیوە، بە تایبەتی لە دوای رۆژی رابوونەوە، تەقەیەك نایە، رێی تێدەچێت ئەو شەو کەسێك نەکوژرێت! رێی تێدەچێت دزێك بەر تەقە نەدرابێت، سەیرە بێدەنگی شار سەیرە، ئەو بێدەنگیە بەخێر بگێڕی خوایە .

شەوە نازانم چ کاتی شەوە، دەبوو بەیانی دابا، کێ دەزانێت لە کەیەوە شەوە، بەڵام هێشتا هیچ کەڵەبابێك قووقەی لێوە نەهاتووە، هیچ مەلایەك تحمیێکی نەکردووە، لە سەر دەرگاوە ئەویش لە سەر دەرگا راوەستابوو، لە ژنی خەو لە چاو تۆراوم پرسی:

+ئەریێ چ کاتی شەوە؟

-زۆری رۆییوە کەمی ماوە.

+وا بزانم بێخەویی تۆ منیشی گرتەوە.

-خوا بکەم هی تۆش من بگرێتەوە.

+خوایە بتگرێتەوە، بە راست شەو چەندی ماوە؟

-هەتا دەستنوێژ دەشۆیت، بانگدەدات.

+من دەستنوێژم هەیە.

-دەزانم بەڵام نوێی بکەوە، دەستنوێژ زووتر نوێی بکەیتەوە باشترە.

+بە پێویستی نازانم.

-خۆ ئەگەر ئەویدی با، پێویستی بە نوێکردنەوە دەکرد.

+کوا! بە ناشکوری نالێم...

- هەر یەکەو هەندێك تەڕاتیان بردی، بەڵام بە خودای هێشتا بایی چواریتر تەڕایەتیت تێدا ماوە.

+بۆ خۆ دادە سەلما نیم، ئەدی خۆت، بۆ نوێی ناکەیتەوە؟

-دە، ئەگەر راست دەکەیت گەنجێکی قۆزم بۆ بیینەوە، بزانم چۆن نوێی دەکەمەوە.

+بەو تەمەنەوە گەنجت دەوێ؟

-ئەدی کیر پەڕۆ!

ژنـــی لە خەو تــۆراو پەڕۆیەکەی هەر لە زاری بـــوو، دەســـرپێژێك بێـدەنگیی شـەوی شـکاند، دەسـرپێژیك نزیـك نزیـك هەر لە حەوشـە، دەسرپێژێك بێراییەکەی ئاگر دا، دەسرپێژێك وەهای شلەژاندم دەست و پێی خۆم نەدەدیـتەوە، نەمـدەزانی گـوللە بە کـوێم کەوتـووە، لەو دەمە ئەوەی بیستم هاوارێك و رستەیەك، رستەیەك دەتگوت بەراز گوتی:

من دایکێکم ناوێت قاچیایەتی کردبێت.

هاوارێك دەتگوت لە قوڕگی مامزەوە دەرچوو، هاوارێك هەتا هەتـایە لە گـوێی مــن دەنگـدەداتەوە، دەسـتەکانیم گـرت، دەسـتم خسـتە سـەر سینگی، تەڕایی خوێن، وای لە تەڕایـی خوێن، لە بن تیشکی گلۆپی بێـراییەکە رەنگـی خـوێنی ژنە لە خەو تۆراوەکە هەر جارەی بە رەنگێـك خـۆی نیشـانی بینـاییم دەدا، لەو دەمە کەڵەبابێـك بـانگی دا، مەلا بە دوایەوە، بە سـەر تەرمـی ژنـی لە خەو تۆراو بانگیـان دا، خەوت، ژنە لە خەو تـۆراوەکە لەگەڵ خەو پێکهـاتەوە، تـۆران کۆتـایی هـات، ژن و خەو ئاشـتبوونەوە، خەونێکـی هەتاهەتـایی،یەکەم کەس کە گەیشـتە سـەرمان پەری بوو، دووەم کەس بابی پەری، سێیەم کەس کۆڵان.

کاتێك رستەی بەرازەکەم بۆ بۆ باوکی پەری گوتەوە، گوتی:

دەمزانی ئەو ریشنە خوێریە وا دەکات، ئەوانە ئایینیان لە قوڕاو گرت، ئەوانە بە قسەی هەندێك کێویی بیابان ئەوها دایکی خۆیان دەکوژن.

بە گریانەوە لە باوکی پەریم پرسی:

کوڕی خۆی کوشتی؟ بۆچی کوشتی؟ من چ نازانم.

پەری بە گریانەوە گوتی:

ئەوە ئیدی، لە دایکی خۆیەوە دەستپێدەکات.

لەوەوە هەندێ قسەی ژنی لە خەو تۆراوی هەمیشە خەوتووم بیرکەوتەوە کە لە بارەی کوڕەکەیەوە دەیگوت، کوڕەکەی پێشنەوەی بڕوات هەڕەشەی لێکردبوو، یەك دوو رۆژ پێشتر شتێکی وای بۆم گێڕایەوە:

کوڕەکەم زۆر خراپ تێکچووە، پێیوایە سەر لەبەری ئەو شارە لە خودا هەڵگەڕاونەتەوە، نوێژ و رۆژووەکانیان خواروخێچی تێدایە، جلوبەرگیان هی گاورانە، کوڕەکەم بە منی گوت:

+ دایە، ئەگەر تۆ جلوبەرگی ئیسلامی نەپۆشی، بەگاوری دەمریت.

-کورِم جلوبەرگی ئیسلامی چۆنە؟

+وەکو ئەو ژنەی بەرانبەرمان.

-کورِم ئەوە کەی جلکە، ئەوە بە من هەڵدەگیرێ؟ دەڵێی جلی چێڵەکەی ماڵی باپیرتە، جارێك نەخۆش کەوت ئەوهایان جل دەکرد، ماشەڵڵا ئەو ژنە بە شەمشەمەکوێرە دەچێت.

+قسەی وا مەکە، گوناهت دەگاتێ.

-کورِم تۆش گوناهت دەگاتێ کە دەتەوێت من دەستبەرداری جلوبەرگی نازداری خۆم بم.

+ئەو جلکەی بەرت ئیسلامی نیە، نوێژیشی لێنایە.

-کورِم وا مەڵێ نەنکی نەنکیشم هەر بەو جلکەوە نوێژیان کردووە و

. بە چی دەزانی لێیوەرگرتوون؟

-ئەستەغفیروولڵا، بۆ لێی وەرنەگرتوون؟

+نەخێر، خودا نوێژی وا وەرناگرێت.

-چۆن دەزانی وەریناگرێت؟

+گوتم وەریناگرێت، تۆش ئەگەر دەتەوێت دایکی من بیت، دەبێت ئەو جلکە گاوریە فرێدەیت.

-کوڕم من بەو جلکەوە دایکت بووم، هەر بەو جلکەوەش دایکت دەبم، واز لەو قسانە بێنە، وەرە نانەکەت بخۆ .

+ناخۆم، حەرامە، ئەوەش بزانە دەبینم بە کەیفی خۆت بە دەم پیاوانەوە پێدەکەنیت و لە خودا ناترسیت.

-بڕۆ، هەی حەرامزادەی خوێڕی، گوو دەرخواردی خۆت و ئەوەش دەدەم کە ئەوهات فێردەکات، بڕۆ نەتبینمەوە، من ئیدی هیچ کوڕێکم نیە.

+دەڕۆم، بەڵام خۆت دەگۆڕی، وەرنا بەو دەستانەی خۆم دەتنێرمە دۆزەخ، من ئێستا دەچمە ڕێی جیهاد هەر بەڕێی جیهادیشدا بۆ گیانی تۆ دەگەڕێمەوە.

لە بنکەی پۆلیس، هاوارەکە و رستە بەرازییەکە و مشتومڕەکەی نێوان دایك و کوڕەکەیان تۆمارکرد.

تا هەفتەیەك نەموێرا بچمەوە ماڵەکەم، لە ماڵی پەری خەوتم، رەنگ نەبوو چاو گەرم بکەم ژنە لە خەو تۆراوەکە دەهات، جارێك بە جلکی خوێناویەوە دەهات، جارێك بە جلکی ئاڵوواڵاوە لە زەماوەند دەهاتەوە، هەر جارەی بە رەنگێك بە جۆرێك خۆی نیشانم دەدا، بەڵام لە هەموویان جلکی کوردیی لەبەر بوو، دەیگوت:

درەنگمە، دەڕۆمەوە بەهەشتێ، ماڵم لەوێیە.

ئای ژنە لە خەوتۆراوەکە بەو ماوە کەمە چۆن لە دڵی من جێگەی خۆت کردەوە، چەند خوشکانە دەردەدڵمان بۆ یەکتر دەکرد، من لە چوار مێردان و تۆ لە سێ، لە دوو کوڕ ئەوها بێکەس مابووینەوە، من کوڕێکی شێت، تۆ کوڕێکی خوێنڕێژت خستەوە، چەند جار خۆی دەیگوت:

خۆزی لە خۆزیداران لە جیاتی ئەو کوڕە گوجیلەیەکم دەبوو، گوجیلە سەگێك، خۆ بەرانبەر شیرەکە وەفای دەبوو، تۆ نازانیت ئەو کوڕە چ مەلعوونە، خانووەکەی فرۆشت، هەرچی هەبوو بردی، خۆ من پێش

کەربـوونی کـوڕەکەم گوزەرانمـان زۆر بـاش بـوو، لە هـیچم کەم نەبـوو، ئێستاش ئەوەتە لـیفکە دەچنم، هەڕەشـەکەش لەوێ بوەستێ، چـی بـکەم مـن دەترسـم لەوە رۆژەوە مـن چـاوم نەچـووەتە خەوێ، دکتـۆریش دەڵـێ بێخەوی تۆ چ چارەی نیە.

من دڵی ژنە لە خەوتۆراوەکەم دەدایەوە:

خەمت نەبێت، ئیدی لەمەودوا هەتـا تەمەن مابێت لێرە دەژیـن و خوا چی دا پێکەوە دەیخۆین، خۆ هەتـا مـاڵی پەری مـابن، ئێمە پەکمـان لە هیچ ناکەوێت، تۆ نازانی پەری چ پەریەکە، چ بـابێکی هەیە، سوێندی خواردووە نابێت هـیچ جەمێك ئـاگر بـکەمەوە، نـابینی پەری بە سـینیەوە هەر لە رێیە.

ژنە لە خەوتۆراوەکە هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیگوت:

تـۆ لە خوشـکم زیـاتری، دەزانـم، بە خـودای دەزانـم چ دڵێکـی باشـت هەیە، دەزانم ماڵی پەری چ ماڵێکن ماڵی ئەوها لە هیچ کۆڵانێك نیە، ئەرێ تۆ هیچ مووچەیەکت نیە، بۆچی؟

گوتم:

کچێ مووچەی چی، کێ منی لەبیرە، جگە لە ماڵی پەری.

تا ئێستاش هیچ مووچەیەکم نیە لە هیچ حکومەتێ، دوو مێردم لە پێشمەرگایەتی گیانیان بەخشی یەك لە سەربازی یەك لە هەلاتنی گەورە، کوڕەکەشم بە دەردی حاجی لەقەلەقەکە چوو، دە بە خودا بنەماڵەی حاجی لەقلەق چەند قەرەبووکرانەوە، چەند مووچەیان هەیە منیش هەر هێندە، کەچی ئەوەتە سۆرێ، ژنەکەی نزیك ماڵی ژنە سەگسارەکە کە ژنی جاشێك بوو لە هەموو جاشان گەورەتر، ئێستاش شەهیدانە وەردەگرێت.

نەسە بۆ ناڵێیت، مێردەکەی لە قاچاخچیەتی کوژرا، شەهیدانەی هەیە مێردانەی هەیە، خاتوون، کوڕەکەی لەگەڵ مێردە سەربازەکەی من پێکەوە بزربوون، شەهیدانەی هەیە، منیش لە چوار مێردان مێردانەیەکم نیە، ئەدی کوڕەکەم! ئەدی ئاسك بۆ ناڵێیت یەك جار بێوەژن کەوت، چوار مووچە چوار بێوەژنانەی هەیە، کەچی من چوار جار بێوەژن کەوتمەوە، یەك بێوەژنانەم نیە، نا باش بوو من هیچم نەبوو، نامەوێت لەوانە هیچم ناوێت، ئەوانە ئەمەکیان بۆ پەری و بابی پەری نەبوو، چاوەڕێی چیان لێدەکرێت، بابی پەری بۆ من سەد حکومەت دێنێ.

لەو حەفتەیە کۆڵان شەهیدێك و برینداڕێکی بەخشەیە شار، ژنێك بە دەستی کوڕەکەی خۆی چووە بەهەشت، ئۆی! کوڕ دایکی خۆی

بکوژێت! خودا ئەگەر گوناهباری ئەوها ببەخشێت، من لە بنی نوێژێکی بۆ ناکەم، رۆژووێکی بۆ ناگرم، برینداریکیش بە دەستی دزێك رەنگە پاسەوانی کەسێك بێت.

لەو حەفتەیە بابی پەری پتر بەخشندەیی و میهرەبانیی بە سەرمدا باراند، دایکی پەریش هەر لە دەورم بوو، بەڵام نەمدەتوانی هێندە رووی بدەمێ، پەریش هەر لێم جودانەدەبۆوە، پەری ئەو چەند رۆژە هەر بۆ ئەوەی لە ژنە لە خەو تۆراوەکەم دابڕێنێ و دیمەنە خوێناویەکە لە بیناییم کالبکاتەوە سەرهات لە دوای سەرهات، چیرۆك لە دوای چیرۆکی خۆش و ناسکی بۆم دەگێڕایەوە، تا ئەو دەمە نەمدەزانی پەری لە گێڕانەوەی سەرهاتان هێندە دەسترەنگینە، رەنگە لە رۆژی حەفتەم بووبێت، بە پەریم گوت:

تۆ کە ئەو هەموو چیرۆکە خۆش و ناسکە دەزانی، دە چیرۆکێکی ناسك ناسك بە دڵی من، کە هێشتا روونەداوە، رەنگە لەو رۆژانە رووبدات، بۆم بگێڕەوە.

پەری لە مەبەستم تێگەیشت:

پەلە مەکە، دوور نیە ئەویشت بۆ بگێڕمەوە.

هەر ئەو رۆژە کەسێك کەس نەیدەناسی لە دەرگاوە هەواڵێکی دایە پەری و بزربوو:

لە لای نەخشەسازیگەرماوەوە هاتووم، بە زمانی ئەو پێتدەڵێم:

هەر کەسێك تۆ بخوازێت، گوناهی خۆی لە ئەستۆی خۆی، تۆ تەنها شایەنی نەخشەسازی.

## ١٨

# پەری

بابمم لە هەڕەشەی نەخشەسازی گەرماو ئاگادارنەکردەوە، بەڵام زوو بە کوڕی درەختی گوڵاویم گوت:

تۆ بۆچی خۆت دەخەیتە مەترسی نەخشەسازەوە؟

کەچی ئەو گوێی لێنەبوو، بە پێکەنینەوە گوتی:

خۆزی دەخوازم زەماوەندەکەمان بکەوێتە ئێوارەیەکی بەفراوی، ژوورەکەشمان بڕوانێتە چیا.

خوشکترین دوای ئەو هەموو ساڵە یەکەم جارە بە دارشەقەکەیەوە، دێتە ناو خەڵك، خوشکترین گوتی:

+ئەگەرحەزدەکەیت کەژاوەکەت با بە کۆڵانی ئێمەدا بڕوات.

-پێویست ناکات، من ئەوم لە یادیش نەماوە.

+باشتر.

بە خوشکترینم گوت:

-من هەرەشەکەی نەخشەسازم لە بیرنەمابوو، ئێستا دەترسم.

+ترسی ناوێت، بیستوومە چووەتە هەندەران، وەها زوو ناگەڕێتەوە.

-بەڵام هەر دەگەڕێتەوە.

+ئەودەمەی گەڕایەوە و زانیت نیازی خراپە، ئێوە بڕۆن.

ئەو رۆژە ژنە کەسکپۆشەکە کە لە یەك کاتدا دایکی بووك بوو، دایکی زاواش، ژنە کەسکپۆشەکە لە ئاهەنگی ئەو رۆژە دایکایەتی خۆی بۆ من بۆ کوڕی درەختی گوڵاوی بە دیار خست، دایکێك خودا بۆ دایکایەتیی هێنابووە دنیا، بۆ ئەوەی هێنابووە دنیا کە دە دوازدە منداڵ گەورە بکات، بەڵام حەیف...

کەژاوە رێی کۆڵانی ماڵی پیاوە مەستەکەی نەگرت، بەڵام لای ئەو وێنەگرە وێنەمان گرت کە کوڕی پیاوە مەستەکە زۆر جار دەیگوت:

ڕۆژی گواستنەوە لای ئەو وێنەگرەی برادەرم وێنە دەگرین.

گرتمان, بەڵام لەگەڵ کوڕی درەختی گوڵاوی نەك کوڕی پیاوی مەست، لەو کاتەی سواری ماشێنەکە دەبووم، دیتم ,لاشانێکم دیت، زانی دەیبینم خۆی هاویشتە پەنایێ، ئا هەو بوو، کوڕی پیاوە مەستەکە، دڵنیام بۆ دیتنی من، منی ناو جلکی بووکێنی هاتبوو، بەڵام ئەو دیتنە لای من شتێك نەبوو، وەك ئەوەی هەر هیچ نەبووبێت، خوشکترین هاتە بن گوێم:

دڵنیام لەگەڵ ئەو کوڕە ئاسوودە دەبیت.

قومریش ئەو ڕۆژە هەر دەتگوت قومریە، گوتی:

کوڕێکی وەك ئەوەی خۆت بۆ منیش ببینەوە.

دایکی بووك و زاوا هەتا چاوە چراخانیەکە، لەگەڵمان هات و هەردووکمانی ماچ کرد و گوتی:

هەردووکتان گوێتان لێبێ، من دوای نۆ مانگ و نۆ ڕۆژیتر منداڵێکی جوانم لێتان دەوێت.

کوڕی نەفتفرۆشیش هەتا بەر دەرگای مێوانخانەکە دەتگوت پاسەوانمانە لەگەڵمان بوو.

ئێوارەیەکە ڕەنگە ڕەنگەکان لە ڕەنگی سپی بتوێنەوە، لە نهۆمی سەرەوەی مێوانخانەکە، پەنجەرەی هۆدەکە ڕووەو چیا هەڵکەوتووە، لە پەنجەرەوە ڕووناکایی لایەکی شار دیارە، لە خۆوە لە پێش ئاوێنەکە خۆم دیتەوە، وەی چەند جوان بووم بە جلکی سپییەوە، لە دووری من ڕاوەستاوە، دەڵێی شەرم گرتوویەتی و ڕێینادا لێم نزیکبکەوێتەوە، ڕوو بە ڕووی یەکتر ئەو لەو دیوی تەختەی خەوتن و من لەم دیو، ڕەنگە شەرمم کردبێت، سەرم داخست و پشتم تێیکرد، هات، نەرم نەرم هات، دەستی خستە سەر شانم، ڕێك لە بەر پەنجەرەکە کە پەردەکەی کەمێك کرابۆوە و لەو دەمە بەفر کلوو کلوو دەباری، لێوی هێنا، چاوم داخست، ئۆی لەو لێوە شیرنە، لەو ماچە قووڵە، ئۆی چ شەوێکی سپیە ئەو شەوە، چ شەوێکی شیرینە ئەو شەوە، چ شەوێکی ئەوینداویە ئەو شەوە، من پێشتر هەتا پێش گەیشتنی لێو بە لێو دەمگوت:

ئیدی ئەوین نەما، ئەوەی دەبێت مێردکردنێکی ئاساییە و تەواو.

بەڵام لەو ماچەوە هەستمکرد ئەوین دەبارێت، لەگەڵ بەفر دەبارێت، دەبارێت ودەڕژێتە گیانمەوە، سەیرە ئەوینی من لەگەڵ بەفرە، دەڵێی

دەیزانی ئەوین و باران پێکەوە دادەکەن، بۆیە دەیویست ئاهەنگەکە بکەوێتە شەوێکی بەفراوییەوە، ئەوەتا لەچاوە چراخانیەکە بە تەنیشت یەکەوە دانیشتووین، رەنگە رووناکایی ژوورەکە ئاسایی بێت، دوور نیە کەمێك بەلای تاریکیشدا بکەوێتەوە، بەڵام لە دیدی منەوە رووناکترین ژوورە، رووناکترین شەوە، ئەو شەوە چ شەوێکی سپیە، دنیا سپیە، لە پەنجەرەوە دیارە شار سپیە، دنیا سپیە هەر دەڵێی هەرچی فریشتەی خوداوەند هەیە بە جلکی سپیەوە دابەزیون و سپێتی بە سەر شاردا دابەشدەکەن.

حەفت مانگێکە کوڕی درەختی گوڵاوی دەناسم، جگە لەم شەو تەوقەیەکی لێدەرچێ پەنجەی بەر جێگەیەکم نەکەوتووە، بەڵام دەڵێی حەفت ساڵە دەیناسم و دەمێکە لە سەر جەستەی خۆم نەخشاندوومە و چەندم خۆشدەوێت، ئەگەر زووتر دەمزانی کەسێك پەیدا دەبێت بەو شێوەیە خۆشمدەوێت، خۆم وا لێدەکرد! بۆ کوڕی پیاوە مەستەکە ئەو هەموو خەفەتەم لە خۆم بار دەکرد!

لە دەرێ بەفر لە ژوورێ ئەوین، لە دەرەوە و ژوورەوە بەفری ئەوین، من ئێستا لە ژوورێکم پڕ لە ئەوین، پەنجەرەکەی لە ئەوینەوە بە سەر ئەویندا دەڕوانێت، کوڕی درەختی گوڵاوی شووشە شووشە گوڵاوی

ئەویــن دەپژێنــێ، ئەوەتە لە باوەشــی کــوڕی درەختــی گــوڵاوی لە دوا شەوی پایزێکی بەفراوی، گەرمـایی ئەوین دەڕژێتە گیانمەوە، ئەگەر دەنگم دەگاتە خوشکترین دەڵێم:

دڵنیابە، من لەگەڵ کوڕی درەختی گوڵاوی ئاسوودەم.

بە قومری بڵێم:

خۆزگە تۆش دەچوویە باوەشی کوڕێکی درەختەوە.

ئەگەر دەنگم دەگاتە ژنە کەسکپۆشەکە، دەڵێم:

ئەها ئێستا، هەر ئێستا منداڵێك تۆماردەکەم!

ڕەنگە کاتی ماڵنووستنان بێت، شار کپە، سەیرە کپە، شەوی شار قەد بێ تەقوتۆق نەبووە، دەڵێی چەکدارەکان، جەردەکان، دزەکان، دەزانن مـن و کــوڕی درەختــی گــوڵاوی لە ئەوینــین، متەقیــان لە خۆیــان بڕیــوە و نایانەوێت لە ئەوینمان بکەن، کوڕی درەختی گوڵاوی وەهای دەگوشیم، وەهـای دەمـژیم، پێوەی دیـاربوو جـاری یەکەمە تـامی ژن بکـات، مـن باوەڕم هێنا کە دەستی بەر هیچ ژنێك نەکەوتووە، تـامی ژنـی نەکردووە، ماچی یەکەمی خۆی لە لێوی من تۆمارکردووە، خۆزگەم بە خۆی! نا،

بۆچی خۆزگە، منیش ئەوەتە هەر دەڵێی جاری یەکەممە کوڕ لە باوەش دەگرم، دەڵێی ماچی یەکەممە.

وا دیارە کوڕی درەختی گوڵاوی چیدی بەرگەی نەمابێت، دەیەوێت ئەوەی کوڕی پیاوە مەستەکە، ئەوەی دوو دەمامکدراوەکە بە زۆری و زۆردارەکی کردیان ئەو بە خۆشی بیکات، منیش هەر ئەوەم دەویست، ئەوەتا خەریکە دێتە...

هات، نا ئەوە کوڕی درەختی گوڵاوی نیە، ئەویدیە کوڕی پیاوە مەستەکەیە، با رانەکانم توند بکەم، باشە من ئێستا لای کامیانم، ئەورۆ شووم بە کامیان کرد، ئەوەی لە ئێوارەوە لە باوەشیم کامیان بوو! چی روویدا، خەونە، ئەو زەماوەندە خەون بوو، کوڕی درەختی گوڵاوی خەون بوو، ئێرە کوێیە، نهۆمی سەرەوەی مێوانخانەکە یان ژووری کوڕی پیاوە مەستەکە؟ ژووری داپرتەقاڵ و هەنار و بیە بەرزەکە، من چ لەوە تێناگەم، کوڕی پیاوە مەستەکە ئەوەی ئێستا لە کچی بازرگانەکە منداڵیشی هەیە، ئەوەی لە پێش وێنەگرەکە لاشانێکیم دیت، بەم شەوە چۆن گەیشتە نهۆمی سەرەوەی ئەو مێوانخانەیە و چۆن خۆی هاویشتە ناو ....! ئەدی کوڕی درەختی گوڵاوی چی بە سەر هات ! تازە لە باوەشی من نەبوو! ئەوە دیارە مێشکی لە سەر نیە، دیارە بە پاڵێک

هۆشی نایەتەوە سەر، زللەیەکی توندی دەوێت، رانەکانم توندتر کرد و هەتا هێزم تێدا بوو زللەیەکم خێوانده بنا گوێی کوڕی پیاوە مەستەکە، زللەیەك زرچەی هات، زللەیەك بێدەنگیی ژوور و شار و دنیای شکاند.

ئای! ئەو زللەم لە کێ دا، چاوم رەشکەپێشکە دەکات، کوڕی درەختی گوڵاوی کەی هاتەوە ئامێزم و کوڕی پیاوە مەستەکە کوا! لە بیرمە قیژەیەکم لێدا، چ قیژە! کوڕی درەختی گوڵاوی دواتر بۆ گاڵتە دەیگوت:

مێوانخانە و ماڵەکانی دەوروبەری هەموو زانیان کە پیاوێك بە زاوا بوو.

لە بیرمە کوڕی درەختی گوڵاوی لێم دوورکەوتەوە، پەرداخێك ئاوی دامێ، لێم نزیك نەدەبۆوە و هەر دەیگوت:

ببوورە، ببوورە، چ نیە، چاك دەبیت، چاك دەبیت.

من ترسام لە شێتبوون ترسام، چ ترسناکە لە شەوی بووکێنی شێت بیت، خودایە شێتم مەکە، کوڕی پیاوە مەستەکە بۆ وا دەکات، بۆچی وازم لێناهێنێ، من وازم لێیهێناوە، ناینا‌سم، هەرچی لەگەڵم کرد، گەردنی ئازاد، با واز بێنێت، واز لە کوڕی درەختی گوڵاوی بێنێت، من

ژنی ئەو کوڕە درەختیەم، دەستم بشکی ئەو زللەیەم بۆ لێیدا! گریام بە کوڵ گریام، خۆم هاویشتەوە باوەشی، لە بەر گریان لە بەر فرمێسك زارم هەڵنەدەپچڕی داوای لێبووردنی لێبکەم، ماچم کرد، چاوەکانیم ماچ کرد، تێگەیشت، هەڵەیەك هەیە، تێگەیشت شتێك هەیە، تێگەیشت رابردووێکی تاڵ لەو ساتە خۆی قیت کردۆتەوە، نێوچەوانمی ماچ کرد، نەرم نەرم دەستی بە قژمدا دەهێنا، چەند سەرهاتێکی ناسك و پێکەنیناوی بۆم گێڕایەوە، هاتمە قسە داوای لێبووردنم لێیکرد، ئەو قسەی بە لایەکیدیدا دەبرد، وەك ئەوەی هیچ روونەدابێت، من دەهاتمەوە سەر مەبەست ئەو دوورتر دەکەوتەوە، گوتم:

+دەمەوێت تێتبگەیەنم، بۆچی ئەو زللەیەم لێت دا.

-تێگەیشتم، پێویست ناکات.

+پێویست دەکات، دەزانی...

-دەزانم، هەر وات دەزانی لە زیندانی و دە واز لەو شتە بێنە، با بۆ خۆمان قسەی خۆش بکەین.

+زیندان، نا...

-من حەز بە گێڕانەوەی چیرۆکی ناخۆش ناکەم، کچێ دە تۆ گوێ لە من بگرە، دەزانم ئەو رابردووە تاڵە تا ماوەیەك لێتنابێتەوە، من پەلەم نیە، هەتا لە لات زۆر ئاسایی نەبێتەوە، دەستت لێنادەم، حەزدەکەیت هەر بە تەنیشت یەکەوەش ناخەوین، دە واز لەو شتانە بێنە، من و تۆ پێکەوە لە ژوورێك بین بەسمە، بۆ من هەموو شتێکە.

چەند جاری دەهاتە سەر زارم باسی کوڕی پیاوە مەستەکەی بۆ بکەم باسی دوو پیاوە دەمامکدراوەکەی بۆ بکەم، قسەی دەبڕیم، یان من دەمگێڕاوە و نەمدەکرد، کوڕی درەختی گوڵاوی بە مەیلەو فەرمانکردنەوە و بە پێکەنینەوە گوتی:

لەو بارەیەوە دوا رستە دەڵێم و ئیدی ئەو بابەتە دابخە، دەزانی دوا رستەکە چیە؟

هەندێك هاتبوومەوە سەرەخۆ:

نازانم، هەرچی دەیڵێی بیڵێ من رازیم.

پێکەنی، جوان پێکەنی:

سبەینێ بە ژنە کەسکپۆشەکە بڵێ منداڵەکە لەو وادەیەی دیارت کردووە چل رۆژ دوا دەکەوێت.

منیش پێکەنیم:

نا چل نا، چوار بەسە.

جوانتر پێکەنی، ماچێکی خاڵە سەربەگۆبەندەکەی کرد و گوتی:

بە دڵی تۆ، دەی ئێستا بخەوە، تۆ پێویستت بە خەوە.

باسکی بۆم کرد بە سەرین، ئەوەتا جێی مـن کەوتـۆتە لای دڵـی وی، پەنجەکانی دەستی چەپم لە ناو مووی چڕی سینگی بزر دەبن، خزامە ئەو ئاسوودەییەی کە خوشـکترین لێی دڵنیـا بـوو، خۆزگە کوڕی پیـاوە مەسـتەکە لێـدەگەڕا داخـوازیی ژنە کەسکپۆشەکەشـم دەهێنـایە دی، دەبۆرژێم، تا، دەبێت بۆرژابم، زرمەیەك، قرمەیەك هێندەی بەرز کردمەوە، جامی پەنجەرەی ژوورەکەی ئێمە هاتە خوارەوە؟

هەڕەشەی نەخشەسازیگەرماوم بیرکەوتەوە، دەستم بە لەشی کوڕی درەختیگوڵاویدا هێنا، ئۆخەیش سەلامەتە، درەنگتر پێکەوتم پەنجەرەی ژوورەکەی تەنیشـتمانە نەك هـی ئێمە، کەسـیش بەرنەکەوتـووە، کەسـیش نەیزانی گوللە لە کوێوە هات و بۆ کێ، ویستمان ژوورەکەمـان بگۆڕین، نەمـانگۆڕی، ژوورەکـان هەموویـان رووە و گـوللە بـوون، جیـاوازیەك لە نێوانیان نەبوو، چمان کرد، هاتین راستی پەنجەرەمان بەجێهێشت و هاتینە

پەنا، باشە گوللە راستەوخۆ نایگرێتەوە، خەو زڕا، ئەو شەوە تا بەیانی کوڕی درەخت لە دەورم سووڕا، دەچووە لای پەنجەرەکە و دەستی بۆ بەفر دەگرتەوە، دەهاتەوە لام بۆنی دەکردم، دەستی بە قژمدا دەهێناو دەیگوت:

بخەوە پەری بخەوە، من ئیدی ئێشکگری لە پەری دەگرم، من ئەگەر تەقەش نەبا هەر نەدەخەوتم، دامنابوو زوو دامنابوو لەو شەوەدا هەتا رۆژدەبێتەوە وەك پەروانە بە دەوری رووناکایی تۆدا بسووڕێمەوە، بخەوە مۆمە هەمیشە گەشەکەی ژیانم تۆ بخەوە، تۆ رووناکیت، لەخەوتندا رووناکتر دەبیەوە، بخەوە من ئەو شەو حاڵی ئەوینم گرتووە، زیکری تۆ دەکەم، تا بەیانی نوێژی ئەوین بۆ تۆ دەکەم.

ئەو شەوە نە من خەوتم نە کوڕی درەختی گوڵاوی، ئەو شەوە منیش حاڵی ئەوینم گرتبوو، بەڵام وەك وی گەرم نا.

بۆ بەیانی چووینە ماڵە یەك ژووریەکەی خۆمان، هەر سەر لە ئێوارەوە من خەوتم، نازانم کوڕی درەختی گوڵاوی دیسانەوە لە حاڵی گەرمی ئەویندا بوو یان، ئەوە گەیشتینە شەوی سێیەم، ئەوە دەچمە باوەشی، با بۆی راکشێم و خۆم شل بکەم، ئەوە هات، گەیشتێ و نەگەیشتێ، ئۆی! کوڕی پیاوە مەستەکە ئەو ماڵەشی دیتەوە، دیسانەوە

هاتە جێی کوڕی درەختی گوڵاوی، واز ناهێنێ، ئەو جارە زللەم لێینەدا، پاڵێکی هێواشم پێوەنا، هێواش هی ئەوە نەبوو خۆی تێکبدا، کەچی یەکسەر کشاندیەوە و کشایەوە، ئۆی!

من پاڵم بە کێوە نا، من شێت دەبم، کوڕی پیاوە مەستەکە من شێت دەکات، وازم لێناهێنێ، کوڕی درەختی گوڵاوی دوورکەوتەوە، رووی چەند تەنکە، ئەوجارە بڵێم چی، ببوورە ببوورە، چ کەڵکی هەیە، بەڵام کوڕی درەختی گوڵاوی دڵی لەوە فراوانترە بەو پاڵپێوەنانە بەو زللانە شێلو بێت.

بە ژمار سی و نۆ شەو، هەر کاتێ دەمویست لەگەڵ کوڕی درەخت سەرجێیی بکەم، کوڕی پیاوە مەستەکە دەگەیشتە سەرمان و ئەوی لادەدا و بە خۆی دەهاتە جێی وی، منیش پاڵێکم پێوەدەنا، لە کاتی پاڵەکە کوڕی درەختی گوڵاوی دەهاتەوە و ئەو بزر دەبوو.

چلەمین شەو کوڕی درەختی گوڵاوی هات، چەندی چاوەڕێم کرد، نەهات کوڕی پیاوە مەستەکە نەهات، چەند چاوم تێبری، خۆی بوو، کوڕی درەختی گوڵاوی بوو، لە ئامێزم مایەوە جێگەی خۆی بۆ کەس چۆڵنەکرد، بەزی، کوڕی پیاوە مەستەکە بەزی، لەو شەوەدا ماچێکی قووڵ، کوڕی درەختی گوڵاوی گۆتەنی کە لەگەڵ شەوی یەکەمی

تێکەڵ کردبوو، هەموو ساڵێ لە یادی یەکەم ماچی خۆیدا بۆمنی دەگوتەوە، بە بێ ئەوەی یەك وشەش بپەڕێنێت زیادی بکات، دەیلێتەوە:

ماچێکی قووڵ قووڵتر لە تەمەن، ماچێکی شیرین شیرنتر لە ژیان، ماچێکی نەمر، نەمر وەك ماچی یەکەم، نەمر وەك ماچ خۆی، ڕەنگە هەر لەو شەوەش پەری بەری ماچی گرتبێت، ئەو شەوە بەفراویە چ شەوێك بوو، چ کودەتایەکی سپی بوو بە سەر تەنیاییدا، چ تێکەڵبوونەوەیەکی سرووشتیانە لەو شەوەدا هاتە دنیا، هەر دەبێ ماچ زادەی ئەو شەوە بووبێت، ئەرێ ئەو شەوە بەفراویە خەونە یان ڕاستی، با لە پەری بپرسین.

منیش دەمگوت، منیش دەڵێم:

خەونێکی ڕاستیە، ئیدی تۆ بابی ماچی.

لای من شەوی چلە شەوی یەکەم بوو، شەوی هەنگوین بوو، شەوەکانی پێشوو کوڕی پیاوە مەستەکە دەهات و شەوی لێ بە ژەهر دەکردم، وای لە کوڕی پیاوە مەستەکە، دەڵێی جادووی لێ کردووم، شەوی دوای شەوی چلە، لە کاتی خۆی بێ دواکەوتن لە پەنجەرە بچووکەکەوە کە بن پەردە ئەستوورەکەوە خۆی نیشانم دا بەڵام نەمهێشت

بابی ماچ هەستپێبکات، رانەکانم توند نەکرد، شەوی دواتر، دیسانەوە دیتمەوە لە کاتی خۆی لە پەنجەرەی هەواییەوە تیچاوێکی دامێ، ئەوجارەش چاوی خۆم داخست و بابی ماچ کاری خۆی کرد، شەوەکانی تر زۆربەی شەوەکانیتر لە کاتی خۆی، بێ دوا کەوتن کوڕی پیاوە مەستەکە هەر جارەی لە جێگەیەکەوە خۆی نیشانم دەدا، هەر جارەی جێگەیەکی خۆی نیشانم دەدا، قساندەکات گوێم لێیە قساندەکات، نایەلێت بە دڵی خۆم چێژ لە بابی ماچ وەرگرم، وازناهێنێت گلەیی هەیە، لە بن لێوانەوە قسەدەکات، من تێیدەگەم، بەڵام گوێی پێنادەم، ئیدی من شتێکم لەگەڵ ئەو نیە، بۆچی رێنادا من چێژی چێژی سەرجێیی ببینم! من و بابی ماچ هاوسەرین، من لەگەڵ بابی ماچ لەماڵێکی ئەویناوی بۆ هەمیشە لە ژوانین.

هەر لە یادی ساڵێکی رێك بە سەر تێپەڕینی یەکەم ماچی کوڕی درەختی گوڵاوی کە دەکەوێتە دوا شەوی پایز، من بە ئاشکرا ناوم لە کوڕی درەختی گوڵاوی نا( بابی ماچ) و کەسێك نەما بە ناوی کوڕی درەختی گوڵاوی.

لە دووەم ساڵوەگەڕی دوا شەوی پایز، شەو درەنگان لە باوەشی یەکتر بووین، کاتی ئەوە بوو کە وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی کوڕی پیاوە

مەستەکە دیارکەوێت و سەرو دڵم بگرێت، بەڵام لەو دەمە لە جیاتی خۆی شتێکی بە پەنجەرەکەدا دادا، نا شت نەبوو، دەست بوو لە پەنجەرەکەی دا، دەستی ئەو یان کەسێکیتر، خێرا خۆمان لەبەر کردەوە، بە بن دەرگاوە خۆمان گرت، هەستمان راگرت، چ دیار نیە، هەست و خوست نیە، چ نەبوو، بە حەوشەکەدا گەڕاین شتێکمان نەدیتەوە، کە رۆژ بۆوە من هەر دەگەڕام بە حەوشەدا دەگەڕام ئێ شتێك شوێنەوارێك ببینمەوە، ئاخر ئەو شەو شتێك بەو پەنجەرەیە کەوت، دەستێك بەو پەنجەرەیە کەوت، بەرد، نا بەرد نەبوو، ورد لە پەنجەرەکەم دەڕوانی بە دوای درزێك قرنجانێکدا دەگەڕام، بەڵام شتێکیدیم دیتەوە، لە سەر جامی سەرەوەی پەنجەرە بە خەتێکی سووری ورد نووسراوە:

پەری هێشتا نەچووە بچێت، چەندی زوو تەڵاق لە مێردەکەت وەرگریت، گیانی پارێزراوترە.

# ١٩

# کوڕی نەفتفرۆش

هەر ئەوەتە دێتە بیرم، باپیرم کە لە سەر ڕۆخی گۆڕ بوو دەیگوت:

قسەی من نیە هی باپیرمە، هەر نەوەیەك لە تەمەنی خۆی بە لای کەمیەوە گرانیەك دەبینێت، من گرانیی گەورەم دیوە، بابم گرانیی دیوە، باپیرم گرانیی گەورەتری دیوە، هاییدار بن کوڕەکانیشم نەوەکانیشم دەیبینن.

منیش دیتم گرانیی گەورەم دیت، ئەو ڕۆژانەی لە سەر پردێ تەڕەم دەفرۆشت، ڕۆژانی سەرەتای گرانی بوون، گرانی ڕۆژ دوای ڕۆژ گرانایی پتر دەبوو، ڕۆژانە دیمەنی گرانیی گەورەم دەدیت، بەڵام تا هەواڵی گوارەکانی دەستی دایکم نەبیست، ترسناکایی گرانی بەو رادەیە نەیترساندبووم، دایکم یازدە ساڵ هەموو ڕۆژانی چوارشەمە پێش ڕۆژئاوابوون، هەقی نەبوو بارانە، تۆفانە، گەرمایە، گوارەکانی لە ناو

چه‌فیه سوورباوه‌که ده‌رده‌هێنا و ده‌هاته سه‌ر ده‌رگای حه‌وشه، یه‌ك یه‌ك ئه‌و ژنانه‌ی له کۆڵانێ له سه‌ر ده‌رگا راوه‌ستابوون، دانیشتبوون، ده‌چووه لایان بانگی ده‌کردن:

ئه‌ها گواره‌کانی غه‌زال ببینن، غه‌زالی کچم، شه‌و و رۆژێکی له گوێ کرد، ئه‌دی سێشه‌مه عه‌سره‌که‌ی بۆیم نه‌کڕی، ئه‌دی چوارشه‌مه درەنگانی عه‌سر ئه‌وده‌مانه، لێره له به‌ر چاوی هه‌مووان، پارچه ئاسنێك له ئاسمانه‌وه نه‌هات، نه‌چه‌قیه سینگی غه‌زالی من، ئه‌دی ئه‌و چه‌فیه سووره‌شی له سه‌ر نه‌بوو؟

ئه‌ها هێشتا ته‌ڕه، ده‌ستی بده‌نێ هێشتا ته‌ڕه، خوێنی غه‌زالی من هێشتا وشك نه‌بۆته‌وه، تا فڕۆکه‌یه‌ک له ئاسمانێ له دنیایێ بمێنی، خوێنی غه‌زالی من وشك نابێته‌وه، گوێ له من بگرن له‌گه‌ڵه‌نگۆمه، ژنینه به قسه‌ی من بکه‌ن، نه‌که‌ن رۆژی سێشه‌مووان هیچ شتێك بکڕن، هیچ تێکه‌ولێکه‌یه‌ك بکه‌ن، من کوێراییم دایه، ده‌سته‌کانم بشکێ، خۆ ده‌مزانی سێشه‌مووان و شت کڕینیان نه‌گوتووه، به‌ڵام یاخوا نه‌گه‌مه ئێوارێ، کڕیم گواره‌م بۆ غه‌زالی جوانه مه‌رگم کڕی، ئه‌وه‌تا گواره‌کانی، ئه‌ها چه‌ند زه‌رد و جوانن، هه‌ر ده‌ڵێی گه‌ردنی زه‌ردی غه‌زاله‌که‌من، ئه‌ها چه‌فیه‌که‌ی غه‌زاڵم چه‌ند سووره هه‌ر ده‌ڵێی سه‌ری روومه‌تی

غەزالەکەمن، تو خوا ئەو کاتەی دەمرم بە بیری نەفتفرۆشی بێننەوە کە ئەو چەفیە و گوارەیە لە بیرنەکات، لەگەڵمدا بیانخاتە گۆڕەکەوە، ئاواتی من هەر ئەوەیە کە چەفیە و گوارەکانی غەزال لای خۆم بن، لە گۆڕیشدا لێم جودا نەبنەوە.

دایکم یازدە ساڵی رێك وەرز وەرز، مانگ مانگ، چوارشەم چوارشەم پێش رۆژئاوابوون لەو سەرەوە تا ئەوسەری کۆڵان دەرگا دەرگا، ژن ژن، دەگەڕاو قسەکانی خۆی کە لە نوێژ جوانتری لەبەر بوو، دەیگوتەوە، هەبوو ناویان لەو قسانەی دایکم نابوو:

ئایەتەکانی دایکی غەزال.

حەیف! منیش دەڵێم حەیف، دایکم بە ئاواتەکەی ناگات، نیوەڕۆیەك خوشکە منداڵکەم بە دایکم دەڵێ:

دایە، لە ماڵی حەلا بۆنی گۆشت دێت، هەموو رۆژێك لە ماڵیان بۆنی گۆشت دێت، بەڵام بۆنەکەی ئەورۆ گەلەك خۆش بوو، دایە، دەی با لە ماڵی ئێمەش هەموو رۆژێك نا تەنها ئەورۆ با بۆنی گۆشت بێت.

حەلا کچی ئەو پیاوە بوو کە پێشتر پێش رۆژی رابوون پاسەوانی پارێزگار بوو، دواتر بووە پاسەوانی نەخشەسازی گەرماو، وەختانێك زوو

زوو لە تەلەفزیۆن نیشانی دەدا کە دەتگوت شۆفەڵە رێی بۆ نەخشەساز دەکردەوە.

ئیدی دایکم بەرگە ناگرێت، گوارەکانی غەزال دەباتە ناو زێڕنگران و بە گۆشتەوە دەگەڕێتەوە، دایکم هەر ئەو رۆژی خەڵکی کۆڵان لە گوارەکە ئاگادار دەکاتەوە، بە چەفیەی رووتەوە، رووت لە گوارە، ماڵ ماڵ دەگەڕێت، بە گریانەوە دەڵێت:

گرانی گرانی، گرانی نەیهێشت گوارە جوانەکانی غەزالی جوانم لەگەڵ خۆم ببەمە گۆڕەوە، بەڵام چەفیە، چەفیەی بەتاڵ لە گوارە، لەگەڵ خۆم دەبەم، توخوا کە مردم چەفیەکەی غەزالم لە سەر سینگ دانێن، ئای ئێستاش...

مردنی یەك لە دوای یەکی شێتەکانیش هەر لەو پایزەوە لەو زستانەوە دەستیپێکرد، ئەو ساڵە بە ساڵی مردنی شێتەکان چووە یادەوەری شارەوە، لە ماوەی پەنجا ساڵ هێندەی ئەو ساڵە شێت نەمردووە، لەو ساڵانە جگە لە کوڕەکەی ژنە کەسکپۆشەکە، هیچ شێتێك بە گوللە نەمردووە، پێش کوڕی ژنە کەسکپۆشەکە یەك شێت لە رۆژی هەڵاتنی گەورە شێتێك بە دەستی پاسەوانانی کۆمار کوژراوە، هەر ئەو دووانە و بە گوللە مردوون، هەموویان یەك لە دوای یەك لە برسان لە سەرما رەقهەڵدەهاتن و گیانیان

دەبەخشیە شاری دڵڕەق، هەر لەو ساڵەوەش شار دڵرەقیی خۆی نیشاندا، بەزەیی بە شێتەکانی نەدەهاتەوە، بەزەیی بە دەرۆزەکەرەکانیدا نەدەهاتەوە، پێشتر شار بەبەزەییترین شاری دنیا بوو، هەمیشە دەستی بۆ گیرفانەکانی دەبرد و هیچ دەرۆزەکەرێکی خۆی نامراد نەکردووە، زستانان ئەگەر بە پەلکی سنەوبەرەکانیشی با، بە پەلکە وەریوەکانیشی با، شێتە سەرمابردەلەکانی خۆی، دەرۆزەکەرە بێ جێورێیەکانی خۆی دادەپۆشی و گەرمی دەکردنەوە، شار پێش ئەو ساڵە هەمیشە لە مزگەوتەکانی خۆیەوە، لە پەنا تاریکەکانی خۆیەوە لەگەن لەگەن شیوی رێزدەکرد و کەس شەو بە برسێتی سەری نەدەنایەوە، لەو ساڵەوە چەتە و رێگری دنیا لەو دیوی زێیەکانەوە هاتن و شاریان رووتکردەوە، وەك لەپی دەست رووتیان کردەوە، وەك درەختە وەرزیەکانی دەم بای کۆتایی پایز رووتیان کردەوە، چەتەو رێگری دنیا هاتن و بە رێنوێنی چەتەکانی شار، لە شەقامەکان لە سەرە کۆلانان بازگەی گومرگیان دانا، جامە ماستیان گومرگ دەکرد، دەستەی هێلکە و عەلاگەی کولێرەیان گومرگ دەکرد، چەتەو رێگری ئەو دیوی زێیەکان چیان گومرگ نەدەکرد، دەرۆزەکەر دەبوو گومرگ بدا، چەتەو رێگرەکان چیان نەدەکرد، نەخۆشیی شێتبوونیان بە شار وەرکرد، ئەگەر مردن بە ناو شێتەکان وەرنەبا، شار جێگەی شێتی لێدەبۆوە! شێتێك دەمرد یەکیتر شێت دەبوو، چەتەو

رێگرەکان چەند کەسیان شێتکرد، رۆژ نەبوو هیچ کۆلانێك شێتێکی نوێ بە شار وەرنەکات، برسێتی شێتی دەخستەوە، برسێتی شێتی دەبردەوە، دایکم دوای فرۆشتنی گوارەکانی غەزال، هێندەی نەبرد شێت بوو، نابینن ئەو ژنەی ناوە ناوە لە باخەڵی چەفیەکی سوورباو دەردێنێ، تێر تێر بۆنی دەکات و لە باخەڵی دەنێتەوە، ئەو ژنە دایکی منە، دایکی کوری نەفتفرۆش، گوێتان لێنیە، لێی نزیکببنەوە، دەبیستن:

گوراەکانی غەزالم بدەنەوە، پارەکەم بۆ هێناونەتەوە، گوارەکانی غەزال، غەزال.

ئەوە دەنگی دایکی منە، منیش پەری نەبا شێت دەبووم، وەك دایکم شێت دەبووم، پەری دڵی باشە، گوزەرانیان لە ئێمە باشتربوو، کاتێك بیستی دایکم گوارەکانی فرۆشتووە، ئاگری گرت گەلێك سەرکۆنەی کردم:

+خۆ من سەد جار پێمگوتی، ئێمە گوزەرانمان خراپ نیە، شەرمی ناوێت.

-نا، من شەرم لە هەر کێ بکەم لە تۆ ناکەم، تۆ خوشکە هەمیشە دڵسۆزەکەی منی.

+نا، ئەگەر ئەو خوشکە بام کە باسی دەکەیت، نەدەبوو...

لە دوای گوارەکانی دایکمەوە چەند جار پەری خوشکانە زۆر خوشکانە بە شێوەیەك کە شەرمەزاری لێنەکەوێتەوە بە شێوەیەك هەر لە خۆی دێت، بێئەوەی من ئاگام لێبێت، یارمەتیی ماڵمانی دەدا.

هەر لە ساڵی شێتبوون و مردنی شێتەکان وکوژرانی کوڕە شێتەکەی ژنە کەسکپۆشەکە، نیوەڕۆیەك بە رێکەوت لە خولگەی کۆترەکە پەریم دیت، پەری رەنگی پەڕی بوو، سەرەتا نەیدەویست چ بڵێ:

+چ نیە، شتێکی وا نیە.

-پەری لەو رۆژەوەی فڕۆکەکە غەزالی خوشکمی لێسەندین، تۆ بوویتە خوشکم، جگە لەوەش من و تۆ شتمان لە یەکتر نەشاردۆتەوە، ئایا ئەو کێشەیە هێندە تایبەتە پێویست ناکات من بیزانم؟

+نا، تایبەت نیە.

-ئێ، دە بە منی بڵێ، بزانم چیە؟

+نەخشەسازی گەرماو هەڕەشە دەکات.

-چۆن؟!

هەڕەشەی نەخشەساز فشە نیە، ئەوە نیە بە هەندی وەرنەگریت، خۆی هەمموو شتە، بە ئاماژەیەکی ئەو ریزە پیاوێك دەکوژرێت، بە فیکەیەك هەرچی سەگوسوار هەیە لە دەوری خڕدەبەنەوە و دەست لە سەر سینگ بۆی رادەوەستن، نەخشەساز قەت ئەو پیاوەی پێش وەرزی رابوون نیە، ئەو سالانە هەر سالی مردنی شێتان و شێتبوون و گرانیی گەورە و فرۆشتنی گوارەی مردووان نەبوو، ژن نوێکردنەوەش هەر لەو سالەوە دەستیپێکرد، سالی بە زۆر تەلاقدانیش بوو، بە کوشتدانی ئەو پیاوانەی ژنەکانیان لە جوانیدا بێ وێنە بوون، هەر لەو سالانەوە سەری کرد، مێردی پەری لە هەموو ئەو پیاوانە پتر شایەنی بە کوشتدان بوو، هەر نەخشەسازی گەرماو نا بەرپرسیتریش هەبوون چاویان بڕیبووە پەری، من دەمبیستەوە، لەو لاو لەم لا دەمبیستەوە، بەلام لای پەری قسەم نەدەکرد، رەنگە خۆیشی ئەم قسانەی بیستبێتەوە.

پەری ناهەقی نەبووکە نەیدەویست بۆم باس نەکات، دەزانێت کێشەی من لەگەڵ وی کەم نیە، ئەوە نەبوو زوو هێشتا هێندەش گەورە نەببوو، دیار بوو قسەی بیستبووەوە، من قسەم دەکرد، رۆژێك لە دوای ناردم، نەچووم، بە دوایدا ناردمەوە نەچووم، ئەوجارە گوتبووی لە کوێ دەلێ دەمەوێت بیبینم، ئیدی چووم:

+من دەزانم تۆ چەند ماندوویت، حەزدەکەم بێیتە لای خۆم.

-من ئیدی حزبایەتی ناکەم.

+بەڵام خۆ لەو خۆپیشاندانەی دوایی کە دژی حکومەتی خۆمانە تۆش بەشداربوویت.

-ئەوە چ پەیوەندی بە حزبایەتیەوە نەبوو، من وەك کەسێکی سەربەخۆ بەشداریم کردووە و بۆ مەبەستی...

+تۆ لەوە گەڕێ، دەزانم گوزەرانت باش نیە، دەمەوێت یارمەتیت بدەم.

-بەڵام من پێویستیم بە یارمەتی نیە.

+مەبەستمە بڵێم وەرە لای خۆم و دەتکەمە بەرپرسی پاسەوانەکانم.

-من جاشایەتی ناکەم.

+جاشایەتی!

لە سەر ئەو جاشایەتی گوتنە سێ ڕۆژ لە ئاسایس زیندانی کرام بە تۆمەتی تابووری پێنجەم، لە زیندانی ئاسایشێکم دیتەوە پێشتر ئەمن

بوو، ئەویش منی ناسیەوە، باش بوو بە بزەیەکی تاڵ وازی لێم هێنا، بزەیەك ئەگەر بیکەیتە رستە وا دەردەچێت:

من و تۆ لە هەموو دەور و زەمانێك لێرە یەکتر دەبینین.

بەڵام ئەو سێ رۆژ زیندانیەم بۆ پەری نەگێڕابووەوە.

بە ناو تەقوتۆقی شاردا رۆیشتین، پەری و مێردەکەی و منداڵەکەیم لە ماڵێك جێ کردەوە، جێی متمانە، پێشتر پێش رابوونی شار ماڵی شۆڕش بوو، کوڕێکیشیان پازدەساڵی رێك لە چیا بوو، بەڵام هەر زوو دانیشت و لە نانەواخانەیەك ئیشی دەکرد، پاکانەی لە پێشمەرگایەتی کرد، ناوی ببووە پاکانەنووس، درەنگ ناسیم و زوو بووینە برادەری گیانی، دواتر پێکەوتم پاکانەنووس و پەری باش یەکتریان دەناسی، ئەو ماڵی شۆڕشە نەخشەساز پێینەدەزانی، بە پەریم گوت:

+ئەو ماڵە پێشتر ماڵی شۆڕش بوو.

-ئێستاش ماڵی هەڵاتووان لە شۆڕش!

+ئێوە لێرە بمێننەوە، تا ماوەیەك، بزانین چۆن دەبێت.

-باشە، بەڵام ئیدی رەنگە لەو شارە جێگەمان نەبێتەوە.

+کێشـەکان ئـاڵۆزتر دەبـن، رەنـگە وا نەکەوێـتەوە کە ئێـوە ئێـرە بەجێبێڵن.

هەر سێکیانم لە مـاڵی هەڵاتـووان بە جێهێشـت، چـوومەوە مـاڵ و لە دەفـتەری یاداشـتەکانم بە نـاوی سێ هەڵاتـوو تۆمـارکراوە، ئەو شـەوە لە یادەوەریی منـدا سێ ناوی هەیە، بە سێ نـاو تۆمـار کراوە، ئەو شـەوە لە یـادەوریی منـدا بە شـەوی هەڵاتنـی پەری دەناسـرێتەوە، لەو شـەوەوە لەو هەڵاتنەی پەریەوە، هەرچی شۆڕشە لە واتـا بەتـاڵبۆوە، لەو هەڵاتـنەوە لە یادەوەری من شۆرشگێڕی بۆ هەمیشە کوژایەوە، ئەو شـەوە لە یـادەوری منــدا بە مەرگــی قــومری دەناســرێتەوە لەو شــەوە گــوللەیەکی بــرا گەلحۆکـان بە نێـوان هەردوو مەمکـی قـومری دەکەوێـت و پەریـش بە سەری راناگات، لەو شەوەوە بە کوشتنی قومری شەڕی براکـان گەیشـتە پـۆپە، ئەو شـەوە لە یـادەوری مـن بە سـەمای شـیراتۆن دەناسـرێتەوە، هەرچی گوللە هەیە رووی لە باڵەخانەی شیراتۆنە، لەو شـەوەوە هەرچـی رقە لە رێی گوللەوە رژا، لەو شـەوەدا شـیراتۆن لە شاشـەی تەلەفزیـۆنەوە دەتگوت سێبەری سەماکەرەیە، لەو شەوەوە پیرۆزی لە شـار وەرگیـرایەوە، ئەها ئەوەتە لێرە، ئەو سـاڵانە چـی رووینەدا! پێش ئەو سـاڵانە دەفـتەری یاداشــتی رۆژانەی مــن درەنــگ پــڕ دەبــوونەوە، ئەهــا ئەو دەفــتەرانە هەموویــان رووداوی ئەو رۆژانەن رۆژانــی ســاڵانی شــووم، بە ســاڵە

شوومەکان لە دەفتەرەکانیدی جیا دەبنەوە، ئەو دەفتەرانە دەبێت بپارێزم بۆ هەمیشە دەبێت بمێننەوە، من ناوە ناوە بۆ خۆمیان دەخوێنمەوە:

ساڵی ئەتك، ئەورۆ لە دەوروبەری شار شەڕ گەرم بوو، دەڵێن شەڕ دەکەوێتەوە شارەوە، ئەو ئێوارەیە من بە عەرەقی قاچاخ داوەتی پاکانەنووسم، لە یانەی مامۆستایان مێزێکی لاچەپمان گرتووە، پاکانەنووس لە پێکی سێیەم گوتی:

+دەزانم تۆ رۆژانەی شار دەنووسیتەوە، بۆیە هەندێك رووداو هەن کە زۆر نهێنین پێویستە تۆماربکرێن.

-من هەر شتێك ببینم یان لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە بیبیستم تۆماری دەکەم.

دەنگی هێواش کردەوە:

+من نهێنی زۆری ... لایە، ئا با لەم رستەیەوە ناوی بنێین ئەتککەر، ئەها ئەو تەسبێح کەسکە خزمیانە.

تیچاوێکم دایە تەسبێح کەسکەکە، گوتم:

-هەر بە راستی نهێنیی ئەتککەرت لایە؟ تۆ دەیناسیت؟

+دەمێکە دەیناسم، کاتی خۆی لە چەند شەڕێکیش پێکەوە بووینە، زۆر برادەر بووین، زۆر.

-ئێ

+هەتا ساڵ و شتێکیش لەوەوبەر پەیوەندیمان هەبوو، یانی جارویار یەکترمان دەدیت.

-پەیوەندیتان چۆن تێکچوو؟

+ئێ، نهێنییەکە لێرەوەیە، زۆر جار دەینارده دووم کە بەگەڵیان بکەومەوە و پلەیەکی باش وەرگرم، ملم نەدەدا، شەوێك لە ماڵەکەی خۆی داوەتی کردم، بە نابەدڵی چووم، ڕەنگە پتر بە مەبەستی شارەزابوون لە ماڵیان رازیبووبم، ویستم بزانم ئەتککەری ماڵەوە ئەتککەری سەر تەلەفزیۆن چ لێکنزیکایەتیەکیان هەیە، بە هەر حاڵ چووم، مێزێکی رازاندبۆوە، چی لە سەر نەبوو! من هەر ناوی ئەو هەموو خواردنەوەیە نازانم، ئەو هەموو مەزە و میوە و ماسی و نازانم چی.

-شەرابی سووری لەگەڵ بوو؟

+ئەتو قسەم پێ مەبڕە، ئێ، لە ماڵەکەی پێنەدەچوو ژن و منداڵ هەبن، هەر پاسەوانەکان دەهاتن و دەچوون، بە راستی نەمپرسی کوا ژن و منداڵەکانت، ئێ، خواردیەوە هەر خواردیەوە، بەڵام من هێدی هیدی پێکم هەڵدەدا، هەر وەك هەوکە.

-چ بوو نەگەیشتینە نهێنیەکە، ئەوها بڕوا من مەست دەبم و...

+تەواو، مەســـت مەبە گەیشـــتینێ، بە کــورتی زۆر بە کـــورتی دەیگێڕمەوە، ئەتککەر بە مەستی هاتە قسە:

کاکی خۆم من بۆ تۆمە دنیا گۆڕاوە، مـن تـۆم خۆشدەوێت، لامـل مەبە، وەرەوە، ژیانت خۆش بکە، ئێمە چەند ساڵە بە شاخەوەین، مـردین، با تـۆڵەی بکەینەوە، مـافی خۆمـانە شاهانە بژین، کـاکی خـۆم تەمەن چەندە! ئەگەر چێژ لە ژیان وەرنەگرین، من بێ دڵی خۆم ناکەم، دەزانـی مـن هەفتـانە ژنـم هەیە، رەنـگە بـاش لەو زاراوەیە نەگەیـت، چـونکە زاراوەیەکی شاریە، شاخی نیە.

ئەو شـاری و شـاخیە سـەرودڵمی گـرت، بەڵام بە سـەرخۆم نەهێنـا، لێگەڕام بزانم دەگاتە کوێ.

هەفتانە ژن، یانی من هەر هەفتەی لەگەڵ ژنێك یان کچێك دەبم، بۆ ژنەکانیش باشە، پارەیەکی باشیان دەدەمێ، بەڵام بڕوات بێت هەتا ئێستا ئەو کچانەی هاتوونەتە لای من، هەر بە کچی چوونەتە دەرەوە، لاقەم نەکردوون، ئەها ئەو ئەلبوومە، دیدڤانە، دوایی نیشانت دەدەم، وێنەی مەمکی هەموو ئەو کچانەم بە کامێرای خۆم گرتووە، بە شێوەیەکیش کەس ئەو کچانە نەناسێتەوە، دەزانی ئەو کارە چ چێژێکی هەیە؟

حەزم لێبوو ئەلبوومەکە ببینم، ئەلبوومەکەی هێنا، وابوو، وێنەکان هەر سینگ و مەمك بوون، نزیکەی چل وێنەیەك دەبوو، هەندێك ناویشی گوت، وەك ئەوەیان کچی فلان کەسە، ئەوەیانماڵی لە فلان گەڕەکە.

-دوایی؟

+وا بزانم منیش زۆرم خواردبووەوە، شتێکی ئەوتۆم لە بیر نیە، هێندە نەبێت، من سوور بووم لە سەر چوونەوەم بۆ ماڵ، ئیدی بە پاسەوانەکانی منی گەیاندەوە ماڵ، دوای ئەوە، جارێك بە دوایدا ناردم نەچووم، ئێستاش نەچووم.

ساڵی دزینی کێلی مەڕمەڕی گۆڕەکان، مجێورەکەی گۆڕستانی چراغ زوو زوو بە زۆر کەسێك رادەگرێت و بۆی دەگێڕێتەوە:

بە چاوی خۆم دیتم، رووتەلەیەك کێلی گۆڕێکی بە شانی خۆیدا دا، لەو کاتە بە گوێی خۆم بیستم مردووەکە گوتی:

مەیبە، ناومی لە سەرە، با بزر نەبم.

ساڵی دزینی شێرەی ئاودەستی مزگەوتەکان، فەقێیەکی مزگەوتی حاجی لەقلەقان، بۆ برادەرەکانی گێڕابۆوە:

لە سەر دەرگای ئاو دەستەوە دیتم پیاوێك کەشیدەشی لە سەر بوو، شێرەکەی لێدەکردەوە، گوتم :

حاجی دزینی ماڵی خودا حەرامە.

حاجی بێ خۆ تێکدان گوتی:

تا ماڵ پێی بوێت، مزگەوت بە تاڵە.

ساڵی تیزاب، پەری لە بارەی ژن و لەچکەوە گوتەیەکی هەیە زۆر لە برادەران زۆری دەڵێنەوە:

هیچ شتێك هێندەی تیزاب قژی نەخستە لەچکەوە.

ئەورۆ کاتژمێر چوار و چارێگی دوای نیوەڕۆ بە کاتی هەولێر، لە نزیك چایخانەی قەرداران، کچێکی تا دەست هەڵبڕی بالا بەرز، قژێکی پڕی درێژ، بەستبووی، دەنا شەقامی دەخستە خرۆشانەوە، دەزانی چ بایەك هەڵیکردبوو، قژی درێژی دەم با چ ناخاتە هەلەکەسەماوە! کچە لە پێش منەوە دەڕۆیشت، من لە سەر شۆستە ئەو لە سەر جادە، شان و ملی کەمێك رووت بوو، دیتم ترومبێلێک هێواشی کردەوە، من هیچم نەدیت، کچە هاواری لێبەرزبۆوە، ماشێنەکە تیژ دەرچوو.

چیە، چیە؟

دەستی بە گەردنیەوە گرتبوو، بووە هەرا:

تیزاب بوو، تیزاب، دیتم پێیدا کرد، ئەوەتا سووتا...

ساڵی تەقینەوەی ئارایشگاو فرۆشگا، ئارایشگای سەرەوەی پردەکە ئەورۆ کاتژمێر پێنج و پێنج خولەکی سبەینێ کە هێشتا رۆژ لە چیاکانیش هەڵنەهاتبوو ئاگری گرت، من لە زاری شاگردی نانەواخانەکە کاتی ئاگرکەوتنەوەکەم تۆمارکرد، رۆژی پێشتر کە هەینی

بوو لە مزگەوتی منارە درێژەوە بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، مەلا بە دەنگێك کە دەتگوت لە بەرەی شەڕ و غەزاوە دێ دەیگوت:

برایانی موسڵمان، نەکەن رێی ژنەکانتان رێی کچەکانتان، خوشکەکانتان بدەن بۆ خەڵکی خۆ بڕازێننەوە، نەهێڵن بە نزیك ئارایشگاکانیشدا تێپەڕن، ئارایشگاکان ژنەکان، کچەکان قاچپەدەکەن، کوا پیاوەتی پیاوەکانی شار! کوا موسڵمانێتی! ئارایشگەکان رۆژ بە رۆژ زیاد دەبن، ئەدی مەیفرۆشەکان! ئەستەغفیروللا، ئەستەغفیروللا، هەر کەسێك ئەو جێگایانە ئاگر دات، گوناهی گەورەشی کردبێت، هەرگیز بە ئاگری دۆزەخ ناسووتێت.

ئەو ئارایشگایە دەستەخوشکانی پەری ناویان نابوو ئارایشگای پەری، ئاخر پەری بە قسەی خۆی یەك جار چۆتە ئارایشگا ئەویش لە رۆژی شووکردنی، ئارایشگاکەش ئەوە بوو کە سووتا، کاتێ هەواڵەکە گەیشتبووە پەری، گوتبووی:

دامنابوو لەو ساڵەوە یادی شووکردنەکەم بە چوونە ئارایشگاکەی خۆم بکەمەوە، مەلا هێندەشی پێ رەوا نەدیتم.

ئەورۆ رێك كاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ، مەیفرۆشەكەی نزیك ئارایشگاكە ئەو ئارایشگایەی پێش سێ رۆژ ئاگری گرت، بە دەمانچەی بێدەنگ شەهید بوو، مێردەكەی پەری ناوی شەهیدی بە سەردا بڕی زۆر برادەریەتی، زوو زوو سەردانی دەكرد، مێردەكەی پەری وای گێڕایەوە:

من لەو بەر بووم، هێشتا نەپەڕیبوومەوە، دیتم دووكەس بە شلەژاوی لە فرۆشگای برادەرەكەم هاتنە دەرێ لەگەڵ هاتنە دەرێی ئەوانیش دەنگی بەربوونەوەی شووشە هات، خەڵك غاریان دا، من پێش هەموان گەیشتمە سەری، وەك جاران، وەك هەموو ئەو جارانەی دەچوومە لای لە سەر كورسیی پشت مێزەكەی دانیشتبوو، جگەرەكەی نەكوژابۆوە، وەك جاران چاوی لە بنمیچەكە بڕیبوو، نازانم بۆچی هەمیشە بەو شێوەیە سەیری ئەوێی دەكرد، رێك وەك جاران دانیشتبوو، بەڵام ئەو جارە بە سینگی بە خوێنەوە، رێك لە سەردڵیان دابوو، ئا، كاتژمێر دوو بوو.

سێ رۆژ بە سەر خۆشاردنەوەی ئەو سێ هەڵاتووە تێنەپەڕی، هەواڵ گەیشت كە نەخشەسازی گەرماو لێیدراوە بیست و یەك پاسەوانی كوژراون و خۆیشی دەست و پێیەكی فڕیوە و رەنگە نەژی، زوو

هەواڵەکەم گەیانـدە پەری، نەیزانیبـوو، بە نـاو تەقوتۆقـدا بە بـن بارانـدا گەڕاینەوە ماڵەکەی پەری کە ئەو دەم لە بەرانبەر باخی گڵکەند بوو.

لەوەو بە دوا رۆژ دوای رۆژ پتـر لەگەڵ مێـردەکەی پەری بـووینە برادەر، وای لێهات، دەبوو هەموو رۆژێك یەکتر ببینین، مێردەکەی پەری چوار پێنج ساڵێك لە تەمەنی گەنجایەتی دیار نەبوو، ژیانی خۆی بۆم باس دەکرد بەڵام کە دەگەیشتە ئەو چوار پێنج ساڵە بازی دەدا، چەندی لێیم دەپرسی، وەڵامێکی وای نەدایەوە رووناکیەك بکەونە سەر ئەو چەند ساڵە تاریکە، یەك دوو جار لە پەریشم پرسی ئەویش گوتی:

نهێنیی مێردەکەم لەو چەند ساڵەیە.

# ٢٠

# پەری

کوڕی درەختی گوڵاوی کە دواتر بووە بابی ماچ ڕۆژ دوای ڕۆژ جوانتر، شیرینتر، خۆشەویستتر دەبوو، من ئیدی عەشقبوونێك عەشقی بابی ماچم ڕەنگی کوڕی پیاوە مەستەکە نیە، حەفت پایزی ئەو هێندەی حەفت مانگی بابی ماچ عەشقاوی نەبوو، من لە ماچی یەکەمی ئەو، هەر لەو چل ڕۆژەی کە لە باوەشی بابی ماچ بووم و نەهاتە گژیشم، عەشقی بووم، بە ڕاستی عاشقی دەبێت ئەوها بێت، چل شەو لە باوەشی بووم، خۆی ڕاگرت و سەرجێیی لەگەڵ نەکردم، کەچی کوڕی پیاوە مەستەکە ڕەنگ نەبوو دوو خولەك لە ژوورەکەی بم دەیویست لاقەم بکات، بابی ماچ لە گەرمەی ڕامووسانێ هەر وا دەزانم کوڕی پیاوە مەستەکەیە پاڵێکی توندی پێوە دەنێم کە هەر پیاوێکیتر بێت ڕەنگە پیاوانە تووڕە بێت، کەچی ئەو بە نەرمی نێو چەوانم ماچ دەکات و بزەیەکم بۆ دەکات و دووردەکەوێتەوە، جارێك بە دیارکەوتنی کوڕی

پیاوە مەستەکە لە کاتی سەرجێیی لەگەڵ بابی ماچ بۆ خوشکترینم گێڕایەوە، لێیمپرسی:

-وازم لێناهێنیی، لەو کاتە ناسکە خۆیم نیشاندەدا، بۆچی؟

+تۆ هێشتا کوڕی پیاوە مەستەکەت لە بیرنەکردووە.

-بەڵام بابی ماچ سەرتاپای دڵمی داگیرکردووە، لە دڵمدا جێگەیەك نەماوە بۆ کوڕی پیاوە مەستەکە.

+نا، جێگەیەك...

بابی ماچ ئەو پیاوە بەفریەیە دڵی لە بەفر پاکترە، ئەو پیاوە بوو منی لەگەڵ پیاو ئاشتکردەوە، پیاوێکە ژنە کەسکپۆشەکە دەڵێت:

وا بزانم تاکە پیاوە لەو شارە کە هێندەی دنکە زەنگیانەیەکیش دڵپیسی لە دڵیدا جێی نابێتەوە، ئەگەر هەموو پیاوەکان ئەوهابان، کێشەیەك لە نێوان ژن و پیاوان روونەدەدا.

وایە، بابی ماچ دڵپیس نیە، کوڕی پیاوە مەستەکە کە من حەفت پایز ئاگرم بۆی گرتبوو، هێندەی حەفت پیاوی دڵپیس دڵپیس بوو، بابی ماچ هەمیشە بە منی گوتووە:

بۆ ژن زۆر پێویستە سیاسەتزان بێت، دەیکات یان نایکات شتێکیترە.

بابی ماچ هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ئەو دوو ئاگرە نەبوو کە کوڕی پیاوە مەستەکە لێیان تۆقی بوو.

ئەو ئێــوارەیە، ئەو ئێــوارەیەی هێشــتا لە ســەر دیــواری ژوورەکە سێگۆشەی خاڵی نەدیتبۆوە، ئەو ئێوارە درەنگانەی بۆ یەکەم جارە بە تووڕەیی بێتە ماڵەوە، پرسی:

+پرسیارێکت لێدەکەم، بەڵام راست وەڵام بدەوە.

-ئەگەر بە راستیش وەڵام نەدەمەوە دڵنیابە درۆت لەگەڵ ناکەم.

+من لەو وەڵامەت دەترسام، تکایە بە راستی وەڵامم بدەوە.

-دە بڵێ، چیە؟ تۆ زۆر نائاسایی دیاری.

+ئێستا پیاوێك بە شووشەیەك لایەکی سەری هاتە خوارەوە.

-کێیە؟

+ئەوەی شەوێك تۆی فڕاند.

-من!

+بە من بڵێ تۆیان فڕاندووە؟

-تۆ بە وردی تێمبگەیەنە تا بتوانم وەڵامت بدەمەوە.

+باشە، ئێستا لە یانە، لە مێزەکەی نزیکم دوو کەس دانیشتبوون، من پشتم لەوان بوو، جێگاکەش رووناك نەبوو، یەکیان دیار بوو زوو دانیشتبوو، مەست بوو، باسی ئێوارەیەکی خۆی بۆ ئەویتر دەگێڕایەوە، دەزانی چی گێڕایەوە؟

-دەی، بیگێڕەوە.

+باشە، ئەو کوڕە دەیگوت: بیست ساڵێك لە مەوبەر کچێکی جوان لە هەموو کچان جوانترماڵیان نزیك منارەی چۆلی بوو، ناوی بە کچی خاڵ لە گەردن رۆیشتبوو، گەرەك بۆی شێت ببوو، من هەر ئاگرم گرتبوو، سوێندم خواردبوو ئەگەر سەریشم لە سەری دانێم خاڵی گەردنی ماچ بکەم، هەر بە دوایەوە بووم، ئێوارەیەك باش رێککەوت، لەگەڵ دوو برادەر فڕاندمان ئیشی خۆمان لەگەڵ کرد و لە نزیك ماڵی خۆیمان دانایەوە،کوڕەکەیتر پرسی:

ناوی کچەکە چی بوو؟

گوتی:

پەری.

ئەوەی ناوی کچەکەی پرسی، بێ سێ و دوو شووشەیەکی بە تەپلی سەری دادا، من بەرچاوم تاریك بوو، دەتگوت لە سەری منی داوە، نەمتوانی تەماشایان بکەم، نا تەماشام کردن، بەڵام وەك تارمایی بینیمن، نازانم بۆچی بە شێوەی تارمایی خۆیان نیشانی من دەدا، بە هۆی دنیا تاریکیەوە بوو، یان من بەر چاوم تاریك داهاتبوو، ئیدی پۆلیس زوو گەیشتن، دەی بڵێ ئەو کچە خاڵ لە گەردنە ناو پەریە کێیە؟

-منم، جگە لە من کەس نیە.

+ئەدی بۆچی تا ئێستا باست نەکردووە؟

-چەند جارێ ویستوومە ئەو رفاندنە بگێڕمەوە، نەمگێڕاوەتەوە، نازانم بۆچی.

+بەڵام...

-ئیدی.

بە گریانەوە چیرۆکی خۆم و دوو دەمامکدراوەکەم بۆ بابی ماچ گێڕایەوە، لە باوەشمی کرد، توند گوشیمی، گوشینێك شەوی یەکەمیش ئەوهای نەگوشیوم، گوتی:

+تۆ نەدەبوو ئەوە لە من بشاریتەوە، کەس بەوەی زانیوە؟

-جگە لە ژنە کەسکپۆشەکە کەس لە منەوە نەیبیستووە.

+ئەها، زوو چەند جارێك دەیویست شتێك بڵێ، بەڵام دەیگێڕایەوە.

-ئا، هەر زوو بە منی گوت کە بۆت بگێڕمەوە، بەڵام بە قسەم نەکرد، ئێستا چ بکەین؟ تۆ دەیانناسیتەوە؟ من دەبێت ئەوانە ببینم.

+من ڕەنگە بیانناسمەوە، ڕاستە تارمایی بوون، بەڵام لە تارماییشدا سیمایان غەریب نەبوو، باشترە جارێ بەردێکی لە سەر دانێی، کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزە، پەلە مەکە، باشە ئەویتر بۆچی لێیدا، من لەوە تێناگەم، من دەیانبینمەوە، دەبێت...

ئا، ئاڵۆزە، ترسناکە، دیمەنی شەوی گەشتەکە گەشتی لاقە، زۆری ویست، ئەو هەموو ساڵەی ویست تا کال بووەوە، ئەو شەو کێ تۆی گەیاندە یانە؟ بابی ماچ تۆ بە ساڵان و مانگان ناچیە یانە، ئەو ئێوارەیە بۆچی چوویت؟ کێ تۆی لەو مێزەی نزیك ئەوان دانیشاند!

بابی ماچ، ئەو هەواڵەی دەبوو من زوو پێش شەوی یەکەم هەر لە بن درەختی گوڵاوی بە شێنەیی بۆکوڕی درەختی بگێڕمەوە، کەچی دوای ئەو هەموو ساڵە بابی ماچ لە سەر مێزی یانەیەك دەیبیستێتەوە.

+بەس پێمبڵێ بۆچی لێمت شاردەوە؟

-سەرەتا دەمویست بۆت بگێڕمەوە، هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، نازانم بۆچی زمانم دەبەسترا، دواتریش لەبەر تۆ نەمویست سەرقاڵت بکەم بە کێشەیەك کە بە سەرچووە کە...

+باشە، تەواو، هیچ نەبووە.

-بەڵام من دەمەوێت ئەو پیاوانە ببینم، بزانم کێن، بەڵکو بیانناسم.

+ئەوە ناسیتن، چی دەکەیت؟ شکات! دوای ئەو هەموو ساڵە.

-نازانم، بەڵام...

+واز بێنە، من دەیانبینمەوە، وەك گوتم بەردێکی لە سەر دانێ.

دەمویست باسی پەیوەندیی خۆم کوڕی پیاوە مەستەکەی بۆ بکەم، ترسام ئەویش لە کەسێکیتر ببیستێتەوە یان لە وێنەکانی سەر دیواری ژوورەکە شتێکی دەستکەوێت، ئەو وێنانە سەیرن، هەر رۆژەی وێنەیەك

خۆی ڕووندەکاتەوە، دەبێت لە زاری خۆمەوە حەفت پایزەی مـن و کوڕی پیاوە مەستەکە ببیستێتەوە، باسی هەمـوو شتێکی بۆ بکەم، دەبوو زوو پـێش هـاتنی مـاچ بـۆی بگێـڕمەوە، مـن لەگەڵ ئەو پیـاوە ڕاسـتگۆ نەبوومە، نەدەبوو وا بم، نا، بۆ؟ ڕابردووی خۆم هی خۆمە، چ پێویست دەکات بیگێڕمەوە؟!

درەنگانی شەوە، بە دیار وێنەکانی ژوورەکەوە لەگژ سەرجێییکردنین، دیسان لە کاتی خۆی کوڕی پیاوە مەستەکە لە پەنجەرەی دنیاوە لەو پەنجەرەیەی سالانێك ئەو لێیەوە چاوەڕوانی دەرکەوتنی منی دەکرد، سالانێکیشە من لێیەوە تەماشای دنیا دەکەم، جار و بارێ ڕەنگە هەر بۆ خۆشی حەزبکەم ڕێی بە کۆنە کۆلانی خۆیان بکەوێت و بیبینمەوە، بزانم ساڵەکان وەك خۆیان هێشتۆتەوە یان...

زۆر جـار هەر لەو کـاتەوەی هـاتینە ئێـرە و زانـیم تەلەفـۆنەکە هەر هەمان تەلەفۆنە حەزمکردووە تەلەفۆنێك بکـات، گـوێم لە دەنگی بێت و تەواو، ئەو تەلەفۆنەی خوشکترین زوو بە گوێمدا چرپاندی کە چەندی زووە ئەو تەلەفـۆنە بفرۆشـم و پەیوەنـدیەکم بەو ژمـارەیەوە نەمێنێـت، خوشـکترین زووتـریش زۆری لەگەڵـم هەوڵدا کە بە قسـەی بـابی مـاچ نەکەم و لەو خانووە نەژیم، خوشکترین دەیگوت:

+لە هەموو شتی ئەو کوڕە لە خشتەبەرە دووربیت باشە.

-بەڵام ئەو کۆتایی هاتووە.

+ ئای لە تۆ...

لە هەموو سەرجێییکردنێك دەبینم لە پەنجەرەوە دەیبینم تارمایی کوڕی پیاوە مەستەکە دەبینم و نایەڵێت بە دڵی خۆم چێژ لە بابی ماچ وەرگرم، ئەو پیاوەی لە ئەوینی ئەودا ئاگرم گرتووە، ئەوینێك کەس هیچ ژن و مێردێك ئەوانەی لە بارەیانەوە خوێندوومەتەوە ئەوانەی دەیانناسم، ئەوانەی دەیانبیستم، کەس وەك من و بابی ماچ نیە، خۆزگە هێندە خۆشمنەدەویست، ئەگەر کوڕی پیاوە مەستەکە لە ساتەکانی سەرجێییکردن لێمانگەڕێت، ئێمە دوو ئەویدنارین جیا لە هەموو ئەویندارن، ئەوینمان ساڵ دوای ساڵ قووڵتر دەبێتەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە تەنها لە کاتی سەرجێیی دێ و دەیبینم و لە چێژم دەکات، دەنا لای من کۆتایی پێهاتووە، ئەوینی بابی ماچ جێگەیەکی لە دڵی من نەهێشتۆتەوە بۆ کەس، وێنەکانیش، نا ئەوانیش هیچ زیندوو ناکەنەوە.

شەو دەرەنگە دوای سەرجێیی کە پیشەی هەمیشەیی خۆی بوو بۆ چەند خولەکێك لە وێنەکانی سەر دیوارەکان وردبێتەوە، من بانگم کرد:

+وەرە با نهێنیەکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.

-باشە، پەلە مەکە، شتێکم دیتەوە.

وردبۆوەو دیتیەوە، دیتمەوە، سێگۆشەی خالان هیچی تێدا نەهێشتەوە، هێندە بە سەر خۆی نەهێنا، وەرنا پێدەچوو گەیشتبێتەوە ئەوەی کە سێگۆشەی خالان هەمان سێگۆشەی خالانە، ئەو شەوە هیچم نەگوت، هیچم بۆی نەگێڕایەوە، ئەویش زۆری لێم نەکرد، نازانم نووست یان نا، بەڵام من خەوم لێنەکەوت.

ئەو شەوە شەوێکە رەنگە نەتوانم شتێکی ئەوتۆی لێ بگێڕمەوە، شەوی ئاشکرابوونی ئەو نهێنیانەی نەدەبوو ئاشکرابن، نا، نەدەبوو لای بابی ماچ نهێنی بن، باشتر بوو زوو بە هەموو شتێکی زانیبا، ئەو پێش هاتنی ماچ هەر هێندەی دەزانی من کوڕێکم خۆشویستووە، رەنگە هەر وا وێنای کردبێت دەستمان بەر دەستی یەکتر نەکەوتبێت، دڵنیام وا تێگەیشتووە، دڵنیام وەك نێوان خۆم و خۆی حەفت مانگی پێش گواستنەوە تێگەیشتووە، کە تەنها تەوقەیەکی تێدا بوو، تەنها نامەیەکی

لە خۆیەوە تێدا بوو، رەنگە وا تێگەیشتبێت، ئەو جگە لە وێنەیەکی زیندانی کە دواتر ئەویشی بۆ روونبۆوە، هەر زوو هێشتا ماچ ساوا بوو، شەوێك بۆیم گێڕایەوە کە لە زیندان لاقەیان نەکردووم، لە زیندان جگە لە لێدان هیچ هیچیان لێم نەکردووە، لە ناو زیندان دیمەنێکی سێکسی، دیمەنێکی نیوە رووتیشم نیە، بەلآم نازانم بۆچی نەیپرسی ئەدی کچێنیەکەت کێ بردبووی، رەنگە بە هەندی هەڵنەگرتبێت، دوورنیە هەر هەستیشی بەوە کردبێت، ئاخر خۆ ئەو زۆر کتێبی لە بارەی رۆشنبیری سێکسی و نهێنیی لەشی ژنی خوێندبۆوە، نازانم، بەلآم چ باسی ئەو شتەی نەکرد، ئەو وەرزە نەهاتە، وەرزی رووتبوونەوەی ئەو نهێنیانەیە کە سالآنێك شاردبوومنەوە، لە کەسێکم شاردبوونەوە کە دڵنیابووم بە بیستنیان ئاسایی دەبێت هیچ لە هیچ ناگۆڕێت، چوونکە ئەو پیاوە لەوە تێگەیشتووتر بوو لە سەر رابردوو، رابردووی من شت لە دڵ بگرێ.

ئەو هەموو شتە بۆچی وا بە دوای یەکتردا هاتن، باشترە وێنەکانی بە وردی بۆ روونبکەمەوە، ئای ئەگەر سێگۆشەکەی نەدەدیتەوە، من هەرگیز باسیم نەدەکرد، تەنها باسی ئەویانم نەدەکرد، کوڕی پیاوی مەست نەدەبوو سێگۆشەی خاڵانت نەخشاندبا، ئەوەم لێڕانەدەدیتی، حەیف، چەند حەیابەر دەرچوویت تۆ، بە نەفرەت بیت کوری پیاوی مەست، چیت بە سەر من هێنا، ئەو هەمووساڵە هەر لەگەڵمدای، چ

بەڵایەکی گەورەی تۆ، دەبێت منیش شەوان لە پەنجەرەوە خۆم نیشانت بدەم؟ نا، بڕواناکەم، تۆ...

شەوی دواتر، دەستی بابی ماچم گرت و بە ژوورەکەدا گێڕام، بە دیار وێنەکانەوە دەوەستاین، وێنەکان لە بن تیشکی گلۆپەکان هێند روون بوون، هێند رووت بوون، لە چاوی من دەتگوت وێنەی فۆتۆگرافین و تازە گیراون و گوتم:

+من دەمەوێت یەکە یەکە ئەو وێنانەت بۆ روون بکەمەوە.

-واتە پێیان ئاشنای!

+بەڵێ ئەو لەو بن دارەوە تا ئەوەیان ئەها سێگۆشەکە.

-بە من بڵێ کێ ئەو وێنانەی کێشاوە، دەبێت وێنەکێشێکی دەست رەنگین بووبێت.

+لەوەیان سەرم سوڕماوە، من هیچ وێنەکێشێکم نەناسیوە.

-منیش زۆر پرسیارم کرد، کەس نەبوو بڵێ خاوەن ئەو خانووە کەسێکیان دەستی وێنەکیشانی هەبێ، تۆ بە من بڵێ ئەو کچەی ناو ئەو وێنانە تۆی.

+جگە لە من دەبێت کێ بێت؟

-خەیاڵیان زۆر تێدایە یان...

+نا، وەك خۆی، بێ خەیاڵ.

-ئەو کوڕەش هەر ئەوەیە کە خۆشتدەویست؟

+خۆیەتی، دەبێت خۆی بێت، بەڵام کێ بۆی کێشاون، تێناگەم.

-ئەدی شوێنەکە کوێیە؟

+جگە لێرە لەو ژوورە دەبێت کوێ بێت!

-من چ تێناگەم.

+منیش ئەگەر لە جێگەی تۆ بام هیچی تێنەدەگەیشتم، هەر هێندە نا بە شێتبوون شێت دەبووم، بەڵام تۆ پیاوێکی گەورەی، زۆر گەورەی.

-هەر لەبەر ئەوە دەتگوت ئەو خانووە مەکڕە؟

+هەر وایە.

-باشە ئەو کوڕە لە کوێیە؟

+لە رۆژی زەماوەندەكەمانەوە نەمدیتووە و چ هەواڵیشی نازانم، ئەو ڕۆژە لاشانێكیم دیت.

-ئەو درەختە كامەیانە؟

+ئەو دارپرتەقاڵەیە.

دار پرتەقاڵێك كە دوو پرتەقاڵ بە لقێكی شۆڕبۆوە، هێندەی نەمابوو بگەنە سەری كوڕ وكچێك كە لێویان بە لێوی یەكترەوە بوو، چەند كلوو بەفرێكیش لە شێوەی پەپوولە...

-كوڕەكە ناوی چی بوو؟

+یادگار

بە ناوهێنانی یادگار داما، كەوتە ئەندێشەیەكی قووڵەوە، لەبەر خۆیەوە، هەر ئەوەتە گوێم لێبوو:

بەس ئەو نەبێت، بەس ئەو نەبێت.

-لە كام كۆلێژ بوو؟

+نازانم، نا، دە وازبێنە.

ئەو وێنەیە ئەها مەمکی چەپی کچەکە بە دەرەوەیە، ڕەنگە یەخە هەردوو مەمکی بە جارێك لێ نەیەتە دەرەوە، هەر چەند زۆر گچکەن هەر هێندەی هەرمێیەك، ئەو وێنەیە ڕەنگە هی ساڵی یەکەمی ئەوین بێت، کوڕەکە لێوی هێناوە، لێو و گۆی مەمك لێکنزیکن، ئەها خاڵی سەر گۆ، وێنەکێشەکە جوانی نیشانداون، نەیهێشتووە بە یەك بگەن، ئەگەر پێکگەیشتبان جوانیی مەمك و لێو ون دەبوون، بەڵام من جوان دێتەوە بیرم، بەیەك گەیشتن، بە چ حاڵ بە نیوە شەرێك لێکبوونەوە، دەنگی باب لێکی دوور خستنەوە.

ئەها، ئەوە کتێبەکەیە، (ئافرەت لە کۆمەڵگای کوردەواری)، ئەوەتە بە دەستی ڕاست لە دەستم وەردەگرێ و دەستی چەپیشی لە سەر شانمە، لێومان دیار نیە، بەڵام لە ناو یەکتر دەیانبینیەوە، لە بیرمە هەر ئەو ڕۆژەی کتێبەکەم بە ماچی قووڵەوە پێشکێشی کوڕی پیاوە مەستەکە کرد، هەواڵی لە خوێنگەوزانی نووسەری کتێبەکە بە شاردا بڵاوکرایەوە، دواتر کوڕی پیاوە مەستەکە گوتی:

+وا دیارە من کتێبم لێ نایە، ئەها سەری نووسەرەکەیم خوارد!

-بەڵام ماچت باش لێدێ؟

+ماچ، ماچ، هەرچی کتێبی دنیایە، ماچێکی لێوە هەمیشە تەڕەکانی تۆ ناهێنن.

لەو وێنەیە سینگی کچەکە رووتە، ئەها خاڵی گەردن دەڵێی رەشۆڵەیەکە لە دوورەوە تەواوێك لە دوورەوە بە قەدی درەختێکەوە هەڵنیشتووە، دوو مەمکی قیت دەڵێی هەنارن سەرەو نخوون بە دارەوە، بە بەراورد لەگەڵ مەمکی ساڵی یەکەم گەورەن، ئەوەیان هی ساڵەکانی دوایە، کوڕەکە هەر دوو دەستی گرتۆتەوە، وەك بڵێی چاوەڕێی بەربوونەوەی هەنارەکان دەکات، زۆر نەماوە بکەونە دەستیەوە، جوانیی دەست و مەمکیش لەوەدا پتر دەردەکەوێت بەریەك نەکەوتوون، هیچ جێیەکی مەمکەکان لە ناو دەست بزرنەبوونە، بەڵام ئەوەی من لە بیرمە ئەو وێنەیە هی رۆژێکی بەهارییە، دووەم رۆژی نەورۆزبوو، جلکی کوردیم لەبەرە، کوڕەش هەرگیز چاوەڕێی بەربوونەوەی هەناری نەکردووە، هەر لە دوورەوە پەلاماری دەدان بە پەنجە و بە لێو دەیخواردن.

لەو وێنەیە بە تەنیشت یەکەوە دانیشتوون، دەستی کچەکە لە سەر سینەی پڕ لە مووی کوڕەکەیە، دەستی کوڕەکەش لە سەر کەمێك خوارەوەی ناوکی کچەکە، دەستەکەی تری کوڕەکە لەو دیوەوە لە بن باڵی کچەکە هاتووە و بە دوو پەنجە گۆی مەمکی گرتووە، کچە چاوی

نوقاندووە، بەڵام کوڕە چاوی لە خوارەوە بڕیوە، ئەو وێنەکێشە چەند راستگۆیانەوە وێنەی ئەو دووەی کێشاوە، لە بیرمە هەمیشە کە دەچوومە باوەشیەوە، چاوم دادەخست، نازانم لە شەرما بوو یان شتێکیدی، بڕواناکەم شەرم بووبێت، چونکە لە باوەشی بابی ماچیش حەز بە چاو داخستن دەکەم.

ئەو وێنانە دەڵێی لە کات و ساتی خۆیان گیراون، وێنەکێش یان ئەوەی داوای لە وێنەکێش کردووە وێنەکان بکێشێ زۆر وردبووە، یادەوەریی زۆر بەهێز بووە، رەنگی کراس و رەنگی ستیان و رەنگی قردێلە و هەتا رەنگی پێڵاوی کچەکەشی وەك خۆی نیشانداوە، ئەها ئەو وێنەیان کچە خۆی نەوی کردووە و پێڵاوەکەی بە دەستەوەیە دیارە لە سەر رۆیشتنە، رەنگی پێڵاوەکەی مۆرە، دەستی کوڕەش لە سەر سمتی کچەیە، پێڵاوەکە جوان دەناسمەوە، هەر ئەو رۆژ لە پێم کردو تەواو، پێمی دەگرت، دامە قومری، جوانیش دێتەوە بیرم لەو کاتەی دەستی خستە سەر سمتم، هەستامەوە و پێڵاوەکەم لێی بەرزکردەوە، ئەوە هەر بۆ گاڵتە بوو.

بابی ماچ حەزیدەکرد یەکە یەکەی وێنەکانی بە زیندوویتی نیشانبدەمەوە، بەڵام من نەمدەویست، لەگەڵ ئەوەش جار جارە وێنەیەکم

بۆی زیندوو دەکردەوە بە تایبەتی ئەو وێنانەی رووت نەبوون و تەنها لە باوەش گرتن و ماچی گەرمیان نیشانددەدا، نەشتەرگەریی خاڵەکەم بۆی زیندوو کردەوە، وێنەکێشەکە جوانی کێشابوو، لە خۆی جوانتر، ئەو وێنەیەش کوڕە لە سەر پشت راکشاوە کچە لە سەری نیوە دانیشتنێك لە سەری دانیشتووە، پرچی کردۆتەوە، کوڕە لە بن قژەوە دیارە لە کەلێنی قژەوە هەردوو دەستی دیارە دوو مەمکی توند گرتووە وەك بلێی نەهێلێ کچە بە سەر سینگیدا بکەوێت، کاتێ ئەو وێنەیەم بۆ بابی ماچ نیشاندایەوە، داوایکرد کە لە بەرانبەر وێنەکە دوای ئەو هەموو ساڵە لەگەڵ ئەویش وێنەیەکی کتومت وەك ئەو بکێشینەوە، کێشامانەوە، بابی ماچ زۆر چێژی لێبینی، بەڵام چەندی هەوڵی دا نەمتوانی سێگۆشەی خاڵانی نیشانبدەمەوە.

بە هەڵدانەوەی وێنەکان و زیندووبوونەوەیان، ئیدی کوڕی پیاوە مەستەکە لە پەنجەرەوە خۆی نیشانم نەدەدا، من دەمویست بە دڵ دەمویست بێ و بیبینمەوە، نازانم بۆچی حەزدەکەم بیبینم، ئەو نایەت و من چاوەڕێی دەکەم، بابی ماچیش هیچ بە سەر خۆی ناهێنێت، بەڵام من لە چاوی دەخوێنمەوە نیگەرانە، دڵگرانە، لەوەی ئەو هەموو ساڵە شتم لێی شاردۆتەوە، هەرچەند هەمیشە دەڵێت:

ئەوەی بووە، رابردووە پەیوەندی بە منەوە نیە، بۆ من گرفتێك نیە.

ئای بابی ماچ، عاشقترین پیاو، جوانترین پیاو، ئەوینی من بۆ تۆ بێ کۆتایە، بەڵام حەز بە بینینی کوڕی پیاوە مەستەکەش دەکەم، بینین و هیچیدی، نازانم ئەو هەموو ساڵە لە کوێیە، چی بە سەر هات، بە راوێژکار نەماوەتەوە، نا هەر لەو شارەش نەماوەتەوە دەنا هەر دەبینرا، نازانم رێککەوت بوو یان بە پلان ئەو خانووە بووە هی ئێمە، باشە چۆنە تەلەفۆنێکی نەکردووە، خۆزگە بە هەر رێگەیەك با، بابی ماچم رازیدەکرد واز لەم خانووە بێنێت، ئەم ژوورە ئەم وێنانە شەڕیان بە دواوەیە، من دەترسم، نەدەبوو بێمە ئێرە، هەر لەبەر هیچ نا لەبەر قومری، ئای قومریەکەم چەند جار لەگەڵ من هاتوویتیە ئەو ماڵە، لەبیرمە دوای تێکچوونی نێوان من و کوڕی پیاوە مەستەکە قومری هێندە دڵی پێمسووتا، هێندە رقی لە کوڕی پیاوە مەستەکە هەستا، گوتی:

پەری، ئێمە چەند ساڵە هاتوچۆی ماڵی شەیتان دەکەین، دەبێت تۆبە بکەین دەنا خودا دەمانسووتێنێ، تۆبە پێ ناخەینە ئەو کۆڵانەوە.

دەبوو تۆبەکە نەشکێنم، بمبوورە قومریە کوژراوەکەم بمبوورە، من هاتمەوە ماڵی شەیتان!.. تێناگەم ئەو وێنانە کێ کێشاونی، خۆ ئەو لە وێنە کۆڵەوار بوو، من دەبێت چی بکەم، ماچیش هەندێ شتی بیستووە.

# ماچ

من ماچم، چیرۆکخوانی ماچی یەکەمم، ئەوەی تۆ دەیبیستی و دەیخوێنیتەوە، دێر دێر من دامڕشتۆتەوە، من ماچم من کچی پەری و کچی بابی ماچم ولە نامەیەکەوە خولیای چیرۆکی ماچی یەکەم کەوتە سەرم، ماوەیەك بوو خووم بە خۆگرتنەوە گرتبوو، ئەو دەمانەی ئەوان لە ژوورەکەی خۆیانەوە لە بارەی وێنە و دیوارەوە دەدوان، گومانم برد کە نهێنیەك هەیە، قسەی لێوەدەکەن و لێکدیشی دەشارنەوە، بۆیە جار جارە بە دەست خۆم نەبوو دەچوومە نزیك دەرگاکە و چەند وشەیەك چەند رستەیەکم دەدزی دەگەڕامەوە، هەرچەندە خەفەتم لەو کارە ناشیرنەی خۆم دەخوارد، بەڵام بە دەست خۆم نەبوو خووێك بوو گرتبووم، لەو لاو لەولا بە تایبەتیش لە ژنە کەسکپۆشەکە و خوشکترین خوشکی دایکم ناوی کچی گەردن بەخاڵم زۆر بیستبوو کە کچێك بووە شارێك حەیران و سەرگەردانی بوونە، خۆ لە چاوی منەوە ئێستاش هەر وەك خۆیەتی، خۆزگە سەدیەکی جوانیەکەی ئەوم بەردەکەوت، هەر هێندە تێگەیشتم کە

باسی پیاوێك دەکەن لە یانە بە شووشە لێیدراوە لە سەر ئەوەی کاتی خۆی دستدرێژی کردۆتە سەر کچێك، گوێم لێبوو:

دەیانبینمەوە، دەبێت بزانم کێن.

چیدیم نەبیست، بەڵام لە دەنگیان شلەژاوی دیار بوو، هەر لە خۆوە ترسام، چوومەوە چاوەکەی خۆم، شەو درەنگە، گوێم لە زەنگی هاتنی نامەیەك بوو، زانیم هەوە، دڵوارە، جگە لەو، لەو کاتانەی شەو کەس نامە نانێرێ، تەماشای مۆبایلەکەم کرد خۆی بوو دڵوار، نووسیبووی:

ببوورە من سبەی ناتوانم بتبینم، باوکم لە نەخۆشخانەیە.

بۆیم نووسی:

بۆ، چیەتی؟

ناردیەوە :

ئەو شەو لە یانە پیاوێك شووشەیەکی لە سەر داوە، تەندرووستی باش نیە.

ناردمەوە:

بۆچی؟ لەسەر چی؟ کێ لێیداوە؟

ناردیەوە:

تۆ چەند دەزانی منیش هەر هێندە، جارێ ماڵاوا.

ویستم لە دەرگا بدەم و بڵێم:

بابە ئەو پیاوەی کە بە شووشە لێیدرا، من دەیناسم.

پەشیمانبوومەوە، نەچووم، بەیانیش باسم نەکرد، ترسام کێشەیەك بۆ من و دڵوار دروست بێت، ئەو ڕۆژانە هەستمدەکرد وێنەکانی سەر دیوارەکە لە نێوان دایکم و بابم خەریکە کێشە دەنێنەوە ئەو وێنانەی کە لە چاوی منەوە جگە لە کۆمەڵێك خەتخەتۆکە چیتر نەبوون، یان من چ لە وێنە نازانم، ڕاستی هێندە لێیان وردنەبووبوومەوە.

چەند ڕۆژێك بە سەر شەڕەکەی یانەدا تێپەڕی، ئەو شەڕەی کە بە لای دایکم و باوکمەوە زۆر گرنگ بوو شەڕکەرەکان بناسن، نەمتوانی چیدی شەڕکەرێکیان لێ بشارمەوە، بە شەرمەوە بە پەری، حەزدەکەم منیش هەر بە پەری ناوی دایکم بێنم، گوت:

+دایە ئەو پیاوەی ئەو شەوە لە یانە سەریان شکاند...

-پیاوی چی! دەتەوێت چی بڵێیت؟

+ئەوەی بە شووشە سەری شکا.

-ئەوەت لە کوێ زانی؟ ئێ، چی بووە!

+ئەو پیاوە بابی برادەرێکمە.

پەری شلەژا خراپ شلەژا، دەستی بە سەری خۆیەوە گرت، دەستم خستە بن شانی:

+دایە، چیە، بۆچی وات لێهات؟

-چ نیە، بە من بڵێ، برادەرەکەت کێیە، ئەو پیاوە کێیە؟

+کوڕی ئەو پیاوەی سەری شکا، هاوپۆلمە.

-خودایە هەر هاوپۆلت بێ و چیدی.

+من تێناگەم بۆچی وا قسەدەکەیت؟

-تێدەگەیت دوایی تێدەگەیت، من دەمەوێت ئەو پیاوە ببینم و ئەو پیاوەش ببینمەوە کە لێیداوە، بە برادەرەکەت بڵێ دایکم دەیەوێت بابت ببینێت، باشە نەیگوت بۆچی لە باوکیان داوە؟

+نا، ئەویش نازانێت.

لەو دەمە بابی ماچ حەزدەکەم هەر بە بابی ماچ ناوی بابم بێنم، هاتەوە، پەری تێیگەیاند، ئێستا بابی ماچ و ماچ بە تەنیان و لەو بارەیەوە قسەدەکەن:

-بە من بڵێ بابی برادەرەکەت ناوی چییە؟

+بەرزۆ

-ماڵیان لە کوێیە؟

+لە نزیك باخی شار.

-کوڕەکەی زۆر برادەرتە؟

+ئا، برادەرمە.

-باشە، من داوایەکت لێدەکەم، هەوڵبدە لە رێی برادەرەکەتەوە وێنەیەکی باوکی بە دەستبێنە، بزانە ئەو پیاوەی لە باوکیشی داوە کێیە و لە کوێیە؟

+ ئێـوە بە مـن بڵـێن، ئەو کێشـەیە چـیە لە نێـوان ئێـوە و ئەو شەڕکەرانە؟

-شـتێکی ئەوتـۆ نـیە، بەرە بەرە بـۆت روونـدەبێتەوە، پەلە مەکە تێیدەگەیت، لەو دەمە مۆبایلەکەم زەنگی لێدا، دڵوار بوو، گوتم:

-ئەوە برادەرەکەمە.

+باشە، لێی بپرسەوە بزانە...

بابی ماچ چووە ژوورەکەی خۆیان، بە دڵوارم گوت:

-بە من بڵێ نەتزانی شەڕەکەی باوکت لە سەر چی بوو؟

+ئۆی، چەند جار گوتم هیچ ناڵێ، هەر دەڵێ تێگنەگەیشتنێك بوو.

-ئەدی پیاوەکە بەر بوو؟

+نا، هەر لە زیندانە

-نازانی ناوی چی بوو؟

+دەمزانی لە بیرم نەماوە.

-ناوەکەی وەرگرە.

+من لە تۆ تێناگەم چ هەقت بەو کێشەیەوە هەیە، تێمگەیەنە.

-منیش باش تێناگەم، بەڵام ڕەنگە تێبگەین، دوور نیە ئەو شەڕە...

هێشتا پەری و بابی ماچ هەر لە سۆراخی شەڕکەرەکان بوون، پەری چەند جارێ تکای لێمکرد کە هێندە لە دڵوار نزیکنەبمەوە، چەندی لێی دوورکەومەوە باشترە، چەندی تکام لێیکرد هۆیەکەی بزانم هیچی نەگوت، بە قسەی پەریم نەکرد، لە دڵوار دوورنەکەوتمەوە، باش بوو لێی دوورنەکەوتمەوە دەنا چیرۆکی (ماچی یەکەم) نەدەنووسرایەوە، ئەو چیرۆکەی هەر بە نهێنی دەمێنێتەوە و ڕەنگە دوای سەدەیەکیتر کۆڵانەکانی شار بۆ یەکتری بگێڕنەوە، نیوەی نهێنیی ماچی یەکەم لە ڕێی دڵوارەوەیە، دڵوار بوو دەچووە یانەکان و بە سەرخۆشی پیاوەکانی ناو چیرۆکی ماچی یەکەمی دەهێنایە قسە، دڵوار نەبا...

# ٢١

# کوڕی پیاوە مەستەکە

من ماوەیەکی کەم راوێژکاری ئەو پیاوە بووم، کە هەندێ کەس بە ئەتککەر ناویان دێنا، چەند جارێك لە خانووە تایبەتیەکەی خۆی داوەتی کردووم، زۆر متمانەی بە من بوو، لە خانووە حەفتا ژوورییەکەی ئەتککەر هەرچیت دەویست هەبوو، هەر لە تابلۆی زۆر دانسقەوە تا ژنی هەمە رەنگ، ئەو پیاوە خەڵکی جۆراو جۆری داوەت دەکرد، لە مەلایەکەوە تا قوتابییەکی زانکۆ، بۆ هەر جۆرە میوانێکیش ژووری تایبەت و کەشی تایبەت هەبوو، من جاری یەکەم کە چووم جگە لە سێ چوار پاسەوان و ژنێکی خزمەتکاری بە تەمەن کەسم نەدیت، دەنگی کەس نەدەهات، دواتر تێگەیشتم کە رەنگە لە یەك کاتدا ئەتککەر چەند میوانێکی هەبێ، میوانەکان ئاگایان لە یەکتر نەبێت، ئەتککەر هەر میوانە و بە شتێك داوەتی دەکرد، من جاری یەکەم بە گۆشتی مامز، جاری دووەم بە شەراب و نیشاندانی ئەلبوومێك، جاری سێیەم بە کچێك،

جاری سێیەم لە پەنجەرەیەکەوە ئەو کوڕەم دیت کە بە پاکانەنووس ناوی ڕۆیشتبوو، بەڵام ئەو منی نەدیت، جاری یەکەم نەخشەسازی گەرماویش لەوێ بوو، سەیربوو ئەو دووە هەریەکەی سەر بە لایەنێکی دژ بوون کە خوێنی یەکتریان فڕدەکرد، من بە گوێی خۆم گوێم لێبووە لە تەلەفزیۆنەوە نەخشەساز و ئەتککار قسەی سووکیان بە یەکتر گوتووە، کەچی ئەوەتە لێرەش...

من و نەخشەساز بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبووین، نازانم بە پەیوەندی من و پەریی زانی بوو یان نا، بەڵام دەیزانی ئێمە ناسیاری یەکترین و هاتووچۆمان هەبووە، نەخشەسازی گەرماو چاوی بڕیبووە پەری، لە قسەکانیڕا دیار بوو دەیویست بە هەر نرخێك بێت پەری ببێتە ژنی، پێدەچوو نەخشەیەکی لە سەر دابێت بۆ لە ناوبردنی مێردەکەی پەری، من گوتمە نەخشەسازی گەرماو:

وا باشە واز لەو ژنە بێنی، خۆ دنیایەك کچی لەو جوانتر هەیە و ئامادەشن شووت پێبکەن.

کەچی نەخشەساز پێنەدەچوو دەستبەرداری نەخشەکەی خۆی بێت،

لە ئەلبوومەکەی ئەتککەر چەند جۆری مەمك هەیە، هەبوو، من لە ناو مەمکەکانی ئەلبوومەکەی ئەتککەر بۆ مەمکێك دەگەڕام کە لە مەمکی پەری بچێت، مەمکی پەریی پازدە ساڵە، مەمکی پەریی بیست و دوو ساڵە، مەمکێکم دیتەوە سوێند بخۆم هی پەریە سوێندم لێناکەوێت، چەند بە هی پەری دەچوو، ئەوجارەی بۆ دواجار دوگمەی سینەم ترازاند، ئەگەر وێنەیەکم بگرتایە و لەتەنیشت ئەو وێنەیەی وا لە ئەلبوومەکەی ئەتککەرە دایبنێیت کەس لێکیان جودا ناکاتەوە، ئەوەتا لە سەرەوەی گۆی هەر چوار مەمکان دووانی ئەلبووم و دووانی سینەی پەری، خاڵ هەیە، تۆ بڵێی لە دنیایێ چەند مەمك هەبێ لە هەمان جێ خاڵی کتومت وەك خاڵی مەمکی پەری خاڵی هەبێ! ئەو مەمکانە لە قەبارە و شێوە و رەنگ مەمکی پەرین، ئەو سینگە رووتە سینگی پەریە من سینگی پەری لە ناو هەزار سینگان دەناسمەوە، مێردەکەشی وەك من سینگی پەری ناناسێتەوە، من حەفت پایز باخەوانی باخی سینەی پەری بوومە، هەنارەکانی دەناسمەوە، چاوم لە سەر سینە و مەمکی پەری هەڵنەدەگرت، خۆزگە ئەو سینە و مەمکە گەردنیشی لەگەڵ دەبوو، ئەودەم دڵنیاتر دەبووم، خاڵەکەی گەردن یەکلاکەرەوەی هەموو کێشەکانە، گومانەکانە، ئاڵۆزیەکانە، بەڵام ئەو مەمکانە ئەو سینگە هی پەریە و گومان هەڵناگرێت، چاوم هەڵنەدەگرت دەبوو بزانم

چۆن گەیشتنە ناو ئەلبوومەکە، سەیرە، پەری شتی وا دەکات! لەو دانیشتنەی ماڵە تایبەتیەکەی ئەتککەر شەراب خۆی رانەدەگرت، زۆرم خواردەوە بابیشم هێندەی نەخواردۆتەوە، ئەتککەر پرسی:

+چیە، دەڵێی ئەو مەمکە خاڵدارە...

-ئا، بە راستی جوانن، ئەو خاڵانە زۆر جوانن.

+ئەوجا چیت دیوە، ئەو ژنە لەشی پڕ لە خاڵە.

-لە ناو رانیشی هەیە؟

+خاڵە جوانەکان لەوێن.

-ئەو ژنە ناوی چیە؟

+ناویت بۆ چیە؟ لە بیرم نیە، ئەگەر حەز دەکەیت دەتوانیت تامی بکەیت.

-مەمنوونت دەبم.

+مەنوونی ناوێت.

-کەی؟

+سێ چوار رۆژێکیدی.

تۆ بڵێی پەری بێت! پەریە دڵنیام پەریە، بەڵام ئەو شتی وا ناکات، رەنگە گۆڕابێت، ئەو رابوونەی شار چی نەگۆڕی، بەڵام پەری دەگۆڕێت! رەنگە، باشە کێ نالێ پێشتریش وا نەبووە، من چووزانم، راستە خۆشەویستی من بوو، بەڵام رەنگە، ئەوە من چی دەڵێم! مێردەکەشی وەك من بیناسم لەوانە نیە بازرگانی بە ژنەکەیەوە بکات، بەڵام رەنگە... ئەو چەند رۆژە لە سەر ئاو و ئاگر بووم، ئەتککەر خاوەن قسە و بەڵێنی خۆی بوو، لە رۆژی چوارەم گوتی:

+ئامادەیە، بەڵام وەك پێتمگوت، شتەکان هەموویان بە ناوی خۆتەوە واژۆی دەکەیت و وەریاندەگریت.

-ئەوە کێشەیەك نیە، بەڵام سەرەتا حەزناکەم کچەکە من ببینێ، با من لە پەنجەرەیەکەوە ببینم بزانم.

+باشە، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر خۆت چۆن دەیبینی و دەچیە لای.

ئێستا لە ماڵی ئەتککەرم لەو دیوی پەنجەرەیەکی جام کەمێك تاریکەوە چاوەڕێی دیارکەوتنی پەری دەکەم، وا بڕیارە بە سینگی رووتەوە بێ، ئێستا پەری بە بەردەممدا دێ و نامبینێ و دەچێتە

ژوورێکەوە کە تایبەتە بەو و منیش دوای کەمێك دەچمە لای، دیداری ئەو جارەمان نە ئەوینە و نە هیچ، مامەڵەیەکە و تەواو، باشە پەری رازی دەبێت؟

بەڵام مادام بێتە ئێرە پێشتر رازیبووە، هەرکێ بچێتە گژی رازیە، منیش وەك هەر کەسێکیتر، نا، من رەنگە نەتوانم بچمە لای، بۆ ناتوانم! چێژی خۆم وەردەگرم و ئەویش پێشتر پارەی خۆی وەرگرتووە، دەی، بزانم چۆن دەبێت، با بێت، لەو دەمە دیتم لە ڕاڕەوەکەوە پەری هات، سینگی رووت بوو، چۆکم دەلەرزێ، خۆم بە پێوە راناگرم، دەستم بە لێواری پەنجەرەکە گرتووە، گەیشتە ئاستی پەنجەرەکە، دیارە پێشتر پێیگوتراوە کە لە بەرانبەر پەنجەرەکە کەمێك راوەستێ، راوەستا، باشە ئەو من نابینێت، با من تەماشای بکەم، ئای ئەوە کێیە! هەوە، ئا هەوە، پەری چی، ئەوە کەی پەریە، بەس مەمکەکانی مەمکی پەرین، ئەوە کێیە؟ دیتوومە، دەیناسم، خۆیەتی، هەو بوو، خوشکی کچی بازرگانەکە، لە بیرمە لە بەر خۆمەوە گوتم:

ئۆخەیش باش نەبوو پەری نەبوو، کێ دەبێت با ببێت.

هاتە سەرم لە دەرگاوە سەرێك بە خوشکی کچی بازرگاندا بکەم و پێیبڵێم:

تۆ لە چیت کەمە، ئەو ئیشە دەکەیت؟

ئەو کەرایەتیەم نەکرد ترسام ئەویش بلّێ:

ئەدی ئەتو بە خوشکم تێرنەبوویت، منیش...

نەچووم، لەبەر خۆمەوە گوتم:

هەر خوشکەکەشت لەگەڵ خۆت نەهێنیت، هەقم لە سەر تۆ نیە.

لەبیـرمە هەزار جـار پتـر لە بەرخـۆمەوە داوای لێبـووردنم لە پەری کـردووە، پەریـی فریشـتە، پەریـی هەمیشـە پـاك، پەری ئەو پەریەی مـن پیسـمکرد، ئەو پەریەی مـن لەخـۆوە ویسـتم بـیکەمە لەشـفرۆش، داوای لێبووردنم لە مێردی پەری کرد، ئەو کوڕەی بەس من دەزانم چ کوڕێکی پاکە، چوومەوە ژوورە تایبەتیەکەی ئەتککەر و گوتم:

+ببوورە من ناتوانم بچمە لای ئەو کچە.

-بە دڵی خۆت بکە، بەلاّم ئەوەی گوتم لەبیری مەکە.

+وەك چۆن تۆ خاوەن قسەی خۆتی منیش هەر وا.

دوای ئەوەی کـارەکەم بـۆ ئەتکـکەر کـرد، کە دنیـایەك پـارەی دەستکەوت، ئیدی من وازم لە راوێژکاری و هەمـوو شتێك هێنـا، خراپ تێگەیشتن لە پەری بوو یان خوشکی کچی بازرگان بوو وایان کرد کە واز بێنم و بـبمەوە کەسـە ئاسـاییەکەی جـاران، نـازانم نە پەری بـوو نە خوشکی کچی بازرگان.

مـن ئەو سـاڵەی لە ژێـر گوشـاری کچـی بازرگـان، ئێسـتاش هەر پێیـدەڵێم کچی بازرگـان، ژوورەکەم، پەنـجەرەی دنیـام جێهێشـت، شاریشـم جێهێشـت، چـوومە بەغـدا ئەوە سـاڵێکە هـاتوومەتەوە، بەڵام لە بەغـداش پەریم هەر لەگەڵ بوو، ئەو ساڵەی سەدامە بەردینـە گەورەکە کەوت و لە جادە رایانکێشا بۆ چەند رۆژێك هاتمەوە، لە سـەری کۆڵانی خۆمـانەوە کە بـووەتە کـۆڵانی مـاڵی پەری، پەریـم دیـت، لەگەڵ مێـردەکەی و کـچەکەی دەچـوونەوە مـاڵێ، ئەو منـی نەدیـت، دەچـوونەوە ئەو مـاڵەی دەبوو هی من و پەری بێت، دەچوونە ئەو خانووەی کە بە چ حاڵ بـابمم رازیکـرد کە بە هەر شێوەیەك بێـت دەبێـت ئەو خـانووە بـۆ پەری بێـت، بە کەسی نەفرۆشێت جگە لە مێردەکەی پەری، نـازانم بـابم ئەوەی چـۆن پێکهێنا، دوای هاتنەوەشم چەند جارێ پەریم دیوە، بەڵام نەمهێشتووە ئەو بمبینێت، خۆزگە نەمـدیتبا، سیمای زۆر گـۆڕاوە، ناناسـرێتەوە، نەدەبـوو پەری نەناسـرێتەوە، تەمەن زەفەری بە جـوانیی پەری بـرد، ئەو جـوانیەی

من پێموابوو تا تەمەنی هەشتاش هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە، نەمایەوە، توایەوە، حەیف .

ئەگەر ئەو شەوە ئەو نەفرەتیە چیرۆکی رفاندنەکەی نەگێڕاباوە من سالانێکی زۆر بوو هیچ پەیوەندیەکم بە چیرۆکی پەریەوە نەمابوو، ئەو نەفرەتیە نازانم بۆچی لای من گێڕایەوە، دوای ئەو هەموو ساڵە گێڕایەوە، دڵنیام بیزانیایە خۆشەویستی من بوو نەیدەگێڕایەوە، تا ئەو چووزانێت، نەیزانیبوو، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ئەو کوڕە لەو جۆرە بێت، کچ بفرێنێت، ئەو ئێوارە درەنگەشم باش لە چاوە، دەهاتمەوە ماڵ هێشتا چەند دەرگایەك مابوو بگەمە دەرگای خۆمان لە سەری کۆڵانێ ماشێنەکەم دیت، لە هەستاندا دیتم ناناسایی بوو، تا دڵم گوتی ئەو ماشێنە کەسێکی رفاند، بەڵام بە هەندم هەڵنەگرت، ماشێنەکەش هەر بە ماشێنە سپیەکەی بەرزۆ دەچوو، ئەو بەرزۆیەی ئەوەتە سەرهاتی ئەو ئێوارەیەم بۆ دەگێڕێتەوە و نەیزانی چی بە سەردێت، بریا پێش ئەوەی شووشەکەی بە تەپلی سەریدا بدەم، لێمدەپرسی دوو کوڕەکەیدی کێ بوون؟ دەبوو لێیبپرسم، تا ئەوانیش بنێرمە خەستەخانە و خۆشم خوای دەکرد هەتا مردن لە زیندان دەمامەوە، من هەرگیز پەشیمان نیم لەو شووشەیەی لە سەری ئەو پیاوەم دا کە شەوێك پەری رفاند و لاقەی کرد، ئەو پەریەی ئەو هەموو پایزە وا لە دووریی دەسووتێم، ئەو پەریەی

جگە لە نامەیەك هیچم نیە بۆی، بەس ئەو نامەیەی بگاتێ بەس، چەند جار ویستوومە تەلەفۆن بۆ ژمارەکەی خۆمان بکەم، ناوێرم،حەفت ساڵە ژمارەی مۆبایلەکەیم لایە، رۆژ نیە نەیەتە سەرم کە زەنگێکی بۆ لێدەم، وشەیەکی بۆ بنێرم، نابێت، شتی وا نابێت، من هیچم لەگەڵ وی نەماوە، ئەو خاوەن مێردێکە وەك بیستوومە بە قەد دنیایەك خۆشی دەوێت، بەڵام حەزدەکەم ئەو نامەیەی هەر ساڵەی چەند دیرێکم لێی نووسیوە، حەڤدە ساڵ پترە خەریکیم، هێشتا تەواو نەبووە، بینێرم بۆ پەریی بنێرم، هەروەك جاری جاران نامەیەکی کاغەزیی بۆ بنووسم، مۆبایل بۆ ئەو دەم باش بوو بۆ ئەو حەفت پایزەی من و پەری بە دزی گەڕەك و کۆڵان بە دزی هەمووان عەشقمان دەکرد، مۆبایل بۆ ئەو دەم باش بوو، ئێستا بە من چی، ئەو نامە حەڤدە ساڵیە بگاتە پەری و بیخوێنێتەوە من چیدیم ناوێت.

# ٢٢

# پەری

دوای روونبوونەوە و رووتبوونەوەی وێنەکانی ژوورەکە، بابی ماچ زوو زوو چاوی دەبڕیە دارپرتەقاڵەکە و دەچووە خەیاڵەوە رۆدەچووە خەیاڵەوە، رۆچوونێك نە رەگی دار پرتەقاڵەکە چ ئەوەی خۆی چاندی چ ئەوەی کوڕی پیاوە مەستەکە، نە رەگی هیچ درەختێ وا رۆنەچووەتە زەویەوە، گازمـــدەکرد، دەچـــوومە باوەشـــی بەڵام ئەو وەهـــا نەدەرۆیشـــت بە بە گازکردن بێتەوە، کە دەهاتەوەش توند زۆر توند لە ئامێزمی دەگرت، سەد ماچی لێدەکردم، دەتگوت چەند هەفتەیە نەیدیوم، بابی ماچ، کەم منی بەجێهێشتووە، قەت نەبۆتە هەفتەیەك، بابی ماچ رستەیەکی ماچی هەبوو، زوو کەوتە زاری کۆلان و گەڕەکیش دەیانگوتەوە، بابی ماچ هەمیشە دەیگوت:

مـن ئەگەر رۆژێـك مـاچی تـۆ نەكەم وەك ئەوە وایە ئەو رۆژە بـۆ شەیتان بە رۆژوو بم.

دوای خوێنـدنەوەی وێنەكـانیش، خوێنـدنەوەی چیرۆكـی ئەوینـی حەفت پایزەی مـن و كوڕی پیـاوە مەستەكەش، رستەكەی خۆی هەر دەگوتەوە، پتریش لە ئامێزی دەگرتم، هەستمدەكرد دەترسێت، ترس لەوەی لە دەستی بچم، وای هەستدەكرد كە مـن هێشتا تۆزێك ئەوینی كوڕی پیاوە مەستەكەم لە دڵدا مـاوە، ئەو دەیویست وەك چۆن خۆی جگە لە ئەوینی مـن لە دڵیدا شتێك نیە، منـیش وابم، راستی منـیش هەر وام، بەڵام نـازانم بـۆچی حەز لە بینینـی كـوڕی پیـاوە مەسـتەكە دەكەم، لەوەتەی هەمـوو شـتم بـۆ بـابی مـاچ گێـڕاوەتەوە، پتـر تـامەزرۆی بینینەوەی كوڕی پیاوە مەستەكەم، نا مـن هیچم لەگەڵی نەمـاوە، مـن لەو شەوەوەی كە چلەمین شەوی بووك و زاوایەتیمان بوو، عەشقی بابی ماچ بووم عەشقێك رۆژ دوای رۆژ ئاگراوی تر بوو، دەبێت، لەو شـەوەوە هەزار جاریش گوتوومە:

خـۆزگە لە بنـی كـوڕی پیـاوە مەسـتەكەم نەدەناسـی، بـاش نەبـوو نەبوومە هاوسەری ئەو، بابی مـاچ، هەر بـابی مـاچ، مـن ئاسوودەترین ژنم كە هاوسەری بابی ماچم.

بەڵام نازانم بۆچی دوای ئەو هەموو ساڵە حەز بە دیتنەوەی کوڕی پیاوە مەستەکە دەکەم.

من دەبوو بەرزۆ ببینم، کێیە ئەو بەرزۆیەی درەنگانی ئێوارەیەك لە سەری کۆڵانی ماڵی پیاوە مەستەکە لەگەڵ دوو خوێریتری وەك خۆی منیان پەلکێشی ماشێنەکەیان کرد، بردمیان و کاری خۆیان کرد، ئەو خوێریانە دەبێت کێ بن؟ دیار بوو یەکیان منی باش دەناسی، ئێستا هاتەوە بیرم ئەو کاتەی هاتە سەرم گوتی:

هەموو رۆژێك بە بەردەممدا تێدەپەڕی و دەمسووتێنی و ئاوڕیش نادەیتەوە.

ئا وای گوت، بەڵام دەنگیم نەناسی، دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستا ئەو رستەیەم بیرکەوتەوە، ئەو بەرزۆیە کێ یە هەموو رۆژێك منی دیوە، من لە ناو بەرزۆیان هەر سێ بەرزۆ دەناسم، ئەوەی پێشان ماڵیان لە کۆڵانی پشتمان بوو، بەڵام ئەو بەرزۆیە لەوانە نەبوو، خوێڕیایەتی وا بکات، کوڕێك بوو هەندێك بە تەمەن، لە هەموو کوڕانی بێ ژن بە تەمەنتر، لەگەڵ بابم زۆر برادەر بوو، زۆر شەوان دەهاتە ماڵمان و هەتا درەنگ دادەنیشت، وا بزانم دەرچووی ئامادەیی بوو، هەڵاتووی سەربازیش بوو، لەپڕ بزربوو، نەمدیتەوە، کچە بە تەمەنەکانی گەڕەك

بۆی شێت ببوون، کەچی ئەو هەر ئاوڕیشی نەدەدایەوە، سەری لە کەس بلّند نەدەکرد، نا ئەوەیان نیە، بڕوا ناکەم بەرزۆیەکەی کۆلانی پشتمان لەگەڵ من شتی وای کردبێت.

بەرزۆیەکیدی، ئەودەم منداڵکار بوو، نا ئەوانەی منیان رفاند وا تێبگەم منداڵکار نەبوون، ئەوەیان دواتر بووە پێشمەرگە ئیدی نەمدیتەوە، ماڵیان نزیك ماڵی کوڕی پیاوە مەستەکە بوو.

بەرزۆیەکەیتریش جاش بوو، ئەویش جارێك گێچەلی پێمکرد، بەڵام دووبارەی نەکردەوە، من هەر ئەو سێ بەرزۆیە دەناسم.

ئەو دەمەو ئێوارەیەی ماچ نەخشەی دیتنی بەرزۆی کێشا و گەیشتە ساتی جێبەجێکردن، دڵم کوتە کوتی بوو، بەرزەفت نەدبوو، ترسام، تووڕە بووم، چەند جارێ ویستم پەشیمانببمەوە، نەمدەویست ببینم پیاوێکی دەمامکدراو ببینم، پیاوێك دەستەکانمی بەست و لاقەی کردم.

ئێستا من و ماچ و بابی ماچ لە ناو ماشێنێکین، من بە تەنیشت بابی ماچەوە، ماچ لە دواوە، یەکەم جارمە سواری ماشێنی وا بم، ماشێنی جام رەش، هێشتا رۆژ تەواوێکی ماوە، باخی منارە هێشتا هەر

لە ئاسمانەوە رووناكايى وەردەگرێت، جارێ گلۆپەكان كە لە چاوى من شێوەى چاو نیشاندەدەن هەڵنەبوون، ماچ چەند جارێ گوتیەوە:

ئێمە لە نێوانمان پەیمان هەیە، نابێت بیشكێنین.

بابى ماچ دەیگوت:

من لە تەمەنم لەگەڵ كەس پەیمانم نەشكاندووە ئەوجا لەگەڵ كچى خۆم!

منیش دەمگوت:

منیش نەمشكاندووە و نایشكێنم.

پەیمانى نێوانمان ئەوە بوو لە كاتى دیتنى بەرزۆ خۆمان تێكنەدەین و هیچ قسەیەك یا شتێك نەكەین، ماچ گوتى:

+تەماشاى ئەو دووانە بكەن.

-ئەوە!

لە نزیك ماشێنەكە روو لە ئێمە راوەستان، گەنجێكى بیست ساڵە و پیاوێكى لە سەرەوەى پەنجا ساڵى، جوان لێى وردبوومەوە، ئەویش دیار

بوو، نەیدەویست هێندە بوەستێ، گەنجەکە وەك بڵێی دەیخافڵاند، من پتر لێی وردبوومەوە، هەوە بە راستی هەوە، بەرزۆیەکەی کۆڵانی پشتمان، ئۆی خوێڕی، تۆ ئەوەت لەگەڵ من کرد! برادەری بابم بوویت، ئەو هەموو مێوانداری و رێزە، ئەو هەموو چایەم لە پێشت دانا، هیچو پووچ، دەمویست جامی ماشێنەکە دابەزێنم و تف لە ناو چاوی بکەم، وام نەکرد، پەیمانەکەم بیرکەوتەوە، دەنا دەموچاویم تفرێژ دەکرد، پەیمانەکەی بە ماچم دابوو، بابی ماچ بە بە ماچی گوت:

+ئەو کوڕە برادەرەکەتە؟

-هەوە، دڵوارە حەیف کوڕی ئەو پیاوە وەحشیەیە.

من تێکچووم، لەرزوتام گرت، بە پڕتاو گەڕاینەوە، بەڵام بابی ماچ وەك ئەوەی هیچی نەدیتبێت، هیچی نەبیستبێت، بە هەندی وەرنەگرت، دەیگوت:

دوای ئەو هەموو ساڵە شتێك بوو، روویدا، پێویست ناکات زیندووی بکەینەوە، کێشەیەکی ترسناکە، بۆ خۆمان باش نیە، لە بیری خۆتی ببەوە هەر وا بزانە کاتی خۆی خەونێکی ناخۆشت دیوە و تەواو.

خەونێکی ناخۆش! تا ئەو پیاوە سپلەیەم نەدیتەوە، شەوی گەشتەکە وەك خەونی لێهاتبوو، بەڵام بە دیتنی ئیدی نەك لە خەون نزیك نابێتەوە، لە رابردووش جێگەی نابێتەوە، راستیەکی هەنووکەییە هەر دەڵێی ئەو ئێوارمیە گەشتی لاقە دەستی پێکردووە، ئەو گەشتە گەشتێك نیە لە رابردوو، گەشتێکە لە ئێستا و ئاینندە، ئەگەر ناسیار نەبا، ئەگەر ئاشنا نەبا بە ماڵمان رێزی زۆری نەبا وەها تێکەڵی ئێستا و ئایندەم نەدەبوو، خۆ وا بزانم برادەری کوڕی پیاوە مەستەکەش بوو، خودایە دەبێت دوو پیاوەکەیدی کێ بن، دەترسم لە بەرزۆش نزیکتر بن، وا باشترە نەیانبینم، خودایە ئەگەر ئاشناشن با هێندەی بەرزۆ ئاشنا نەبن، من بەرگە ناگرم بەرگەی ئاشنایان ناگرم، لە خۆم بەدبەختی، چ دەبوو ئەو بەرزۆیەی منی رفاند و لاقەی کردم، بەرزۆیەك با نەك هەر بە من بە گەرەکیش نا ئاشنا با، چ دەبێت ئەگەر دوانەکەیدی هەر خەڵکی ئەو شارەش نەبن، نەدی ئەوەی شووشەکەی بە سەری بەرزۆدا کێشا، من لەو دەترسم، خودایە ئەوەی من بیری لێدەکەمەوە ئەو نەبێت، هەر کێ دەبێت، ببێت، تەنها ئەو نەبێت، دەترسم سۆراخی دوانەکەیدی بکەم، چ ئەوەی هاتە ناو رانمەوە چ ئەوەی نەهات، خۆی نەهات یان نەیانهێشت بێت، پێدەچێت، ئەوانیش ئاشنا بن، بۆیە کوڕی بەرزۆ ئەوەی نەدەبوو ببێتە برادەری ماچ، ئەوەی بابی خۆی نیشانی من و بابی ماچ دا، پێدەچێت خۆی

بدزێتەوە لە ناوهێنان و نیشاندانی ئەوانیدی، لە قسەکانی ماچڕا دیارە، دڵوار، ئۆی ئەو ناوە چەند خۆشە خۆزگە کوڕی سەگ دەبوو نەك هی بەرزۆ، ئەو دڵوارە نایەوێت من ئەوانیدی ببینم، بە ماچم گوت:

+ئەو برادەرەت کە پێناچێت لە بابی باشتر بێت، بۆچی ناوی ئەوانیدیم لێ دەشارێتەوە؟

-وا مەڵێ، کوڕەکان مەرج نیە بچنەوە سەر بابیان.

+ئەدی کچەکان دەچنەوە سەر دایکیان؟

-من حەزدەکەم بچمەوە سەر دایکم .

+نا، نەچیەوە سەر دایکت، تکایە لە زۆر شت نەچیەوە سەر دایکت.

-وەك چی؟ من هەمیشە شانازیم بە دایکی ماچەوە کردوە، خۆزگەم خواستووە تاڵە قژێك بام بە سەری ئەوەوە.

+نا، من بە قسەی ژنە کەسکپۆشەکەم نەکرد، تۆ بە قسەی بکە.

-ئەو ژنەی لە کۆلانی ماڵی باپیرمە؟

+ئـا، ئەو ژنەی دنیـایەك نهێنـی منـی لایە، ئەو ژنەی هەتـا ئێستاش دایکی منە، ئەو و قومریی جوانەمەرگ  و خوشکترین.

-رەنگە رۆژێك من تۆ بنووسمەوە، تۆ چیرۆکی.

+لە چیرۆکی من گەڕێ و ئاگاشت لە خۆت بێت، لێی دوورکەوە.

بابی ماچ رۆژ دوای رۆژ کز دەبێت، قەت ئەوها بە کزیم نەدیوە، ناوە ناوەش لە کۆمپیتەرەکەیەوە قالەمەڕە هەڵیدەکردە شمشاڵ، بابی مـاچ هەر کاتێك خەفەتێکی هەبا بۆ چەند ساتێك گوێی لە شمشـاڵ دەگرت، یـان لە سێوە، ئەو دووە بۆ بابی ماچ دەرمانی هێور کەرەوە بوون، زۆر جار بە پێکەنینەوە دەیگوت:

ئەگەر برینـداری دوو گـوللەش بم، کە گـوێ بـۆ ئەو دووە رادەدێرم، هەست بە ئازار ناکەم.

بـابی مـاچ بە سـاڵێکیش هێنـدەی ئەو چەنـد رۆژەی نەخـواردۆتەوە، لـێم بۆتە پیاوە مەستەکە، هەمیشە شووشـەیەکی بە دەسـتەوەیە، قسـەی پیاوە مەستەکە راست دەرچوو، گوتبووی بە ژنەکەی گوتبوو، چەند جار پێیگوتبوو:

ئەو حەوشە و بانە، ئەو باخچە و دار و درەختانە، ئەو هەمـوو گەڵا و چـۆلەکە و باڵنـدانە هـی ئەومیە شـەو رۆژ بە دیاریـانەوە بخـۆیتەوە، هەر کەسێك لێرە بژیت، فێری خواردنەوە دەبێت، بـڕۆ شێخ و دەروێشـان بێنە، بـڕۆ فریشـتانی ئاسـمان بێنە بـا وەرزێك لێرە بمێننەوە بزانە لە مـن پتـر دەخـۆنەوە یـان نـا، بەڵام ژنـیێ تـۆ لە چ تێـدەگەیت، ئەگەر هێنـدەی گەڵایەك، هێندەی بـاڵی چۆلەکەیك تێگەیشتبایت، دەهـاتی لەگەڵ مـن دەتخـواردەوە، مەسـت دەبوویـت و پـێکەوە گۆرانیمـان دەگـوت، سـەمامان دەکرد،حەیف! من یەك داخوازیم لە خودا هەبوو، پێش ژنهێنـان چەند جار رووم لە خودا کردووە و گوتوومە: خودای مـن، مـن هـیچم لە تۆ ناوێت، تەنها ژنێکی شەرابخۆر نەبێت، ژنێك لە جیـاتی بـۆنی بنیشت- تـۆ هەر بنیشت بجوو- با هەمیشە بۆنی شەرابی لێبێت.

ئەوەتە ئەو ژوورە، ئەو دارپرتەقـاڵ و درەختـانە بـابی ماچیشـیان وەك پیاوە مەستەکە لێکرد، دەچوومە تەنیشتی مـاچێکی چاویم دەکرد، تونـد لە باوەشم دەگرێت:

+بۆچی هێندە دەخۆیتەوە؟

-زۆر نیە، ها تۆش پێکێك بخۆوە، دەی بخۆوە، وەك من بخۆوە، با پێکەوە مەست بین، با بە مەستی سەمابکەین، بە مەستی بچینە باوەشی یەکترەوە، دەی...

+لە من گەڕێ، ناتوانم بخۆمەوە، تۆش هێندە مەخۆوە، ئەگەر منت خۆشدەوێت، هێندە مەخۆوە.

-هێندەی من تۆم خۆشدەوێت، هیچ پیاوێك هێندە ژنی خۆی خۆشنەویستووە، بزانە لە کاتی مەستیش پترم خۆشدەوێیت، بۆیە لێمگەڕێ با مەست مەست بم.

سەری بە سینەم کرد و کپ کەوت، خەوی لێکەوت، ئەو چەند رۆژە زۆر جار بە مەستی لە سەر سینەم دەخەوت و خەونی دەدیت، رادەپەڕی، بەڵام خەونەکانی نەدەگێڕایەوە.

پێدەچێت شتی نوێی زانیبێت، رەنگە دوانەکەیتریشی بینیبێت، دوور نیە ئەوەی زیندانیشی بینیبێت، خودایە زیندانیەکە کێیە! ماچیش شتی زانیوە، لێمدەشارێتەوە، بۆ دەبێت لێمبشارنەوە! بۆ لێم نەشارنەوە، من کەمم شاردەوە، کەمم لە بابی ماچ شاردەوە، نەدەبوو خۆم فێری هونەری شاردنەوە بکەم، لەگەڵ کێش، بابی ماچ، ئای، رۆژگار بگەڕێوە دواوە،

ساڵ ساڵ بگەڕێوە، تا دەگەیتەوە بن درەختی گوڵاوی بگەڕێوە، لەوێ لەو دەمەی درەختەکە یەکەم دەستگوشینی من و کوڕی درەختی گوڵاویی بینی، لەوێ هەموو رابردووی خۆم بۆ کوڕی درەختی گوڵاوی بۆ بابی ماچ دەگێڕمەوە، هەمووی دەگێڕمەوە بێ پەراندنی یەك ماچ یەك دەستلێدان، یەك پاڵخستن، حەیف چوو ئەوەی چوو، چوو، ئەوە من چێ دەڵێم، رابردووی خۆم هی خۆمە، بۆچی.....

بابی ماچ، بابی ماچی جاران نیە، نە لە پەنجەرەوە دەڕوانێتە چیا، نە پیاسەی ناو فریزی ماوە، نە بە بەژن و بالاّی درەختەکان یەکە یەکەی درەختەکان دەڕوانێت، تەنها تیچاوێکی دوژمنانە دەداتە دار پرتەقاڵەکەی گۆڕین، رەنگە دوژمنانە نەبێت چاوی من وای دەخوێنێتەوە، تەماشای ئەوانیتر ناکات، نە لەگەڵ جریوەی چۆلەکەکان سەما تایبەتیەکەی خۆی دەکات کە هەر خۆی دەیزانی، هەر لە خۆی دەهات، بابی ماچ، هەمیشە مەستە، یان لە سەر سینەی من دەخەوێت، یان دەچێتە سەر کۆمپیوتەرەکەی و دەنووسێت نایەوێت من ببینم، بزانم چی دەنووسێت، بابی ماچ قەت شتی نەنووسیوە، دنیایەك کتێبی خوێندۆتەوە، بەڵام هەرگیز دێڕێکی نەنووسیوە، خۆیشی چەند جار گوتوویەتی:

جگە لە نامە بۆ تۆ هەرگیز شتێکم نەنووسیوە.

ئیدی بابی ماچ دەنووسێت، بە سەرخۆشیش دەنووسێت، بابی ماچ زوو زوو لە ئامێزم دەگرێ، کاتێ لێوی دەخاتە سەر لێوم ئاسك دەیمژێ، دەیخاتە سەر گۆی مەمکم، ئاسك دەیمژێ، هەموو جێگەیەکی لەشم ئاسك دەمژێ، وەك جاران ئاسك دەیمژێ، بەڵام لە پڕدا لێوی هەڵدەگرێ هەر وەك ئەوەی هێڵنجی بێتێ، هەر وەك چۆن منداڵ کخ دەکاتەوە، هەستدەکەم ئەوها کخ دەکاتەوە، منداڵ تا پێینەڵێی (کخ، کخ) کخ ناکاتەوە، بەڵام بابی ماچ بێ کخ لێکردن کخ دەکاتەوە، هەبێ نەبێ کەسێ هەیە، من گوێم لێنیە کە کخ لە بابی ماچ دەکاتەوە، رەنگە وا نەبێ، من وا هەستبکەم.

بابی ماچ کەم زۆر کەم دەچێتە دەرەوە، کە دەڕواتیش زوو دەگەڕێتەوە، هەر لە سەر دەرگاوە بانگمدەکات، هەر کاتێك گوێی لە دەنگم بوو، ئیدی قسەناکات، من بە ئەنقەست، وەڵامی نادەمەوە بۆئەوەی پتر بانگم بکات:

پەری، پەری، پەری...

دەزانن ناوی پەری لە زاری بابی ماچ چەند ناسک دێت، لە زاری کەس ئەوها ناسک نیە، بابم نالێم.

رۆژێك بە دۆلابێکی گچکەوە گەڕایەوە، هەر هێندەی باولەکەی ژنە کەسکپۆشەکە ئەو باولەی هەموو شتە بە بەهاکانی خۆی تێدا پاراستبوو، خەناوکە و رەفتە و کیسەی خەنە و... دۆلابەکەی بابی ماچ پتەو بوو، قاسەی پارەش هێندە پتەو نەبوو، لەگەڵی بردمەوە ژوورەکەی، چەندی پرسیم بۆ چیتە؟ چی نەگوت، تومەز بۆ کۆمپیوتەرەکەی بوو، خستیە ناویەوە و کلیلی دا، ئیدی کۆمپیوتەرەکە بووە نهێنیەکی گەورە، گوتم:

+تۆ چیت لە بن سەرە، چی دەنووسیت، ناتەوێت من بیبینم؟ تۆ نابێت لەگەڵ من بگۆڕێیت، من جگە لە تۆ کەسم خۆشناوێت، لە سەر رابردوو لێپرسینەوەم لەگەڵ مەکە.

-من هەرگیز لە سەر رابردوو لە تۆ دڵگران نیم، ئەو قسەیە نەکەیتەوە، با لێت تووڕە نەبم، تۆ هەموو شتی منی، من هیچت لێناشارمەوە، بەڵام هەندێك شتی تایبەتی خۆمە دەینووسمەوە، جارێ نامەوێت کەس بیبینێت، چونکە رەنگە لێیان پەشیمانببمەوە و بیانسڕمەوە، بۆیە دڵگران مەبە.

+ئەگەر وایە...

-لەوە زیاتر چیدی نیە.

لە ئـامێزمی گـرت و هەسـتم بە گەرمـایی فرمێسـکەکانی کـرد، سڕیمەوە فرمێسکەکانیم سڕیەوە، سەری بە سینەم کرد، هێنـدەی نەمـابوو بخەوێت، راچڵەکی، چووە سەر کۆمپیوتەرەکەی، لەو دەمە مـاچ هـاتەوە، رووی لە بابی کرد:

-چما ئەو دۆلابە کلیلدارەت بۆ کۆمپیتەرەکەت بوو؟

+نا، جوان نیە!

-جوانە، بەڵام خۆ خۆشت دەزانـی بـۆ شـاردنەوەی نووسـین یـان هەر شتێك لە کۆمپیوتەر رێگەی تر هەیە، رێگای کلیل لە ناو کۆمپیوتەرەکە خۆی.

+وایە، بەڵام مـن ئەو رێـگەیەم پـێ باشـترە، رەنـگە کلیلـی نـاو کۆمپیوتەر بزربکەم لە ناو سەرم بکەوێت، بەڵام هـی دەرەوەی کۆمپیـوتەر بە ملمەوەیە و لێمناکەوێت.

-تۆ...

لە کۆمپوتەرکەوە گۆرانیەکی تازە، پێشتر لە کۆمپیوتەرەکەی بابی ماچەوە گوێم لێ نەبووبوو، چریکاندی:

هەر کەسێ هات و گوتی من عاشقم باوەڕ مەکە

تا لە سەر گۆنای نیشانەی زەخمی ماران گەز...

دەی جانی جانانم وەرە...

...ماهی تابانم وەرە

دوا رۆژی ساڵ بوو، هیشتا هەر سپێدە بوو تیشکی رۆژ بەر چلە هەرە بەرزەکەی داربیەکەش نەکەوتبوو، بابی ماچ لە ماڵ دەرچوو:

+بۆ کوێ؟ قەت تۆ نەبوویت ئەوها زوو بچیتە دەرەوە.

-هیچ نیە، ئەورۆ دەبێت چەند کەسێك ببینم.

+کێن ئەوکەسانە؟ خۆ...

-پەری، جارێ نازانم، هەتا نەیانبینم، نازانم کێن و..

+بۆچی منیش لەگەڵت نەیەم؟

-بە تکا تکات لێدەکەم، لێمگەڕێ، حەزدەکەم بە تەنیا بچم، ئەورۆ ڕەنگە درەنگ بێمەوە.

چاوەکانمی ماچ کرد و رۆیشت، ماچ لە دەنگی ئێمە بە ئاگا هات و گوتی:

+چیرۆکی ئێوە، چ چیرۆکێکە!

-خودایە چیرۆکی کەس لە چیرۆکی من نەچێت.

رۆژ لە سەر ئاوابوونە هێشتا بابی ماچ نەگەڕاوەتەوە، مۆبایلەکەشی لەبیرکردووە، نا، ڕەنگە بە ئەنقەست نەیبردبێت، دەمویست تەلەفۆن بۆ چەند برادەرێکی بکەم بزانم نەیاندیتووە، لەو دەمە لە پەنجەرەی دنیاوە چاوم لە کۆڵان بوو، دیتم گەیشتە سەر دەرگای حەوشە، گوێم هەڵخست بۆ ( پەری، پەری ) بەڵام دەنگ نەبوو، بابی ماچ بێ دەنگ هاتە ژوورەوە، چوومە بەردەمی، ڕەنگی پەڕی بوو، ئەوە چ بە بابی ماچ ناچێت:

+چیە، بۆ وات لێهاتووە؟

-.....

+قسە بکە.

-هیچ، دەبێت بخەوم.

+وەرە، لە باوەشی من بخەوە.

-خەوێکم دەوێت لە تەنیایی.

سێوە دەنگی هەڵبڕی:

ئەریَ گوریَ

ئامان گور لە خەویَ هەڵدەستی

شەنگ و شۆڕیَ، بەژن بڵندیَ

پشتی دەبەستی

ئەریَ برادەرینە

ئەگەر هەنییَ گورە جوانیَ لە بۆ من بمێنیَ

بەویَ مانگی لە چواردەی

کە ئەوەتانیَ لە مابەینی هەور و سامالّی

جۆخینی دەبەستی..

داد گوریێ

لە باخانم نەماوی...

دیتم دوو دنکە حەبی قووتدا و راکشا، خەوت، ئەو شەوە لە تەنیایی خەوت و من بە دیاریەوە تێکەڵی دەنگی سێوە بووم و تێر گریام.

## ٢٣

# بابی ماچ

نازانم بۆچی بەو سپێدە زووە لە ماڵ دەرچووم، خۆ بەندیخانە وەها زوو دەرگا بۆ کەسوکاری بەندیان ناکاتەوە، رەنگە من پێموابووبێت ئەو رۆژە چەندی زووتر لەماڵ بێمە دەرێ، هێندە زووتر ئەو یادگارە دەبینم کە بە شووشەیەك بەرزۆی رەوانەی خەستەخانە کرد و خۆیشی تووشی بەنـــدیخانە بـــوو، بەرزۆ خەســـتخانەی بەجێهێشـــت، ئەو بەرزۆیەی کە بەندیخانە جێگەی ئەوە، بەڵام یادگار جارێ هەر لە بەندیخانەیە، ئەو بەیانیە چووم لە چوارریانی کۆترەکە نیسکێنەم خوارد، کات نەدەرۆیشت، چەند کەرەتێ لە خولگەی بە تەمای خوای بە دەوری ئاوەکە و خۆمدا خولامەوە، چوومە باخی منارەی چۆلی وەرزشم کرد، وەك بڵێی خۆم ئامادە دەکەم بۆ شەڕی زۆرانبازی، بۆ شەڕی مستەکۆڵە ئەوها خۆم ئامادەکرد، کات نەدەرۆیشت، چووم لە پێش دەرگای بەندیخانە ریزم گرت، چەند کەسێکم لە پێش بوو، هێشتا زوو بوو، من هەر نزام دەخوێند

کە ئەو یادگارە هیچ کام لەو یادگارانە نەبێت کە دەیانناسم، من هەر سێ یادگاری ئاوزەی خۆمم دەناسی، نزام دەخوێند ئەو یادگارەی من بۆ دیدەنیی دەچم هیچ کام لەو یادگارانە نەبێت کە من دەناسن، هیچ کام لەو یادگارانە نەبێت کە رۆژێك لە رۆژان لە جێگەیەك دیومن، ئەگەر هەر یادگارێکی ناسیاریش دەردەچێت ئەوە نەبێت کە لە کۆلیژ پێکەوەبووین، نزام دەخوێند ئەو یادگارە شووشە وەشێنە ئەو یادگارە نەبێت کە وێنەکانی ژوورەکەی نەخشاندووە، کە حەفت پایز لەگەڵ پەری ئەوینیان کردووە، ئەو یادگارە دەبێت کێ بێت!

ئێستا من لە ناو بەندیخانەم لەو دیوەی شیشەکانەوە چاو دەگێڕم، چاو لە یادگاری شووشەوەشێن دەگێڕم، دڵواری برادەرەکەی ماچیش دواکەوت، وا بڕیارە ئەو نیشانمبدات، هێشتا دڵوار دیار نیە، ئەها، دەڵێی ئەو کوڕە دەناسم، ئا، دەیناسم، وەختی خۆی چوار ساڵ لە کۆلیژ پێکەوە بووین، هەوە یادگارە، ئەوە چی دەکات لێرە! ئەوە شووشەوەشێن نەبێت، ئەوتا بەرانبەری راوەستاوم، لە بن چاوەوە تەماشام دەکات، دەڵێی دەمناسێتەوە، دوای ئەو هەموو ساڵە یەکتر دەناسینەوە، خودایە، ئەوەم لەگەڵ مەکە، ئەو یادگارە پەیوەندی بەو شەڕو کێشە و ئەوینەوە نەبێت، من بەرگەی ئەو کوڕە ناگرم.

ڤیروسیا با سلاوێکی لێبکەم:

+باشی، من دەناسیەوە؟ چۆنە کەوتوویەتیە ئێرە؟

-سوپاس، دەتناسمەوە، ئیدی...

+بۆچی لێرەی؟

-تۆ بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟

+بە دوای پیاوێك دەگەڕێم لە یانەدا شووشە رادەوەشێنێت؟ خۆ نالێیت منم!

-بە هەڵە نەهاتوویت، لە من پتر کێ هەیە کەرایەتی وا بکات؟

ئای! لەو دەمە ئەگەر دڵوار دەستی نەخستبایەتە بن شانم کەوتبووم، نەمزانی لەکەیەوە لە پشتم راوەستاوە، خۆزگە ئەو یادگارە هەر یادگارێك دەبوو، بەڵام یادگارە تاڵەکەی چوار ساڵی کۆلیژ نەدەبوو، تاڵترین یادگاریم لە کۆلێژ، لە بەشە ناوخۆیی، لە بەغدا لەگەڵ ئەو کوڕە بوو، هەر لە هەفتەی یەکەمی ساڵی یەکەم من و یادگار لە خۆڕا بووینە ناحەزی یەکتر، لە بیرمە لە یەکەم پێکەوە دانیشتن لە یانەی کۆلیژ، چەند قوتابیەك کەوتینە سەر مێزێك، کەس کەسی نەدەناسی، هەر

بەیانی باشەکە لە نێوانمان بوو، هێشتا دەموچاوی یەکتریشمان باش لێکدی نەدەکردەوە، من و ئەو کوڕە لەو دانیشتنە بەرانبەری یەکتر دانیشتبووین، لەوێ لەو دانیشتنە هەستمکرد ئەو کوڕە دوژمنکارانە تەماشامدەکات، ئەویش هەر دەبێت وا هەستی کردبێت، نازانم بۆچی نەك هەر نەکەوتە دڵمەوە بەڵکو وەك نەیارێک خۆی نیشانی من دا یان من وا نیشانی خۆمم دا، ئیدی لە ماوەی ئەو چوار ساڵە هەر کاتێك چاومان دەچەقیە چاوی یەکترەوە وەك ناحەز تەماشای یەکترمان دەکرد، بەبێ ئەوەی شتێك، ناخۆشیەك، هیچ لە نێوانمان هەبێت، هەر ساڵی یەکەم هەموو پۆڵ هەستیان بەو دوژمنکاریەی نێوان من و یادگار کرد، زۆر هەوڵیان دا پێکبێینەوە، بەڵام خۆ ئێمە شەڕێکمان نەکردووە چ شەڕی قسە چ هیچ جۆرە شەڕێك تا ناوبژیوانێك بێت و ئاشتمان بکاتەوە، بێ کەڵك بوو، هەرچیان کرد هیچ نەکرا، من و یادگار هەر بە ناحەزی ماینەوە، ئەو کوڕە هەموو پێنجشەموانێك لە بەغداوە دەهاتەوە هەولێر، شەمووانیش بە وانەی یەکەم رادەگەیشت، چوار ساڵ ئەو هاتوچۆ هەفتانەییەی دەکرد، بێ ئەوەی هەفتەیەك لەبیربکات، دەمبیست لێیاندەپرسی:

+بۆچی هەموو هەفتەیەك ئەو رێیە دوورە دەبڕی؟

-بیری دایکم دەکەم، ناتوانم نەیبینم.

لە بیرمە زۆر جار پەنجەکانی بە شێوەیەك دەخستە جوولەوە وەك ئەوەی شتێك لە ناو لەپی بێت و بیانگوشێت، زۆر لێیانپرسیبوو بۆچی وا لە پەنجەکانی دەکات، هیچی نەگوتبوو، بەڵام جارێك وەك لە زمانی دەرچووبێت، گوتبووی:

من هەموو هەفتەیەك کە دەچمەوە بۆ گوشینی دوو هەنار.

ئێستا زانیم بیری کێی دەکرد، ئێستا زانیم پەنجەکانی بۆچی لە جوولەی گوشینی بوون، ئێستا زانیم بۆچی چارەی یەکترمان نەدەویست و هەمیشە مۆڕەمان لە یەکتر دەکرد، من خەریکە باوەڕ بە نائاگایی و نادیاریەکی سەیر بێنم، ئەو هەموو دوژمنکاریە بێدەنگیەی نێوان من و یادگار لە خۆوە نەبوو، هەردووکمان ئایندەزان بووین، ئایندەی یەکترمان خوێندبۆوە، دەبێت خوێندبێتمانەوە، دەنا بۆچی لە هیچ و خۆڕا چاومان بە یەکتر هەڵنەدەهات، دوژمنایەتی یەکترمان دەکرد، زۆر جار دەهاتە سەر ئەوەی پەلاماری یەکتر بدەین، وەك بڵێی زانیبێتم خۆشەویستی حەفت پایزەی ئەو دەبێتە هاوسەری من، ئەو کچەی لە بن درەختی گوڵاوی دەستەکانیم گوشی و لە شەوێکی بەفراوی لە نهۆمی سەرەوەی مێوانخانەیەك یەکەم ماچم لە لێوەکانی تۆمار کرد، ماچێك تا

دنیا دنیایە تامی لە لێوم دەمێنێ و نەمرە، پێشتر لە بن ئەو دار پرتەقاڵە ماچی یەکەمی لە لێوی ئەو یادگارە تۆمار کردووە، ئای ماچی یەکەم! بە چی لە بیردەچیەوە! تا وەك من لە ماچی یەکەم تێگەیشتبم هەرگیز لە بیرناچێتەوە، ماچی یەکەم بۆ من پەریە، بەڵام بۆ پەری یادگارە، ئای لەو یادگارە! لە هیچ شتێك خۆزگەی پێناخوازم لەوە نەبێت، خۆزگەم بە یادگار کە ماچی یەکەمی پەریی برد و بەر من نەکەوت.

هێی ئەو یادگارە تاڵە باخەوانی سینەی پەری بووە، هەنارە فەریکەکانی پەری لە ناو دەستی یادگار گەیون و گەورە بوون، خۆزگەم بەو حەفت پایزە هەناریە، ئەو حەفت پایزە حەفت پایزی ناسك لە تەمەن، هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە، ئای ماچی یەکەم! من هەرگیز ماچی یەکەمم لە بیرناچێتەوە، دڵنیام پەریش هەروا، یادگاریش هەروا، خۆزی دەخوازم ماچی یەکەمی پەری لە یادگار نەبێت، ، ماچی یەکەمی یادگاریش لە پەری نەبێت، بەڵام داری خۆزگە کەی بەری داوە، بۆ کێ بەری گرتووە تا بۆ من بگرێ، ئەو دارپرتەقاڵە دڵنیام بۆ هەردووکیان ماچی یەکەم بووە.

باشە من چ پەیوەندیم بە رابردووی پەریەوە هەیە! بۆ وا خێڵەکیانە بیردەکەمەوە، ئەرێ ئەوە من چیم بەسەرهاتووە؟! پێدەچێت زۆر مەست

بم بۆیە وا قسە ناگێڕمەوە، وشە ناگێڕمەوە، هەرچی دێتە سەر زمانم بە پەنجەکانم دەینووسم، نەدەبوو ئەو رستانە بنووسم، بەڵام تازە نووسیم و رەشنابنەوە، نابێت رەشبنەوە، سوێندم بە ئەوین خواردووە هەر بە سەرخۆشی رۆژانەی خۆم بنووسمەوە، هەرچیشم نووسی رەشینەکەمەوە، ئای پەری! لە هەموو پەریان پەریتر، پەری جوانترین، گوڵترین، ژنترین، کچترین، شیرینترین، ژنی دنیایێ، بە من بڵێ تۆ عەشقی چی ئەو یادگارە بوویت! ئەو یادگارەی لە سیمایدا هەوەسبازیم دەخوێندەوە نەك ئەوین، پەری دوای ئەو هەموو ساڵە چیە ئەو هەموو دەردەسەریە سەردەکەن و دێنە سەرمەوە و دەمکرۆژن! پەری وەرە فریام بکەوە، نا لێمگەڕێ.

ئای پەری لە رۆژی دوا رۆژی ساڵ من چیم بە چاوی خۆم دیت، ئەو رۆژە رۆژێکە گیانی منی هاڕی، وێران بووم، ئێستا لە کەلاوەیەك پتر چیتر نیم، تێکیشکاندم، ئەو رۆژە چیم دیت، چیم بیست، پەری من لە دەستچووم، پەری من گوناهم کرد کەوتمە داوی ئەوینەوە داوی تۆوە! پەری، تۆ ئەو هەموو سەرهاتەت لە کوێ بوو، تەمەن چیە هێندە سەرهاتە سەیرە بگرێت! خۆزگە ئەو سپێدەیە لە ماڵ دەرنەدەچووم، خۆزگە لە باوەشی تۆ دەمامەوە، خۆزگە لە ئێستادا دەمامەوە و نەدەکەوتمە دوای رابردوو، خۆزگە ئێستا بە داوێکیش بە رابردووەوە

نەدەبەستــرا، ئەو رابــردووە چ رابردوویەکــی ئێســتاییە، ئاینــدەییە، ئەو رابردووە ترسناکە، تارماییەکی ترسناکە راودەنێ.

یادگـاری تـاڵ تـۆ بـۆم هەر تـاڵاو بوویـت، یادگـار کـاتێ کـۆلیژم تەواوکرد من جیا لە هەمووان ناهەنگی لە تۆ دوورکەوتنەوەم گێڕا، تۆش رەنگە ناهەنگێکی وات گێڕابێت، ئا، ئەو رۆژەی دوا رۆژی کۆلیژ بـوو، من ناهەنگم گێڕا و سەد جار گوتم:

ئۆخەیش، خۆ چیدی ئەو چرۆچاوە نابینم، چیدی نەکەس مۆڕەم لێدەکات و نە مۆڕە لە کەس، ئۆخەیش، یادگار وەك یادگاریەکی تاڵ بە جێدێلم و چیدی تووشی نابمەوە، چ بزانم، دوای ئەو هەمـوو ساڵە تـاڵتر سەد هێندەی ئەودەمانێ تاڵتر دێتە ناو ژیانمەوە، ئەو پیاوە تـاڵیی ژیـانی مــنە، ئەو تــاڵیەی لە ژیــانی منــدا هەیە چ ئێســتاو چ پێشــتر ئەو یادگـارەیە، ئەو یادگـارەی ژووری نووسـتنمی پـڕ لە وێـنەی خـۆی و پەری کـردووە، وێـنەی رووت، ئەو یادگـارەی تارمــاییەکی ترســناکە و بیناییمی گرتووە، ئەو یادگارەی یەکەم ئەوینی داگیرکرد، ئەو ئەویـنەی دەبوو بۆ من بێت بۆ ئەو بوو، ئەوینی پەری.

ئەو ئێـوارەیە چ ئێـوارەیەکی تـاڵ بـوو، ئێـوارەی یـانە، خـۆزگە ئەو ئێوارەیە لە جادە ماشێنێك لێی دەدام رانێکم ورد دەبـوو و لە جیـاتی یـانە

دەچوومە خەستەخانە، چی دەبوو ئەگەر چەند مێزێك دوور لە ئەوان لە بەرزۆ و یادگار دادەنیشتم گوێم لە هیچ نەدەبوو، وەك خەڵکەکەیدی شەرێکم دەدی و تەواو، چی دەبوو ئەگەر ئەو بەرزۆیە کەمێك هێواشتر قسەیدەکرد و من گوێم لە وشەی پەری و خاڵ لەگەردن نەدەبوو، چ ئێوارەیەکی تاڵ بوو تاڵتر لە یادگاری تاڵ، ئای ماچ تۆ ئەو برادەرەت لە کوێ پەیدا کرد، ئەگەر ئەو نەبا، دوور نەبوو نە بەرزۆ ببینمەوە نە یادگار و نە ئەویش.

ئەو رۆژەی دوا رۆژی ساڵ بوو ئەوەی من بیستم و دیتم کەس نەیبینێ و نەیبیستێ و بە سەر کەس نەیە، من نەبم کێ بەرگە دەگرێ، بەرگەی یادگار، بەرگەی ئەو، خۆزگە پەری پەیوەندی لەگەڵ حەفت کەس دەبوو بەس یادگار نا، خۆزگە حەفت بەرزۆ دەستدرێژیان دەکردە سەر پەری، بەس ئەویان لە گەڵ نەبا.

دوای چوونە بەندیخانە دوای دیتنی یادگاری تاڵ، لەگەڵ دڵوار رۆیشتین، لە چایخانەی قەرداران سەرو چایەمان خواردەوە، گوتی:

+پاش کەمێکیتر دوو پیاو ئەها لەو بەرانبەرە روو لە ئێمە رادەوەستن، یەکیان لە تەمەنی تۆیە شتێك گچکەتر، ئەویان ئارامە.

-خۆ ئەو نازانێت ئێمە بۆ دیتنی ئەوان لێرەین.

+نا، نا ئەو هیچ نازانێت.

-بەڵام من حەزناکەم ئەو کوڕەی لەگەڵ ئەویشە من ببینێت.

+باشە، خۆت بدە ئەو پەنایە.

دەبێت ئەو ئارامە کێ بێت، من دنیایەك ئارام دەناسم و ناسیارن، نا بڕواناکەم هیچ ئارامێك لەو ئارامانەی من دەیانناسم شتی وایان کردبێت، نا، دڵنیام ئەوەشیان کەسێکی نەناسراوە لای من، وەك بەرزۆ نەناسراو، مرۆڤی نەناسراو هەر شتێکت بەرانبەر بکات، ناگاتە ئەوەی ناسیارێك شتت لێبکات، من وا چاوەڕێی بە دیار کەوتنی پیاوێك دەکەم، کاتی خۆی لەگەڵ بەرزۆ پەریان رفاندووە و بە زۆر لاقەیان کردووە.

+ئەها، ئەوە هاتن.

-کوا؟

+ئەوەتا لە بەرانبەرمان راوەستاون، ئەوەی کڵاوەکەی لە سەرە.

-تۆ گاڵتە بە من دەکەیت!

+نا، بۆچی گاڵتەت پێدەکەم.

-بڕوات پێناکەم، بابت دەیەوێت من.

+من تێتناگەم، بۆچی باوەڕناکەیت؟

چۆن باوەڕبکەم، ئەو ئارامە دەزانن کام ئارامە! کوڕی زڕدایکمە، کوڕی بابمە، هەتا پەریشم گواستەوە برای من بوو، ڕێی تێدەچێت، ئەو برایە ئەو کارەی کردبێت! ئارام لەو کوڕانە نەبوو، کچی خەڵکی بڕفێنێ و لاقەی بکات، نا، ڕەنگە هەڵەیەك هەبێت، ڕەنگە بەرزۆ بیەوێت، باری من قورستتر بکات، وێرانترم بکات، بە پیشاندانی ئارام خۆی تێدا بزربکات.

نازانم چۆن و بە کام ڕێگادا گەیشتمەوە ماڵ، بەڵام دەبێت زۆر جێگەم کردبێت، لە زۆر جێگە دانیشتبم و مابمەوە، یان هەر تێسووڕابم و هەموو شارم کردبێت، ئەوجا گەڕابمەوە ماڵێ، بەڵام لەو نێوانە، لە چاخانەوە تا ماڵ، هەر خەریکی هەڵدانەوەی ئارام بووم، هەڵسوکەوتی ئارام، قسەکانی ئارام، تێڕوانینی ئارام، ئارامی پێش گواستنەوەی پەری، ئارامی دوای گواستنەوەی پەری، ئارامی ئەو چەند ساڵەی دوایی کە ڕۆیشتە هەندەران و ماوەیەکی زۆر بێ هەواڵ مایەوە، دواتریش

خۆی لە مـن نەدەگەیانـد و وەك ئەوەی لێمهەڵبێـت، منـیش کە دیـتم لالـووتە رووم نەدەدایـێ، رۆژی زەماوەنـدەکەم لەبیـرە، ئەو دەمەی یەکەم جاری بـوو پەری ببینێت، مـن بە چ بـزانم پێشـتر پەریـی دیـوە! دیـتم چاوی لە پەری بڕیبـوو، بە واقوڕمـاوی تەماشـایدەکرد، لام سـەیر بـوو ئەوها لێی دەڕوانێت، بە هەندم هەڵنەگرت، گوتم وەك هەر کەسێکیدی جـوانی پەری سـەرنجی راکێشـاوە و تەماشـای دەکـات، بەلام ئەو تەماشاکردنە زۆری نەبرد، سەری داخست هەر ئەو سەرداخستنە بوو، لە دوای تەواببـوونی زەماوەنـدەکەش ئیـدی نەهـاتەوە، هەر لە زەماوەنـدەکە پەری بە چرپە گوتی:

-براکەت لە جیاتی تۆش تەماشام دەکات، سیمای غەریب نیە.

+کێ هەیە بتوانێت تەماشای جوانیی تۆ نەکات!

# دڵوار

مـن دڵـوارم شـەرم دەكەم كـوڕی بەرزۆم، مـن بە هەڵە كـوڕی ئەو پیاوەم، رووم نیە ماچ ببینم، چاوم بەرانبەر دایكی مـاچ هەڵنایە، نـازانم چی بە بابی ماچ بڵێم، خۆزی دەمتوانی واز لە ماچ بێنم، ماچ، مـاچ گرتوومی و بەرمنـادا، دەنـا هەتـا پێم تێدابوو هەڵدەهاتم، لەو شـارە و لە دنیـا هەڵـدەهاتم، ئیـدی مـاچ لێـرەی هێشـتمەوە، بە تەنیشـت چیرۆكـی یەكەم ماچەوە هێشتمیەوە، ماچ منی خستە تۆڕی هەواڵگریەوە، ئـا مـن كـاری هەواڵگـریم كـرد، ئەوەی مـن كـردم لە دەسـتی هەواڵگـریـی هـیچ دەوڵەتێك نایە، من بۆ نووسینەوەی چیرۆكی مـاچی یەكەم كە مـاچ بە نیازە بینووسێتەوە كەوتمە ئەو تۆڕەوە، خۆشم نازانم لەو ماوە كورتە چۆن دەسـتم گەیشـتە ئەو پیـاوانە و چـۆن بـوونە ئاشـنام و بـوومە جێـی متمانەیـان، مـاچ نەبـا مـن نهێنیـی بـادەم نەدەزانـی، مـاچیش لە بـابی مـاچەوە ئەو نهێنـیەی دیتبـۆوە، پیـاوە مەسـتەكانی ئەو شـارە رەنـگە لە پیاوی هیچ جێگەیەك نەچن، مەستەكانی ئێرە دەڵێی بەلـووعەی ئـاون، هەر هێنـدە كـرانەوە دەڕژێ دەڕژێ نهێنـی دەڕژێ، ئەگەر بـادە نەبـا، نەخشەسـازی گەرمـاو كە بە دارشـەقیش ناتوانێـت بـڕوات، ئەوهـا بـۆ

چیرۆکی یەکەم ماچ دەهاتە گۆ! بادە نەبا ئەو پیاوەی شووشەی لە سەری بابم شکاند و ماوەیەك لە زیندان مایەوە و سوێندیشی خواردبوو لە بارەی ماچی یەکەمەوە یەك وشە نەڵێت، ئەوها حەفت پایزی خۆی بە گۆڕێ وەردەکرد! بادە نەبا، پیاوە مەستەکە ئەوەی هەمیشە مەستە، ئەوەی بە تەمەنترین و مەست و مەستترین پیاوە ئەو هەموو نهێنییەی لە دەم دەردەچوو! بادە هەندێك قسەی بە کوڕی نەفتفرۆشیش کرد، بادە نەبا، کۆمپیوتەرەکەی بابی ماچ ئەو هەموو نهێنییەی بۆ چیرۆکی ماچی یەکەم دەپاراست! بادە بادە، کێ ناهێنێتە قسە! دڵی کێ بە گۆڕێ وەرناکات، پیاوە مەستەکە دەڵێ:

حکومەتی ئەو کات و ئێستاش گەمژەن، لە جیاتی قامچی و کارەبا ئەگەر لەگەڵ بەندیان عەرەق بەکاربێنن، هەموو شت دەڵێن.

حەیف ئەتککار لە تەقینەوە گەورەکەی سەر لەسبەینێی جەژنەکەی ئەو ساڵە سەری پەڕی دەنا، بادە بە قسەی دەهێنا و دوورنەبوو لە سەرێکەوە لە چیرۆکی ماچی یەکەم بکاتەوە، پاکانەنووسیش هەر بەو تەقینەوەیە چوو، دەنا ئەویش لە ڕێی بادەوە ماچی یەکەمی تیشکاوێتر دەکرد.

## ٢٤

# پەری

بابی ماچ گوتی:

وا چاکە بە دوای پیاوی سێیەمی شەوی گەشتەکەدا نەگەڕێین، وا چاکە لە ناوەکەشی نەپرسین، دەترسم کەسێکی زۆر نزیك دەرچێت، بۆ تۆ لە بەرزۆ نزیکتر، بۆ من لە ئارام نزیکتر، دوایی مادام چەند ساڵە کەس نەیدیتووە، کەس نازانێت چی بە سەرهاتووە، دوادیش هەر شوفێریەکەی کردووە، باشترە سۆراخی نەکەین.

منیش رەنگە لەبەر دڵی وی بووبێت، گوتم:

باشە، با بە دڵی تۆ بێت.

سات دوای سات بۆ بابی ماچ عەشقاویتر دەبووم و لەگەڵ ئەوەش تامەزرۆی دیدەنیی کوڕی پیاوە مەستەکە بووم، لەو رۆژەوەی زانیم

ئەوەی لە یانەکە بەرزۆی لە خوێن وەردا و کەوتە زیندانەوە ئەو بوو، پتر دڵم بۆ دیدارێکی لێیدەدا، دڵم بۆی لێیدەدا، ژمارەی تەلەفۆنەکەیم نەدەزانی دەنا قسەیەکم لەگەڵی دەکرد،ماڵیانم نەدەزانی دەنا هیچ نەبا سەرێکم لە کۆڵانەکەیان دەدا، شەرمیشم دەکرد، لەکەس بپرسم، خوشکترین زوو هەستی بەو لێدانی دڵە کرد، گوتی:

+پەری، هەڵەی وا نەکەیت، پەشیماندەبیەوە، هەر ژنێك پیاوێکی وەك بابی ماچی هەبێت، خەیاڵی لای هەر پیاوێکیتر بێت گوناهی گەورەی دەگاتێ.

-من بابی ماچ بە هەموو پیاوانی دنیا ناگۆڕمەوە، بەڵام حەز بە دیتنی کوڕی پیاوە مەستەکەش دەکەم، بە دەست خۆم نیە، ماچی یەکەم لە بیرناچێتەوە، خۆ من بیشیبینم بڕواناکەم تەوقەشی لەگەڵ بکەم، قسەشی لەگەڵ بکەم، نازانم، تا نەیبینم نازانم چی دەبێت.

+باشترە نەیبینی، ئەو زۆر غەدری لە تۆ کرد، کوڕێك حەفت پایز لەگەڵ کچێك بێت و خۆشی بوێت چۆن وازی لێدێنێت! ئەوە کەی ئەوینە! کەی پیاوە! ئەو کوڕە لە هەوەسبازێك پتر چی بوو؟

-وایە، ڕەنگە، نازانم...

جگە لەو هەموویانم دیتەوە، ئەو کورەی نامەیەکی بۆم ناردبێت، چاوێکی لێم داگرتبێت، ئەو کورەی ئاماژەیەکی جوانی بۆم هاویشتبێت، پلارێکی ناسکی تێمگرتبێت، هەموویان هەر هەموویان ناوە ناوە سەرێك بەو کۆلانەدا دەکەن، رێییان بەو کۆلانە کەوتووە، دڵنیام هاتنیان بۆ دیتنی من بووە، دەهاتن، دێن، پاکانەنووس هەموو جەژنانێك دەهات، تاوێك دادەنیشت، بە سەر خۆی نەدەهێنا بەڵام هەستمدەکرد لە ناوەوە دەکولا بۆ من دەکولا، ئەو جەژنەی بای ئەجەل هەڵیگرت و بردیە پێش بارەگاکە ئەو بارەگایەی هەر خشتێکی چووە ئاسمانێك، چارەگێك پێشتر لە ماڵمان بوو، دەیویست شتێك بڵێ گێڕایەوە.

کورە تەڕەفرۆشەکە ئەوەی نامەی ئاروویی نارد تا ئەو زستانەی سڕ گومیش بوو، رۆژێك نا رۆژێك عارەبانەکەی لە پێش دەرگای ئێمە رادەگرت، ناچار بووم بچمە سەر عارەبانەکەی و دەسکە توورێك، کیلۆ ئارووپەك شتێك هەڵگرم، ئەگەر نا لە دەرگای دەدا:

داکی ماچ، داکی ماچ، وەرە هەموو جۆرە میوە و تەڕەیەکم هەیە.

بە دزیەوە بە دزیی من و ژنانی دەوری عارەبانەوە تیچاوێکی تینووانەی دەدامێ.

ئەدی کوڕە لوقمفرۆشەکە، ئەو کوڕەی تا ئێستاش هەر لوقمفرۆشە و تا ئێستاش هەر شەرمنترین کوڕە و ژنیشی نەهێناوە، رۆژ نیە بە بەر دەرگادا رانەبووریٚ، سەر بڵند ناکات، نەمدیتووە تەماشاشم بکات، جارێك خوشکەکەی یەخەی گرتم:

+تۆ ژیانی براکەمت وێرانکرد.

-بەڵام من هەرگیز هیچم لەگەڵ ئەو نەبووە.

+دەزانم، بەڵام ئەو لە مێژە سوێندی خواردووە یان پەری یان کەس.

-گوناهم هەیە؟

+بەڵیٚ، خاڵەکەت، پێکەنینەکەت، ئەوانە بێئەوەی بە خۆت بزانیت، گوناهت بۆ تۆماردەکەن.

چەند جارێك کوڕە چەقۆکێشەکەشم لە کۆڵانیٚ دیت، ئەوی بەر تەقینەوە گەورەکەی نزیك باخی گلکەند کەوت، دەیانگوت تەرمەکەی بە چەقۆکەی ناسرایەوە، جارێك لە پەنجەرەی دنیاوە گۆتمە بابی ماچ:

+ئەها، تەماشای کۆڵان بکە، بیبینە، ئەو چەقۆکێشەش سەردەمانێك بە تەمام بوو.

-ڕەنگە هەر ئەوەش بووبێت کە چەقۆکەی لە من دا.

لەو دەمە بابی ماچ ماچێکی کردم و گـوتی: وەرە هەر بۆ خۆشـی گوێ لەو کۆپلەیەی سێوە بگرە:

وە من بوارەکم ئەوە گەیوەتێ

گەلی برادەرینە سەرێ من دەمێشی

دلێ منی غەریبە مالی دەترسی

........

ئەی داد...

بەرێ سەد حەیف و مخابن دەمکوژیتن

ئەوێ کۆنە دنیایێ

هەر ناکەسبەچەیە ئەو عەیامەی هەڵدەستی

بە بەر دەرکێ مەحبووبە گچکەلانەکەی من رادەبری

ئەویش لە کۆنە گراویەکەی من دەپرسی...

چیرۆکنووسەکەش ئەوەی ئێستا لە هەر دەروازەیەك لە حەفت دەروازە سەرەکیەکەی شار خانووێکی هەیە و دەڵێن گوتوویەتی:

ئیسلام ئەگەر رێگەی حەفت ژنی بدایە رۆژی حەفت نوێژم دەکرد و ساڵی حەفت حەفتە بە رۆژوو دەبووم و حەفت جاریش دەچوومە حەجێ.

پێش ماوەیەك لە چیرۆکنووسەکەوە، نازانم لە کێ ژمارەکەمی زانیبوو، نامەیەکی مۆباییلیم پێگەیشت:

بەری، ئێستاش بە تەماتم، ئەگەر بەڵێنی شووکردنم بدەیتێ، هەر ئێستا سێ بەردە دەخەمە دەستی هەر سێ ژنەکەم.

بۆیم نووسیەوە:

مێردێکم هەیە پێڵاوەکەی سەری هەموو ئەو پیاوانە دێنێ کە سێ ژنیان هەیە.

دکتۆرەکەش ناوە ناوە بە کۆڵانێدا رادەبرێ، چاو دەبرێتە پەنجەرەی دنیا، لەو ساڵانە ئێوارەیەك لە جادەی دکتۆران بە قسە دیتم، بە پێکەنین و گاڵتەوە گوتی:

ئەگەر ئەو جارەش وەك نەخۆشێك بکەویەوە بەردەستم، هەمان رستەی پێشوو دەنووسمەوە.

بەڵام وەهام وەڵام نەدایەوە کە جارێکیتر لە بەر خۆشیەوە زاتی گوتنەوەی قسەی وا بکات.

جگە لە کوڕی پیاوە مەستەکە کێ ما سۆراخم نەکات، کۆڵان کۆڵان بە دوامدا نەگەڕێ، ئەوەتا مەلاحەفتاو پێنج ساڵیەکە کە بە دوو گۆپاڵەوە لە رۆخی گۆڕ کوور بۆتەوە، چاویلکەیەکی لە چاوە ماشێن و درەخت لێکدی جیا نەکاتەوە بەڵام دەڵێن گوتوویەتی:

ئێستاش خاڵەکەی گەردنی پەری لە دووری حەفتاو پێنج ماڵەوە دەبینم.

جگە لە کوڕی پیاوە مەستەکە کێ لە بیری کردووم، پێشمەرگە قەندیلیەکە ئەوەی ویستبووی بۆ ئاپۆ ئاگر لە خۆی بەردا، دوای دیتنی من، نازانم لە کوێ منی دیتبوو، دەڵێن، دەڵێت:

ئەگەر ئەوجارە ویستم ئاگر لە خۆم بەردەم، لە داخی خاڵی گەردنی دایکی ماچە.

بیستمەوە، ئێستاش ئەو وێنەیەی کاتی خۆی بە جلکی پێشمەرگایەتیەوە لە بناری سەفینێ گرتم و جەمەدانیم پێچاوە و هەر کونی چاوم دیارە، ئەو وێنەیە بە گەورەکراوی لە ژووورە تایبەتیەکەی نەخشەسازی گەرماو هەڵواسراوە، ئەو کوڕەی پێشانماڵیان لەو کۆلانە بوو، دەرگەیان بە دەرگای پیاوە مەستەکەوە بوو، باشە ئێستا لێرە نەماون، دراوسێکانی ماڵی پیاوە مەستەکە یەك دووانێکیان نەبێت کەسیان لەو دەورو بەرە نەماون، ئەو کوڕە وەختی خۆی پێش ماچی یەکەمیش، لە دووم نەدەبۆوە، تا ئێستا چوار ژنی تەلاقداوە، دەڵێن هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کوڕە لە خەوێ هەر(پەری، پەری)یەتی ئیدی دەبێتە ئاژاوە و بە دەستلێکبەردان کۆتایی دێ.

جگە لە کوڕی پیاوە مەستەکە هەموو ئەو کوڕ و پیاوانەی منیان خۆشویستووە، خۆشەویستیەکەیان ماوە، پێیانەوە دیارە، خوایە گیان منت بۆچی وا بە بەدبەختی هێنا دنیاوە، ئەو هەموو خەڵکە بۆچی بە تەمای من بوون، ئێستاش وازم لێناهێنن، من گوناهم چیە ئەوەی جارێك دیتوومی حەزی لێمکردووە، بابی ماچ جارێك لە کاتی سەرجێیی و زۆر بە ناسکی گوتی:

وا بزانم جگە لە کوڕی نەفتفرۆش هەرچی کوڕی ئەو شارەیە بە دوای خاڵەکەتەوە بوونە.

بابی ماچ، لە باوەشی منەوە بۆ سەر کۆمپیوتەر و لەوێشەوە بۆ باوەشی من، بێدەنگ بێدەنگ، هەرچی لێدەپرسی وەڵامێکی ئەوتۆت نەداتەوە، جارو بارێش ئاوڕێك لە دارپرتەقاڵەکە دەداتەوە، بە تووڕەیی تیچاوێکی دەداتێ، سپێدەیەك خەونێك بە ئاگای هێنام، لەو خەونە بابی ماچ چووبووە سەر درەختێکی زۆر بەرز لە داربیەکەش بەرزتر، من لە خوارەوە بووم، دەترسام بکەوێت، گاسمدەکرد کە بێتە خوارێ نەدەهات، لە گاسکردنی خۆم بە ئاگاهاتم، ویستم باوەش بە بابی ماچدا بکەم، لە سەر جێ نەمابوو، ترسام، بانگیم کرد، وەڵام نەبوو، غارمدا حەوشە، دەبینم دوودەوێکی لە دەستە و خەریکی هەڵکەندنی بن دار پرتەقاڵەکەیە، گوتم:

+تۆ بەو سبەینێیە خەریکی چیت؟ بۆچی ئێرە هەڵدەکەنیت؟

-ئەو دار پرتەقاڵە بە هەڵە لێرە رواوە.

+ئەو لە شوێنی خۆی رواوە، ئێمە بە هەڵە هاتووینەتە ئێرە.

-نەخێر نەدەبوو لێرە بڕوێت.

سەری هەڵبڕی و بزەیەکی بۆ کردم، بزەیەك ئەگەر بیکەیتەوە وشە دەبووە (تۆ تێنەگەیشتی چیم گوت)، هەڵیکەند دەوری دارپرتەقاڵەکەی نزیکەی چۆکێك هەڵکەند و خۆڵەکەشی بە دەوریدا خڕکردەوە، پرتەقاڵەکە کەوتە چاڵێکی چکۆلەوە، گوتی:

+ئەوەی من دەیکەم حەزناکەم بە بەرچاوی تۆوە بێت، بۆیە تکات لێدەکەم برۆ ژوورەوە.

-بۆ دەتەوێت چی بکەیت؟

+تۆ برۆ دەیبینی.

چ تێنەگەیشتم، چوومە ژوورەوە و لە پەنجەرەوە تەماشایم کرد، دیتم جلیکانەیەك نەفتی هێنا، من ترسام هێندەی نەما بوو بقیژێنم، خۆی دەسووتێنێت؟ خۆم گرت، دیتم ویستی نەفتەکە رووبکاتە بن دارپرتەقاڵەکە، یەك دوو جار جلیکانەکەی هەندێك خواردەکردەوە نازانم چی پەژیوانی دەکردەوە و نەفتەکەی نەدەرژاندە قۆرتەکەوە، من هەر وا تەماشای دەکەم، رەنگە چارەگە دەمژمێرێك دەستی بە جلیکانەی نەفتەوە بووبێت، لە نێوان رژان و نەرژان تێدا مابوو، چوومە لای و گوتم:

+بیدە من با رووبکەمە بنی.

-نا، پێویست ناکات، با بژیت، با زیندوو بمێنێتەوە.

دوای پەشیمانبوونەوە لە وشککردنی دارپرتەقاڵەکە، بابی ماچ لە رۆژان ئاساییتر دەهاتە بەر چاو، لە باوەشمی گرت، بەو سبەینێیە سەرجێییەکمان کرد لە بیرناچێتەوە، هەر من و ئەو بووین و بەس نە تارمایی کوڕی پیاوە مەستەکە دیارکەوت، نە سەری خەیاڵی من گەیشتە ئەو، خۆزگە هەموو رۆژێك دووبارە دەبۆوە، ئەو سەرجێییە لە سەرجێیی یەکەم لە هی چلەمین شەو لەوەی ماچ کەوتە زگم دەچوو، ئەو سەرجێییە چ سەرجێییەك بوو! دڵم گوتی سەفین دەکەوێتە زگم، ئەو سەفینەی ساڵانێکە من و بابی ماچ و ماچ چاوەڕێی هاتنی دەکەین، ئەو رۆژە پێش نیوەڕۆکەی بە ئیشێکی ماچ، بابی ماچ و ماچ چوونە دەرەوە، دوای رۆیشتنی ئەوان بە چەند خولەکێك زەنگی تەلەفۆنەکەی ماڵەوە لێیدا:

+ئەلۆ

-بێ زەحمەت ماڵی پەریە؟

+بەڵێ، ئێوە کێن؟

-دەزانم بە تەنیا لە ماڵی بۆیە، دەڵێم، لە بن دەرگای حەوشەتان کاغەزێك هەیە، تا زووە هەڵیگرە، با دەست کەسیتر نەکەوێت.

+بە من بڵێ تۆ کێیت؟

-ئێستا دەزانیت.

دایخست، دەنگیم نەناسی، بە شێوەیەك قسەی دەکرد وەك بڵێی دەنگی خۆی گۆڕیبێت، ژمارەکەیشم نەزانی، دەرنەچوو، بە پارێزەوە رووەو دەرگای حەوشە چووم، وا بوو کاخەزێك لە بن دەرگا بوو، خێرا دەرگام کردەوە، کەس لە کۆڵان نەبوو، لە سەری کۆڵان لە سوورانەوەدا پیاوێکی سەر سپیم دیت، نیوە ئاوڕێکی دایەوە، هەر لە سەر دەرگا هەڵمپچڕی، نە لە لای سەرەوە نە خوارەوە ناوی کەسی بە سەرەوە نەبوو:

لەویێ رۆژێوە کە هەر من دەزانم چ رۆژێکە و چەند پایزە خەریکی نووسینی نامەیەکم بۆت، نووسیم، بەڵام پەشیمانبوومەوە لە ناردنی، ئێستا هەر ئەو چەند دێرەت بۆ دەنووسم و تەواو، من زۆر لەو پیاوە تاوانبارترم کە رەوانەی خەستەخانەم کرد، ئێستا لە خۆم تێگەیشتم کە من لە ئاست تۆ چەند گچکە و بوودەلەم، تۆ بە هەڵە حەفت پایز منت خۆشویست، تۆ شایانی پیاوێکی گەورە بوویت نەك من، دڵپیسترین

پیاوی دنیام، تۆ پیاوە گەورەکەت دیتەوە، من تیا چووم، من ناچار بووم ئەو چەند دێرەت بۆ بنووسم، ماچی یەکەم بە زۆر پێی نووسیم، بمبوورە ئەگەر دەتوانیت بمبوورە.

رەنگە سەد جار پتر خوێندبێتمەوە، نامەکەی کوڕی پیاوە مەستەکەم خوێندبێتەوە ئەو نامەی نە ناوی منی تێکردبوو نە هی خۆی، هەو بوو ئەوە دەنگی کوڕی پیاوە مەستەکە بوو، بەڵام گۆڕابوو، رەنگە نەشگۆڕابێت، بەڵام یەکەم جارە لە تەلەفۆنەوە گوێم لە دەنگی ئەو بێت، هەو بوو ئەو پیاوە رەقەلە سەرسپییەی لە سەری کۆڵان سووڕایەوە و ئاوڕی لێمدایەوە، کوڕی پیاوە مەستەکە بوو، حەیف ئەو قژە رەشە قەترانییەی چی لێهاتووە، ئای کوڕی پیاوە مەستەکە، خۆزگە هەر نەمناسیبای، کە ناسیم بە دڵی خۆم بای، ئای کوڕی پیاوە مەستەکە دوای ئەو هەموو ساڵە بەو چەند دێرە، بەو دەنگە گۆڕاوە، بەو قژە سپییەت، بە ئاوڕدانەوەکەت، چیت لە من کرد! کوڕی پیاوە مەستەکە، کوڕی ماچی یەکەم، لەو دەمە گۆرانیی تەیرەکەی گەرمێنم بیرکەوتەوەو گوتمەوە:

هاتەوە هاتەوە

تەیرەکەی گەرمێنێ

بەو تەیرەم دەڵێن ڕەژداله

باڵ، تیژ باڵی لێداو

لە شوێن یاری ئەوداڵە

هەزار سات هەزار خۆزگەم بەو کەسەی

لەگەڵ ناسکۆل هاوماڵە...

نەدەبوو تەلەفۆن و نامە و لە دوورەوە دیتنی کوڕی پیاوە مەستەکە لە بابی ماچ بشارمەوە، ئەوەی تا ئێرە بە سەرم هاتووە زۆری بە هۆی شاردنەوەی شتەکان بووە، ئیدی هیچ لە بابی ماچ ناشارمەوە، ماچ و بابی ماچ هاتنەوە، یەکسەر چووە سەر کۆمپیتەرەکەی گوتم:

+کۆمپیوتەرەکەت داخە، کەمێك ئیشم پێتە.

-باشە، بەڵام زوو، چوونکێ هەندێك شت لە مێشکمە دەبێت بیاننووسمەوە.

چیم بیست و دیتم بۆیم گێڕایەوە و نامەکەیشم دایە دەستی، وەرینەگرت، سیمای تێکچوو، دەستم خستە سەر شانی:

+بەڵام نابێت تووڕە بیت، با بۆت بخوێنمەوە.

-من لە تۆ تووڕە نابم، جگە لە خۆم لە کەس تووڕە نیم.

دەستم بە خوێندنەوەی نامەکەی کوڕی پیاوە مەستەکە کرد.

-مەیخوێنەوە، نامەوێت گوێم لێی بێت.

نازانم هەموویم بۆی خوێندەوە یان نا.

ئەو سێ ڕۆژەی دوایی بابی ماچ لە بارێك بوو، ناتوانم نیشانی بدەمەوە، نەدەچووە سەر کۆمپیتەرەکەی، گوێی لە شمشاڵ و گۆرانیش ڕانەدەگرت، جار جارە دەچووە بن ئەو دارپرتەقاڵ و دار هەنارەی کە کاتی خۆی بە دەستی خۆی چاندبوونی، ناوە ناوە تێر تێمرادەما، لە پڕ سەری دادەخست و ڕووی لێمودەرگێڕا، دەگەڕایەوە و ماچێکی قووڵی دەکردم و پشتی تێمدەکرد، دەچووە لای ماچ و ماچی دەکرد، ئەو سێ شەوەی دوایی چ خەوی نەبوو، هەر جارێك بە ئاگادەهاتم بە ئاگا بوو، بەڵام وا خۆی نیشاندەدا کە خەوتووە، منیش ئەو سێ ڕۆژەی دوایی ئەو سێ شەوەی دوایی، لە بارێکی وەها نەبووم، ئاگام لەو بێت و یارمەتی بدەم، ماچیش پێدەچوو تاقیکردنەوەیان هەبووبێت، سەرقاڵی دەورکردنەوە بوو.

دوای ئەو سێ ڕۆژە، سەری چوارەی چێشتانێکی درەنگ بابی ماچ چووە دەرێ ویستم لەگەڵی بڕۆم، نەیهێشت، گوتی:

+پیاسەیەك دەكەم، دێمەوە، ئاگات لە ماچ بێت.

-زوو وەرەوە.

بابی ماچ هێشتا هەر لە سەر دەرگا بوو، هێواشی هێنا، ئەویش گوێی لێبوو، بەڵام ڕۆیشت و بە هەندی وەرنەگرت، ئای بابی ماچ ئەوە جاری یەکەمت بوو من هێواش بێنم و تۆ هێواشی نەکەیتەوە، منیش زمانم بەسترا و هیچم نەگوت، بابی ماچ ڕۆیشت، تا لە سەری کۆڵان سووڕایەوە چەند ئاوڕێکی دایەوە، لە ناو پرووشەی بەفرێ ئاوڕی دایەوە، من لە سەر دەرگای حەوشە وشکبووم، نازانم بۆچی حەزم بە گوتنەوەی ئەو گۆرانیە کرد:

سەفەر مەکە

دڵم دەڵێ ناتبینمەوە...

پێش نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆی کرد، کەچی لە ژوورەکەی خۆی مۆبایلەکەی زەنگی لێدا، نەیبردبوو، بووە نیوەڕۆ هەر نەهاتەوە،

عەسرانێکی درەنگە بابی ماچ نەگەڕایەوە، زەنگی تەلەفۆنەکەی ماڵێ هات:

+ئەلۆ

-پەری، لە بن کۆمپیتەرەکە دووکاغەز هەیە بۆ تۆ و بۆ ماچ.

+تۆ لە کوێیت، کەنگی دێیتەوە؟

-پیاسەیەك دەکەم.

+تۆ...

دایخست، یەکسەر غارمدایە کۆمپیوتەرەکە، دۆلابەکەی دانەخستبوو، کاخەزەکە لەوێ بوو:

پەری شیرنترین ژنی دنیا، ئەوەی منی بە ژیان بەستۆتەوە، ئەوینی تۆیە، من لە ئەوینی تۆ چاو هەڵدێنم و دایدەخەم، لە ئەوینی تۆ هەناسە وەردەگرم و دەیدەمەوە، ئەوینی تۆ ئای لە ئەوینی تۆ، ئەو ئەوینەی رۆژ دوای رۆژ دەورم دەدا و دەمتوێنێتەوە، چ دەبوو ئەوینی تۆش بۆ من ئەوها با، دەزانم خۆشمت دەوێت زۆریش بەڵام ناگاتە هی من، ئەوینی تۆ بۆ من ناگاتە ئەوینی من بۆ تۆ، من بە دوای رێگەیەك دەگەڕێم

بۆ هاوسەنگکردنی ئەو دوو ئەوینە، بەڵام کام ڕێگا! گەیشتمە ئەوەی جگە لە ڕێگای دوورکەوتنەوە چ ڕێگایەك نیە، ڕەنگە ئەگەر ماوەیەك لێت دووربم، ئەوینت بۆ من پتر بێت، من بۆ پیاسەیەکی درێژ ڕۆیشتم، نازانم چەندم پێدەچێت، بەڵام دڵنیابە دێمەوە لات، دێمەوە لای ماچی یەکەم، هیچ کەسێك نیە ماچی یەکەمی لە یادبچێت، دێمەوە پیاسەیەك دەکەم و دێمەوە بۆ باوەشی تۆ، بۆ لای ماچی یەکەم دێمەوە.

بۆ ماچیشی وا نووسیوە:

ماچ، جوانترین زادەی ماچ، وریای ماچی یەکەم بە، ئەگەر درەنگم پێچوو، بە زەماوەندەکەت ڕانەگەیشتم بمبوورە، خەمی هیچیشتان نەبێت لە ئێستاوە تا پیاسەکەم تەواو دەکەم، خەرجیتان هەر لە سەر منە، ناوە ناوە لە ڕێی دەستێکی نادیارەوە بڕێك پارەتان دەگاتە دەست، بەڵام بە دوایدا مەگەڕێن نایبیننەوە، ماچ دڵنیابە دێمەوە، بۆ ماچی یەکەم و ماچ دێمەوە.

چوار وەرزی ڕێك بە سەر تۆرانی بابی ماچدا تێدەپەڕێت، سەفین سێ مانگانە، لەو ڕۆژەوەی لە سەری کۆڵان ئاودیو بوو، ئەو شوێنەی سێ ڕۆژ پێشتر کوڕی پیاوە مەستەکەشی ئاودیوکرد، هەردووکیشیان بە سەری سپیەوە، بابی ماچ لە دوای خۆی پرووشەی بەفری بە مندا

کـرد، ئەو سـەری کـۆلانە لە مـن بـۆتە کەلـی ئـاوابوونی پیـاوە سـەر سپییەکان، پیـاوی گەرمیـانی، پیـاوی کوێسـتانی، لەو ڕۆژەوە لە ڕۆژی ئـاوابوونی بـابی مـاچەوە، نـاوە نـاوە نیشـانەیەك لە بـابی مـاچ بە دیاردەکەوێت و خۆی پیشانمان نادا، دەزانم بابی ماچ بە دەوری مندا بە دەوری ماچ خولی ئەوین دەخوات، ئای بـابی مـاچ! وەرە سـەفین ببینـە، من لە پەنجەرەی چاوەڕوانیەوە سەفینی چاو رەش نیشانی سەفینی قژ سپی دەدەم، تۆرانی بابی ماچ منـی کردە کانیی فرمێسك، کانیەك بە تەمەنێـك وشکەسـاڵیش وشـك ناکـات، فرمێسـکەکانی مـن ئەوەتـا خوشکترینیشـی لە ژوورەکەی هێنـایە خـوارەوە و بە دارشـەقەکەیەوە لە تەنیشتم دادەنیشێ و دەست لە ملم دەکا و دەڵێ:

فرمێسـك بەسـە، پەری، فرمێسـك بەسـە، بـابی مـاچ دێـتەوە، تـۆ ماچت هەیە، تۆ سەفینشت لە پشتە، فرمێسك بەسە.

چوارشـەمووانیش دەچم دەسـتی ژنە کەسکپۆشـەکە دەگـرم، ئێسـتاش هەر کەسکپۆشە، هەردووکمان بۆ پاڕانەوە دەچین، بۆ گەڕانەوەی بابی ماچ دەچین، ژنە کەسکپۆشەکە دەگەیەنمە سەر دەرگای سوڵتان مزەفەر و خۆشم بە خولگەی بە تەمای خوای دەگەمەوە درەختە گوڵاویەکە.

ناونیشانێك، بابی ماچ، ناونیشانێك! لەو ڕۆژەوەی تۆ ئاوابوویت، هەموو شەوێك دێڕێکم بۆت نووسیوە، ناونیشانێك بنێرە و درێژترین نامەی ئەوین بخوێنەوە، لە ڕۆژی ئاوابوونی بابی ماچەوە، حەفتانە دارپرتەقاڵی بابی ماچ بە فرمێسك ئاودەدەم و دارپرتەقاڵی کوڕی پیاوە مەستەکەش بە نەفت، کەچی گەڵاکان گەڵای دارپرتەقاڵەکان وەرز وەرز کەسکتر دەچنەوە، خۆزگە ماچی یەکەم بۆ بابی ماچ دەبوو.

دڵنیام چۆلەکەکان، باڵندەکان گوڵاو بە گەڵاکاندا دەپڕژێنن، ئەو درەختە بە باڵی باڵندە نەبێ ئەو هەموو بۆن و بەرامەیەی لەکوێ بوو، باڵندەکان لە هەموو لایەکەوە گوڵاو بۆ ئەو درەختە دەکێشنەوە...

گەڕەکێک لە بنی دانیشن کەس هەتاوی پێناکەوێت، هێند چڕوپڕە، برۆ بنی و هەورێک بارانی لە سەر راگرە تەڕ نابیت، ئەو درەختە وەک دەڵێن هێندەی دارستانێک گەڵای پێوەیە، هێندەی گەڵاکانیشی باڵندەی گرتووە، هێندەی باڵندەکانیشی شووشە گوڵاوی لە خۆی داوە، کەم نین ئەوانەی لە بن ئەو درەختە چیرۆکیان هەیە...

# The first kiss

KARIM KAKA

بەرگ: ئیبراهیم ساڵح






هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگا
0750 406 66 74
Nawandi Raha / ناوەندی ڕەها